# یادی خوا (ذکر اللّه)

## لەژێر تیشکی قورئان و فەرموودە (صحیح)ە کاندا
## بە بەڵگەو ماناکانیانەوە


نووسین و ئامادەکردنی

**عبدالحکیم حسن**



چاپی یەکەم - هەولێر

١٤٤١ ک - ٢٠٢٠ ز

# یادی خوا (ذكر اللّٰه)

## لەژێر تیشکی قورئانو فەرموودە (صحیح)ە کاندا

## بە بەڵگەو ماناکانیانەوە


نووسینو ئامادەکردنی

عبدالحكيم حسن



چاپی یەکەم - هەولێر

١٤٤١هـ ٢٠٢٠ ز

ناوی کتێب:یادی خوا ( ذکر الله )
بابەت : زیکر
نووسین و ئامادەکردنی: عبدالحکیم حسن
نەخشەسازی : کۆمپیوتەری ( هیـوا )
تیراژ:١٠٠٠دانە
چاپ: یەکەم / ٢٠٢٠
چاپخانە : هیڤی- هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (            )ی ساڵی(            )ی پێدراوە

# بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**إنّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مُضِلَّ لَهُ ومن يُضلل فلا هادي لَه، واشهد ان لا إله إلا الله وحدهُ لا شريك لَهُ، واشهد أن محمداً عبدهُ ورَسولُهُ...**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾

**(آل عمران:١٠٢)**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾

**(النساء:١)**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾

**أما بعد..... فانّ اصدقَ الحديثِ كتابُ الله، وخيرَ الهدى هدىُ (محمد) (ﷺ) وشرَّ الأُمور مُحدثاتُها، وكلَّ مُحدثةٍ بدعة، وكلَّ بِدعةٍ ضلالة وكُلَّ ضلالةٍ في النار.**

**یەکێك لە مەرجەکانی قەبووڵ بوونی کردەوە ئەوەیە دەبێت ئەو کردەوەی کە دەیکەی بەڵگەی شەرعی لەسەر هەبێت و بە شێوەیەکی**

شەرعی ئەنجامی بدرێت و بیدعەو داهێنراو نەبێت، جا دەبێ موسڵمان هەر زیکرێك و هەر کارێکی چاك ئەنجام دەدات لەژێر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا بێت و بەرچاوی روون بێت (العلم قبل القول والعمل).

جا ئومێدم وایە بە خوێندنەوەی ئەم کیتابە بەرچاو روونیەکی زۆرت بۆ دروست بێت لە ئەنجامدانی زیکرەکان ، وە زۆرێکیش لە زیکرەکان فێر بیت کە تا ئێستا نەتزانیوە.

لەم کیتابەدا بە ئەنقەست هیچ فەرموودەیەکی زەعیفم تیادا دانەناوە، ئەوانەی لەپێش راویەکە نووسیومە (صحیح) یان (حسن) ئەوە بە تەحقیقی شێخ ئەلبانیە، ئەگەر فەرموودەکە ئیمامی بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردبوو ئەوە زۆربەی جارەکان تەنها بەس ناوی ئەوانمان هێناوە، وە ئەگەر فەرموودەکەش ئەوان ریوایەتیان نەکردبێت، ئەوە تەنها ناوی یەك یان دوو فەرموودە ناسم نووسیوە کەم وایە زیاترم نووسیبێت لەگەڵ ژمارەی فەرموودەکە.

وە لەم کیتابەمدا زۆر بابەتم لە کتێبێکمدا بەناوی (فەرموودە (صحیح)ەکانی پێغەمبەر) نەقل کردووە هەندێکی بە دەستکاریەوە، هەندێکیش بێ دەستکاری.

هیوادارم هەر یەکێك ئەم کیتابەی دەست کەوت با بیدات بە کەسانی دیکەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: (مَن دَلَّ علی خیرٍ فلهُ مثلُ أجرِ فاعله )

داوا لەخوای گەورە دەکەم ئەم نوسراوە ببێتە مایەی خێرێکی گەورە بۆ خۆم و بۆ ئەوانەش کە دەیخوێننەوە.

## پێناسەی (ذکر)

(ذکر) لە زمانەوانیدا دژی (نسیان)ە، واتـە دژی لەبیرچـوونەوەیە، کەواتـە (ذکر) یـانی یـاد کـردن و لـەبیربوون و وەبیرهاتنـەوە، بـەڵام مانای (ذکر) لە شەرعدا بریتیە لە یادکردنی خـودا بـەدڵ و زمـان، وە هەندێکیش لە زانایـان لەوانـە سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر دەڵـێ: (کل عامل لله تعالى بطاعة هو ذاكر الله تعالى)[1].

واتە: هەر کەسێك لە فەرمانبەری (طاعة)ی خوادا کار بکات، ئـەوە یادی خوای کردووە.

کەواتە بەپێی ئەو قسـەیە هـەموو فەرمانبـەری و بەندایەتیـەك بـۆ خواو هەر جۆرە پەیوەندییەك هـەبوون بـە خـواوە بـەیادکردن (ذکر) حیساب دەکرێ، وەك تەسـبیحات و قورئـان خوێنـدن و نوێـژو ڕۆژوو حەج و سیلەی ڕەحـم و جیهـادو چـاکەکردن لەگـەڵ دایـك و بـاوك و خێرکردن ئەمانە هەمووی یادی خوان.

---

(١) الاذكار للنووي ، ص٢٠.

# کۆمەڵێ یاساو زانیاری دەربارەی زیکر

## یەکەم:

بۆ ئـەوەی پاداشـت بدرێیتـەوە لەسـەر ئـەو زیکرانـەی کـە دەیکـەی دەبێت دوو مـەرجت تیادابێـت، یەکـەم: لەبـەر خـوا ئـەم زیکـرە بکـەی، دووەم: دەبێت زیکرەکەت بیدعەو داهێنراو نـەبێت یـا بەشـێوەیەکی بـێ شـەرعی نـەبێت، بـۆ نموونـە زیکـری بەتـەنیا گـوتنی (الله، الله، الله) هـیچ بەڵگەی شەرعی لەسەر نیە، یا زیکر کردن بە راناو (ضمیر) وەك (یاهو) یا (هوهو) ئەمانەش نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا نەهاتوون و بیدعەن.

یا زیکرەکە لە شەرع هاتووە بەڵام ئەو بە شێوەیەمی تر دەیکات وەك سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای بانگ، کـە بـە نهێنیـەو هـەر کەس بۆخۆی دەیکات، بەڵام ئەو بچێ بە دەنگـی بـەرز لـەدوای بانگەکـە بیڵێ ئەمەش دەکەوێتە بازنەی بیدعەوە، چـونکە ئەسـڵ لـە سـەڵاواتەکە سوننەتە، بەڵام کەیفیەت و چۆنیەتەکەی دەبێتە بیدعە.

جا بە کردنـی بیدعـە موسـڵمان نـەك پاداشـت وەرنـاگرێ بـەڵکو پێـی گوناهبـاریش دەبێـت، وە بـە هەنـدێکیان لـە بازنـەی ئیمـانیش دەچـێتە دەرەوە وەك پاڕانەوە لە غەیری خوا.

## دووەم:

### سوننەتە بەدەست نوێژەوە یادی خوا بکرێت

١- عَنْ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ حَتَّى تَوَضَّأَ ثُمَّ اعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ

إِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلَّا عَلَى طُهْرٍ أَوْ قَالَ عَلَى طَهَارَةٍ[1].

**واته: موهاجیری کوڕی قونفز چوەتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەو واتە پێغەمبەر (ﷺ) میزی دەکرد، جا ئەویش سەلامی لێ کردووەو پێغەمبەریش (ﷺ) سەلامەکەی وەڵام نەداوەتەوە تا دەست نوێژی نەشۆردووە، لەپاشان عوزری بۆ هێناوتەوە فەرموویەتی: من پێم ناخۆش بوو یادی خوا (عز وجل) بکەم مەگەر لەسەر پاکی نەبێت.**

**٢-** عن أَبُو الْجُهَيْمِ الْأَنْصَارِيّ قال : أَقْبَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ

**واته: ئەبو جوهەیم دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەلای بیری جەمەلەوە (کە شوێنێکە لە نزیك مەدینە) دەهاتەوە، پیاوێکی پێ گەیشت سڵاوی لێ کرد بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) سڵاوەکەی وەڵام نەدایەوە تا رووی کردە دیوارێك و مەسحی دەم و چاوو دەستەکانی کرد لەپاشان سەلامەکەی وەڵام دایەوە.**

**سوود: أ- لەم دوو فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێ کە یادی خوا کردن بەدەست نوێژەوە سوننەتە.**

---

(١) صحيح، رواه أبو داود (١٧) وأحمد (٢٠٢٣٧).

ب- ئەگەر بۆ سەلام وەلآم دانەوە دەست نوێژ سوننەت بێت بۆ قورئان خوێندن لەپێشترە.

جـ- جائیزە تەیەموم بە دیوار بکرێ جا دیوارەکە لە خشت دروست کرابێت یا لەبەرد، بۆیاغ کرابێت یا بۆیاغ نەکرابێت ئەمەش قسەی شێخ ئەلبانیە.

**سێیەم:**

عن عائشةَ قالت: كان رسول الله (ﷺ) يذكر الله عز وجَلَّ على كُلِّ أحيانِهِ[1].

واتە: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) یادی خوا (عز وجلَّ) ی دەکرد لەهەموو کاتێکدا.

**سوود**:- نەوەوی لە کیتابی (الاذكار) دا دەڵێ: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە زیکر جائیزە بەدڵ و بەزمان بۆ کەسێك کە دەست نوێژی نیە یا جەنابەتی لەسەرە یا ئافرەتێکە لە حەیز دایە یا زەیستانداریە، ئەمەش بۆ کەسێکە کە (تسبيح) و (تهليل) و (تحميد) و (تكبير) دەکات یا سەلآوات لەسەر پێغەمبەر دەدات یا دوعا دەکات بەلآم قورئان خوێندن[2].

---

(١) رواه مسلم (٣٧٣) وأبو داود (١٨).

(٢) الاذكار لاپەڕە (٢١).

## چوارەم:

وە ئیمام نەوەوی دیسان لە کیتابی (أذكار) دا دەڵێ: (إعلم أن الذكر... لا يكرهُ في الطريق ولا في الحمام)[1].

واتە : بزانە زیکر مەکروھ نییە بکرێ نە لە ڕێگادا وە نە لە حەمامدا.

وە (بخاری) لە (صحيح)ەکەیدا لەژێر ناوونیشانی (باب: قراءة القرآن بعد الحدث وغيره) دەڵێ: وقال منصور عن ابراهيم: (لا بأس بالقراءة في الحمام).

واتە: (منصور) لە (إبراهيم) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هیچی تیادا نییە ئەگەر قورئان لە حەمامدا بخوێنرێ .

## پێنجەم:

ئافرەت ئەگەر لە حەیز و زەیستانیدا بوو جەماوەری زانایان زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە نابێ قورئان بخوێنێ، بەڵام (ابن تيميه) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ مەنع کردنی ئافرەتی حەیزدار و بێ نوێژ لە قورئان خوێندن لە سوننەتی پێغەمبەردا نەهاتووە، ئەم فەرمودەش (لا تقرأ الحائض ولا الجنب شيئاً من القرآن) فەرموودەیەکی (ضعيف)ە، کەواتە بەلای (ابن تيميه) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەگەر ئافرەت کەوتە بێنوێژی دەتوانێ قورئان بخوێنێ.

---

(١) الاذكار لاپەرە ، (٢٣).

## شەشەم:

جائیزە قورئان لەبەر بخوێنرێ بێ هەبوونی دەست نوێژ.

ئیمام ئەحمەدو شافیعی و مالیك و زۆربەی شەرعناسان دەڵێن ئەوەی دەست نوێژی نەبێت نابێت دەست لە قورئان بدات.

بەلای (شوکانی) و (ئەلبانی) و (عثیمین) دەست نوێژ مەرج نییە بۆ قورئان خوێندن و دەست لێدان و هەڵگرتنی.

بەڕای هەندێك لە زانایان لەش پاکیش نەك دەست نوێژ مەرج نییە بۆ دەست دان لە قورئان و هەڵگرتنی.

## حەوتەم:

عن عبدالله بن عمْرٍو قال: (رأيت النبيّ (ﷺ) يعقد التسبيح بيمينه) [1].

واتە: (عبدالله) کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەرم بینی (ﷺ) بەدەستی ڕاستی تەسبیحاتی دەکرد.

## سوود:

(ابن تیمیه) دەڵێ: تەسبیحات ژماردن بە پەنجەکان سوننەتە، شێخ (عیثمین) دەڵێ: تەسبیح بیدعەیەکی دینی نییە، لەبەر ئەوەی ئینسان مەبەستی نییە بە تەسبیح لە خوا نزیك بێتەوە، بەڵکو ئەو تەنها

(١) صحيح رواه أبو داود (٢/٨١) والترمذي (٣٤٨٦).

مەبەستی ئەوەیە ژمارەی تەسبیحاتەکان زەبت بکات وە دەفەرمووێ جائیزە بە تەسبیح تەسبیحات بکرێ بەڵام باشتر وایە بە پەنجەکانی بیکات، وە هەروەها لە پێشترە کە تەسبیحات بە پەنجەکانی دەستە راست بکرێ.

وە(ابن باز)دەڵێ جائیزە تەسبیحات بە دەستە چەپ بکرێ.

## هەشتەم:

شرط حصول الأجر الكامل في الأذكار: تواطؤ القلب مع اللسان.

**واتە: مەرجی بەدەستهێنانی پاداشتی تەواو لە کردنی زیکرەکان ئەوەیە کە ئەوەی بە زمان دەیکەی بە دڵیش لەگەڵیدابیت.**

**نەوەوی دەڵێ:** (المراد من الذكر حضور القلب فينبغي أن يكون هو مقصود الذاكر فيحرص على تحصيله، ويتدبر ما يذكر ويتعقل معناهُ فالتدبُّر في الذكر مطلوب) .

**واتە: مەبەست لە زیکر ئامادەبوونی دڵە، دەبێ ئەوە مەبەستی زیکر کار بێت، سوور بێت لەسەر بەدەستهێنانی، وە بیر لە ماناکەی بکاتەوە، وە ماناکەی تێ بگات، جا بیرکردنەوە لە زیکر شتێکی داواکراوە.**

## نۆیەم:

(قاضي عياض) دەڵێ: زیکری خوا دوو جۆرە بە دڵ و بە زمان.

وە زیکری خوا بە دڵ دوو جۆرە : یەکەمیان کە ئەمەیان لە هەموویان گەورەترە بیرکردنەوەیە لە گەورەیی خواو نیشانەکانی لە ئاسمانەکان و زەویدا.

دووەم: زیکر کردنیەتی بە دڵ لەکاتی ئەمرو نەهیدا، ئەوەی خوا ئەمری پێ کردووە دەیکات، وە ئەوەش کە نەهی لێ کردووە وازی لێ دەهێنێ ، وە لەوەش کە ئیشکالی لێ هەیە دەوەستێ.

## دەیەم:

ئەوەوی لە کیتابی (أذكار) دا دەڵێ:

(اعلم أن الاذكار المشروعة في الصلاة وغيرها واجبة كانت أو مستحبة، لا يحسب شيء منها ولا يعتد به حتى يتلفظ به بحيث يسمع نفسه إذا كان صحيح السمع لا عارض له).

واتە: بزانە ئەو زیکرانەی کە لە شەرعدا هاتووە لە نوێژو لە غەیری نوێژ واجب بن یان سوننەت، هیچیان حیساب ناکرێن و ناژمێردرێن تا بە قسە نەگۆترێن بە شێوەیەك کە خۆی گوێی لێ بێت ئەگەر بیستنی تەواو بێت و هیچ بەرپەرچی نەبێت.

## يازدەم:

ئەو زیکرانەی کە بەستراونەتەوە بە کات و شوێن ئەگەر لەم کات و شوێنەدا نەتکرد ئەوە ناگێڕدرێنەوە وەك بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە یا عاشورا، یا یەکێك دەچێتە مزگەوت زۆر دادەنیشێ و (تحية المسجد) ی نەکردووە، یا زیکری بەیانیان و ئێواران لەکاتی خۆیان نەکرێ، جا ئەم زیکرانەی کە بەستراونەتەوە بە کات و شوێن ئەگەر لەم کات و شوێنە نەتکرد ئەوە فەزلە تایبەتەکەی دەڕوا، بەڵکو وەکو زیکرێکی گشتی لێ دێت.

## دوازدەم:

باشترین عیبادەت ئەوەیە کە ئەم کاتە چی دەخوازێ تۆ ئەمە بکەی بۆ نموونە:

باشتر وایە لەکاتی بانگ وەلامی بانگ بدەیەوە , باشتر وایە لەکاتی ئامادەبوونی میوان هەڵبستی بە جێ بەجێ کردنی مافی میوان لەوەی خۆت مەشغول بکەی بە زیکری موستەحەب.

باشتر وایە لەکاتی نەخۆش کەوتنی براکەت یا مردنی سەردانی بکەیت و ئامادەی جەنازەی بیت.

باشتر وایە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان اعتکاف بکەی لە مزگەوت، وە هەروەها.

# گەورەیی یادی خوا لە قورئاندا

١- خــوا دەفــەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ۝٤١ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ۝٤٢﴾ (الأحزاب: ٤١ – ٤٢).

**واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە زۆر یادی خوا بکەن، وە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك خوا بەپاك رابگرن.**

٢- خوا دەفـەرمووێ: ﴿فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ۝١٥٢﴾ (البقرة: ١٥٢).

**واتە: یادم بکەن، تا منیش یادی ئێوە بکەم وە سوپاسم بکەن پێ نـەزان و ناسوپاسیم مەکەن.**

٣- خــوا دەفــەرمووێ: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ۝٢٠٥﴾ (الأعـراف: ٢٠٥).

**واتــە: وە یـادی پــەروەردگارت بکــە لــە دڵــی خۆتــدا (لەبــەر خۆتــەوە) بەکڕووزانەوەو ترسەوە، بەبێ دەنگ هەڵێنان و دەنگ بەرزکردنەوە، بە بەیانیان و ئێواران، وە لەبێ ئاگایان مەبە.**

٤- خــــوا دەفــــەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ۝٢٨﴾ (الرعد: ٢٨).

**واتە: ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، وە دڵیان ئـارام دەبێـت بـەیادی خـوا، ئاگاداربن کە هەر بەیادی خوا دڵەکان ئارام دەبن.**

٥- خـوای گـەورە بـە زەکـەریای (علیـە السـلام) فـەرموو: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ٤١﴾ (آل عمران: ٤١).

واتە: وە زۆر یادی پەروەردگاری خۆت بکەو بەپاکی بگرە بە ئێواران و بەیانیان.

٦- خـــوا دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥﴾ (الأحزاب: ٣٥).

واتـە: بێگومـان پیـاوانی موسـڵمان و ئافرەتـانی موسـڵمان، وە پیـاوانی بـڕوادار و ئافرەتـانی بـڕوادار، وە پیـاوانی گوێڕایـەڵ و ئـافرەانی گوێڕایـەڵ، وە پیـاوانی راسـتگۆو ئافرەتـانی راسـتگۆ، وە پیـاوانی بەسەبرو ئافرەتانی بەسەبر، وە پیاوانی خۆ بەزل نەزان و ئافرەتـانی بێ فیز، وە پیاوانی بەخشـەرو سـەدەقە دەرو ئافرەتـانی بەخشـەر , وە پیاوانی رۆژوەوان و ئافرەتانی رۆژوەوان، وە پیاوانی داوێن پارێزو ئافرەتـانی داوێـن پـارێز، وە پیـاوانێ کـە زۆر یـادی خـوا دەکـەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خـوا دەکـەن، خـوا ئامـادەی کـردووە بۆیـان لێخۆشبوون و پاداشتێکی گەورە.

# گەورەیی یادی خوا لە فەرموودەدا

١-عن ابي الدَّرداء(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) أَلا أُنَبِّئُكم بِخيرِ أَعمالكم وأزكاها عند مَليككم وأَرفَعِها في دَرجاتكم وخيرٌ لكم مِن إنفاقِ الذَّهبِ والفِضَّةِ وخيرٌ لكُم مِنْ أنْ تَلْقَوا عَدُوَّكم فَتَضرِبوا أَعْناقَهم ويَضْرِبوا اعناقكم؟ قالوا بلى، قال: ذكرُ الله تعالى. صحيح: رواه الترمذي(٣٣٧٧) وابن ماجه(٣٧٩٠).

واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە باشترین کردەوەکانتان وە پاکترینی لە لای گەورەو سەرۆکتان وە بەرزترینی لەبەرز کردنەوەی پلەتاندا، وە چاکتر بێ بۆتان لە بەخشینی زێرو زیو، وە چاکتر بێ بۆ ئێوە لەوەی کە بگەنە دوژمنەکانتان و لە ملیان بدەن و ئەوانیش لە ملتان بدەن؟ ئەوانیش گوتیان بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یادی خوای بەرز.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) سَبَقَ المُفَرِّدونَ قالوا: وما المُفَردون يا رسول الله؟ قال: الذّاكرونَ الله كثيراً والذَّاكراتُ. رواه مسلم(٢٦٧٦).

١-المفردون: تاك بووەكان، بۆیە پێیان دەوترێ(تاك بوەوەكان) چونكە بە هۆی زۆر یاد كردنی خوا لە خەڵكی جوێ بوونەوەو تاق بوونەوە.

**ماناى فەرموودەكە:** تاق بوەوەكان پێش- خەڵكی - كەوتوون گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تاق بوەوەكان كێن؟! فەرمووی ئەو پیاو و ئافرەتانەی زۆر یادی خوا دەكەن.

٣- عن ابي موسى الأشعري(رضي الله عنه) عن النبيِّ (ﷺ) قال: مَثَـلُ الـذي يـذكُرُ ربَّـهُ والـذي لا يـذكُرُهُ مَثَـلُ الحَـيِّ والمَيِّـتِ. رواه البخاري(٦٤٠٧) ومسلم(٧٧٩).

**واته: وێنەی ئەو کەسەی یادی پەروەردگاری دەکات و ئەوەی یادی ناکات وەك مردوو و زیندوو وایە.**

٤- عن عبدالله بن بُسرٍ(رضي الله عنه) أنَّ رجلاً قال: يا رسول الله إنَّ شرائعَ الإسلامِ قَد كَثُرَت عليَّ فأَخبرني بشيءٍ أتَشَبَّثُ بهِ قال(لا يَزالُ لِسانُكَ رَطْباً مِنْ ذكرِ الله. صحيح: رواه الترمذي(٣٣٧٥) وابن ماجه(٣٧٩٣).

## واتەی ووشە:

**١-اتَشَبَّثُ بهِ: أتَعَلَّقُ بهِ، واتە: دەستی پێوە بگرم.**

**٢- الرَّطبُ: واتە: تەڕ، پێچەوانەکەشی(یاپس)ە واتە: ووشك.**

## ماناى فەرموودەکە:

**عبدالله کوری بوسر(رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵێ: پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان یاساکانی ئیسلامم لەسەر زۆر بوون جا هەواڵم بدێ بە شتێك کە دەستی پێوە بگرم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: با بەردەوام زمانت تەڕ بێت بە یادی خوا.**

٥- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآَنِ أَوْ تَمْلَأُ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالصَّلَاةُ نُورٌ وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا) روا مسلم (٢٢٣).

**واته: پاك و خاوێنی (لابردنی بێ دەست نوێژی و جەنابەت و لابردنی هەموو پیسییەك وەك خاوێن كردنەوەی جل و بەرگ و جەستەو شوێن) نیوەی ئیمانە، وە گوتنی (الحمد لله) تەرازوی قیامەت پڕ دەكات، وە گوتنی (سبحان الله والحمد لله) نێوانی زەوی و ئاسمان پڕ دەكەن، نوێژ رووناكیە، ماڵ بەخشین بەڵگەیە (لەسەر راستی ئیمانی كەسەكە) ئارام گرتن رۆشناییە، قورئان بەڵگەیە بۆت یا لەسەرت، هەموو خەڵك بەیانی دەكەنەوە، جا ئی وا هەیە نەفسی خۆی دەفرۆشێتە (خواو) ئازادی دەكات، یا بەهیلاكی دەدات (بەكردنی گوناح و تاوان) .**

**كەواتە زۆر بڵێ (الحمد لله) وە (سبحان الله والحمد لله).**

٦- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبيُّ(ﷺ) يقول اللهُ عزَّ وجَلَّ: أنا عند ظنِّ عبدى بي وأنا مَعَهُ حينَ يَذكُرني، إنْ ذكرني في نفسه، ذكرتُهُ في نفسي، وإن ذكرني في مَلإٍ ذكرتهُ في ملإٍ هم خيرٌ منهم، وإن تَقَرَّب مِنّي شِبراً تَقَرَّبتُ إليهِ ذراعاً وإن تَقَرَّبَ إليَّ ذراعاً تَقَرَّبتُ منهُ باعاً وإنْ أتاني يَمشي أتيتُهُ هرولةً. رواه البخاري(٧٤٠٥) ومسلم(٢٦٧٥).

مَلَإٍ: جماعة – كۆمەڵێك.

باعاً: باڵێك، ئەگەر هەردوو دەستت بكەیتەوە بەلای راست و چەپدا، لەسەری پەنجەكانی لای راستت تا سەری پەنجەكانی لای چەپت ئەمە باڵێكە.

## مانای فەرموودەكە:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ خودا (عز وجل) دەفەرموێ: من بە گوێرەی گومان و بۆچوونی بەندەكەمم بەرانبەرم ، ومن لەگەڵیدام كاتێك یادم دەكات , جا ئەگەر لە دڵی خۆیدا لەبەر خۆیەوە یادم بكات منیش لەلای خۆمەوە یادی دەكەم , وە ئەگەر لەناو كۆمەڵێكدا یادم بكات منیش لەناو كۆمەڵێكی لەوان چاكتردا یادی دەكەم , وە ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە باسكێك لێی نزیك دەبمەوە وە ئەگەر باسكێك لێم نزیك بكەوێتەوە من باڵێك لێی نزیك دەكەومەوە، وە ئەگەر بە رۆیشتن بێت بۆ لام بە هەروەلە(راكردن) دەچم بۆ لای .

## ناوداران و یادی خوا:

١ -قال معاذ: لأن أذكر الله من بكرةٍ إلى الليل أحبُّ إليَّ مِن ان أحمل علي جياد الخيل في سبيل الله من بكرة إلى الليل.

**واته: موعاز دەڵێ: ئەگەر یادی خوا بکەم لە بەیانی تاوەکو شەو خۆشەویسترە لام لەوەی سواری ئەسپ و ماینێکی باش بم لە پێناوی خوا جیهاد بکەم لە بەیانی تاوەکو شەو.**

**٢- عیکریمە دەڵێ: ئەبو هورەیرە رۆژانە دوازدە هەزار زیکری دەکرد وە دەیگوت من بە قەد گوناهەکانم زیکر دەکەم.**

**٣- حەسەنی بەسرایی کاتێك دەست بە تاڵ بووە زۆر زیکری**(سبحان الله العظيم)**ی کردووە.**

**٤- ئەبو موسلیمی خەولانی زۆر یادی خوای دەکرد هەندێ خەڵك بینیان گومانیان بۆ ئەوە برد کە تێك چووبێت، بە هاورێکانی ئەبو موسلیمیان گوت هاورێکەتان شێتە؟ ئەبو موسلیم گوێی لێ بوو گوتی نەخێر ئەی برام، بەڵام ئەوە دەرمانی شێتیە.**

**٥- کەعب ووتویەتی**(من اكثر ذكر الله بریء من النفاق).

**واته: هەر یەکێك یادی خوا زۆر بکات ئەو کەسە بەریە لە نیفاق و دووروویی.**

# مانای هەندێك لە زیكرەكان

١- (لا إله إلا الله ): هیچ پەرستراوێكی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا

٢- ( سبحان الله ): پاك و بێگەردی بۆ خوا (التنزيه لله).

٣- (الحمد لله ) : هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوا .

٤- ( الله أكبر ): خوا گەورەترە (لەهەموو شتێك).

٥- ( أستغفر الله ): داوای لێخۆش بوون دەكەم لە خوا.

٦- (أستغفر الله وأتوب إلية): داوای لێخۆش بوون دەكەم لە خوا وە دەگەڕێمەوە بۆلای ئەو (التوبه) واتە: (الرجوع إلى الله) گەڕانەوە بۆلای خوا، بۆزیاتر سەر لە باسی (تەوبەو إستغفار) بدە.

٧- ( لا حول ولا قوة إلا بالله) : واتە: (لا تحول من حال إلا حال ولا قوة على ذلك إلا بالله) واتە: گۆڕان نییە لە بارێكەوە بۆ بارێكی تر ، وە توانا نییە بۆ ئەم گۆڕانكاریە بەخوا نەبێت ، بۆ زیاتر سەر لە باسی زیكری (لا حول ولا قوة إلا بالله )بدە.

٨- (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير)، واتە: هیچ پەرستراوێكی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا، تاكەو هیچ هاوبەشێكی نییە، هەموو دەستەڵات و سوپاس و ستایشێك بۆ ئەوە، ئەو خاوەن توانایە بەسەر هەموو شتێكدا.

٩- (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ): خۆم دەپارێزم بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی خوا، (الرجیم) یانی (المطرود من رحمة الله) دەرکراو لە رەحمەتی خوا.

١٠- ( بسم الله ): واتە: بەناوی خوا، بۆ نموونە کە نان دەخۆی دەڵێی (بسم الله) واتە: (بسم الله آكُلُ) بەناوی خوا ئەم خواردنە دەخۆم، واتە: داوای یارمەتی دەکەم لە خوا بۆ ئەم خواردنە، پیتی (باء) لە (بسم الله) مانای (استعانة) دەدا، یانی داوای یارمەتی کردن.

١١- بسم الله الرحمن الرحيم: واتە: بەناوی خوای (الرحمن) وە (الرحيم) جا (الرحمن) وە (الرحيم) دوو ناو و دوو سیفەتی خوان سیغەی موبالەغەن، واتە مانای زۆر بە رەحمی دەدەنەوە، بەڵام (الرحمن) مانای رەحمی زیاتر دەداتەوە لە (الرحيم).

١٢- (اللهم صلّ على محمد وعلى آل محمد): (بخاری) دەڵێ: (أبو العالية) دەڵێ: (صلاة الله) واتە: (ثنائه عليه عند الملائكة) یانی: باسی کردنیەتی بەچاکە لەلای فریشتە، وە هەندێکیش دەڵێن واتە (رحمة)، بۆ زیاتر سەر لە باسی (صلوات) بدە.

١٣- (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً عبدهُ وَرَسُولُهُ): واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەمەد بەندەو رەوانەکراوی خوایە.

١٤- (سبحان الله وبحمده): واتە: پاکی بۆ خواو سوپاس و ستایش بۆ ئەو .

## (گەورەیی زیکری(لا اله الا الله وحده لا شريك له..)

١-عن عمرو بن شعيب عن ابيه عن جدهِ انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: خيرُ الدعاء دعاءُ يوم عرفة، وخيرُ ما قلتُ أنا والنبيُّون مِن قَبلي: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له , لهُ الملكُ وله الحمد , وهو على كل شيءٍ قدير. حسن رواه الترمذي(٣٥٨٥).

**واته: باشترین پارانەوە پارانەوەی رۆژی عەرەفەیە وە باشترین شتێ کە من و پێغەمبەرانی پێش من ووتومانە:( لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له , لهُ الملكُ وله الحمد ,وهو على كل شيءٍ قدير)ە.**

٢- عن ابي ايوب الأنصاري(رضي الله عنه) عن النبيِّ قال: مَنْ قال: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، عَشْرَ مَرّات كانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أربَعَةَ أنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إسماعيل. رواه مسام(٢٦٩٣).

**واته: هەر یەکێك دە جاران بڵێ(لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له , لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير) وەکو ئەوە وایە کە چوار بەندە(عبد)ی ئازاد کردبێ لە مندالأنی(اسماعیل) پێغەمبەر.**

### سوود:

**١-ئەم زیکرە لەگەڵ ئاسانیەکەی پاداشتێکی زۆری لە بەرامبەردا هەیە، فەرموودەکەش(صحیح)ە و(مسلم) ریوایەتی کردووە.**

٢- ئەم زیکرە هەر دەمێ بتەوێ بیکەی دەتوانی بیکەی کاتی گوتنەکەی سنووردار نی یە.

٣- لەم فەرموودەیەدا باسی ئازاد کردنی چوار بەندەی تیایە لە منداڵانی(اسماعیل) جا بۆ ئازاد کردنی یەك بەندە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ(مَنْ أعْتَقَ رَقَبَةً مُؤمنةً، أعْتَقَ اللهُ بِكلِّ إربٍ[١] مِنها إرباً منهُ مِنَ النار[٢]).

٣- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ مَنَحَ مَنيحَةَ وَرِقٍ أو مَنيحةَ لَبَنٍ أو هَدَى زُقاقاً فهو كَعِتاقِ نَسَمَةٍ، ومَنْ قالَ: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير فهو كَعِتقِ نَسمةٍ[٣].

واتە: هەر یەکێك قەرزێك بدات یا حەیوانێکی شیردار بدا بە یەکێك و سوود لە شیرەکەی وەربگرێ و لە پاشان بۆی بگێڕێتەوە، یا ڕێگایەك بە کوێرێك یا سەرگەردانێك نیشان بدات ئەوە وەکو ئەوە وایە عەبدێکی ئازاد کردبێت. وە هەر یەکێکیش بڵێ(لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير) ئەوەش وەکو ئازاد کردنی بەندەیەك وایە.

---

(١) الإرب: هو العضو، واتە: ئەندام.

(٢) رواه مسلم(١٥٠٩) عن ابي هريرة.

(٣) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه احمد ورواته محتج بهم في الصحيح، وە(ترمذي) بەشی یەکەمی ئەم فەرموودەی ریوایەت کردووە بە ژمارە(١٩٥٧) ئەلبانیش دەڵێ(صحيح)ە.

**سوود**:

١-گەورەیی سەد جار گوتنی ئەم زیکرە لە باسی زیکری بەیانیان و ئێواران باس کراوە، وە هەروەها هەر لەم بەشە باسی گوتنی(١٠) جار و(١) جاریش ئەم زیکرە لە کاتی بەیانیان و ئێواران باس کراوە.

٢- دە جار گوتنی ئەم زیکرە بە زیادکردنی(یحی و یمیت) لە باسی نوێژ لە بەشی زیکر لە دوای سەلام دانەوەی نوێژە فەرزەکان باس کراوە.

## گەورەیی زیکری(لا حول ولا قوة إلا بالله):

١-عن قيس بن سعد بن عُبادة(رضي الله عنهما) أَنَّ اباهُ دَفَعَهُ إلى النبيَ(ﷺ) يَخدُمُه قال: فَمَرَّ بيَ النبيُّ(ﷺ) وقد صليتُ فَضَربني بِرِجْلهِ وقال: ألا أدُلُّك على بابٍ مِن أبواب الجنةِ؟ قلتُ: بلى، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله. صحيح: رواه الترمذي(٣٥٨١).

**واتە: قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: باوکم منی بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی خزمەتی بکەم، قەیس دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بە لامدا تێپەڕی لەو کاتەدا نوێژم تەواو کردبوو ، بە پێی لێ دام و فەرمووی: ئایا دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشتت نیشان بدەم؟ گوتم بەڵێ، فەرمووی :(لا حول ولا قوه إلا بالله).**

## ماناى (لا حول ولا قوه إلا بالله):

أ-ماناى(لا حول ولا قوه إلا بالله) واته:(لا تحوُّل من حال إلي حال ولا قوة على ذلك، إلاّ بالله) يانى: گۆڕان نييه له بارێكه‌وه بۆ بارێكى تر ، وه توانا نييه بۆ ئه‌م گۆڕانكاريه مه‌گه‌ر به خوا نه‌بێت.

ب- مانايه‌كى ترى ئه‌م زيكره: لادان نييه له خراپه‌و توانا نييه بۆ چاكه به خوا نه‌بێت.

(لا حول في دفع الشَّر ولاقوة في تحصيل الخير إلاّ بالله).

ئه‌گه‌ر ويست و ده‌سه‌ڵاتى خوا نه‌بێت ئێمه ناتوانين خۆبپارێزين له هيچ گوناهێك و هيچ چاكه‌يه‌ك ئه‌نجام بده‌ين.

ج- كنز: واته: خه‌زنه، يا گه‌نجينه.

٢- عن ابي موسى(رضي الله عنه) قال: قال لِي رسول الله (ﷺ) : الا أَدُلُّكَ على كنزٍ من كُنوز الجنةِ. فقلت: بلى يا رسول الله، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله. رواه البخاري(٢٩٩٢) ومسلم(٢٧٠٤).

واته: ئه‌بو موسا ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) پێى فه‌رمووم: ئايا خه‌زنه‌يه‌ك له خه‌زنه‌كانى به‌هه‌شتت پێ نيشان بده‌م؟ گوتم: به‌ڵێ ئه‌ى پێغه‌مبه‌رى خوا، فه‌رمووى: لا حول ولا قوه إلا بالله.

## سوود:

١–(كنز) كۆیەكەی(كنوز)ە، بەو خەزنەو ماڵ و سامانە دەگوترێ كە پێش ئیسلام خەڵكی لە ژێر گڵ و بن بەردو كەڵەك و ئەشكەوت دا شاردوویاننەوەو پەنهانیان كردوون.

٢– (كنز من كنوز الجنه) واتە: موسڵمان بە هۆی گوتنی ئەم زیكرە پاداشتێكی بە نرخی لە بەهەشت بۆ پاشەكەوت دەكرێ.

٣- عن ابي ذرّ قال: قال رسول الله (ﷺ) ألا أَدُلُّك على كنزٍ من كنوزِ الجنةِ؟ قلت: بلى يا رسول الله، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله.
صحيح: رواه ابن ماجة(٣٨٢٥).

واتە:(ابو ذر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا خەزنەیەك لە خەزنەكانی بەهەشتت نیشان بدەم؟ گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی(لا حول ولا قوه إلا بالله).

## زیکری :(سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله والله أكبر)

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) لأَن أَقولَ: سبحان الله، والحمدلله، ولا إله الا الله، والله اكبر، أَحبُّ إليَّ مِمّا طَلَعَت عليه الشمسُ. رواه مسلم(٢٦٩٥).

**واته: سوێندم به خوا ئەگەر بڵێم(سبحان الله ، والحمدلله ، ولا الـه الا الله , والله أكبر) لام خۆشەویستره لەوەی كە ڕۆژی بەسەردا هەڵدێ.**

**سوود: ماناى ئەم زیكرانە بەم شێوەیە:**

١-سبحان الله: **پاك و بێ گەردی بۆ خوا.**

٢- الحمدلله: **هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوا.**

٣- لا الة الا الله: **هیچ پەرستراوێكی بە ڕاستی نییە بێجگە لە خوا.**

٤- الله اكبر: **خوا گەورەترە(لە هەموو شتێك).**

٢- عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول:( أفْضَلُ الذِّكرِ: لا اله الا الله). **حسن: رواه الترمذي(٣٣٨٣) وابن ماجه (٣٨٠٠).**

**واته : (لا اله الا الله) گەورەترین یادی خوایە.**

٣- عن سعد بن ابي وقاص(رضي الله عنه) قال كنا عند رسول الله (ﷺ) :(أَيَعْجِزُ أحَدُكم أَنْ يَكسِبَ كلَّ يوم ألفَ حسنةٍ، فَسَأَلَهُ سائِلٌ مِنْ جُلسائِهِ: كيف يكسبُ أحدنا ألف حَسَنَةٍ؟ قالَ:(يُسَبِّحُ مئة تَسبيحةٍ، فَيُكتَبُ لهُ ألفُ حَسَنَةٍ ويُحَطُّ عنْهُ ألفُ خطيئةٍ. **رواه مسلم(٢٦٩٨) والترمذي(٣٤٦٣).**

واتە: ئەوە یەکێك لە ئێوە ناتوانیٚ هەموو رۆژیٚ(١٠٠٠) چاکە بە دەست بێنیٚ، پرسیارکەرێك لە دانیشتوان پرسیاری کرد: چۆن یەکێك لە ئێمە(١٠٠٠) چاکە بە دەست بێنیٚ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (١٠٠) جار(سبحان الله)دەڵیٚ، (١٠٠٠) چاکەی بۆ دەنوسریٚ، وە(١٠٠٠) گوناحی لیٚ لا دەبریٚ.

٤-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يَغْرِسُ غَرْسًا فَقَالَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا الَّذِي تَغْرِسُ قُلْتُ غِرَاسًا لِي قَالَ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى غِرَاسٍ خَيْرٍ لَكَ مِنْ هَذَا قَالَ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ قُلْ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ يُغْرَسْ لَكَ بِكُلِّ وَاحِدَةٍ شَجَرَةٌ فِي الْجَنَّةِ. صحيح: رواه ابن ماجه(٣٨٠٧).

واتە: ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: پێغەمبەر (ﷺ) بە لامدا تێپەری لەو کاتە نەمامێکم دەچاند، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەوە چ دەچێنی؟ گوتم : نەمامێکی دارخورمایە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا نەمامێکت نیشان بدەم باشتر بێت لەوە ؟ گوتم بەڵیٚ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی بڵیٚ :(سبحان الله والحمدلله ولا الـه الا الله والله اکبر) بە گوتنی هەر یەکێکیان دارێکت لە بەهەشت بۆ دەچێنریٚ.

٥- عن أُمَّ هانيءٍ قالت: أتيتُ الى رسول الله (ﷺ) فقلتُ يا رسول الله دُلَّني على عَمَلٍ، فإنّي قد كَبِرتُ وضَعُفتُ وبَدُنتُ، فقال: كبرِّى اللهَ مِئَةَ مَرَّةٍ، واحمدي الله مِئَةَ مَرَّةٍ، وسبِّحي الله مِئَةَ مَرَّةٍ خيرٌ من مِئَةِ فَرسٍ مُلْجَمٍ مُسْرَجٍ في سبيل الله، وخيرٌ من مِئَةِ بدنَةٍ وخيرٌ من مِئةِ رَقبةٍ. حسن: رواه ابن ماجة(٣٨١٠).

واته: (أم هانئ) دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم پێ نیشان بدە، چونکە بێگومان من گەورە بووم و بێ هێز بووم و قەڵەو بوویمە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (١٠٠)جار بڵێ (الله اکبر) ، وە (١٠٠) جار بڵێ (الحمد لله) وە (١٠٠) جار بڵێ(سبحان الله)، باشترە لە(١٠٠) ئەسپ و ماینی لغاوکراوو زین کراو لە ڕێی خوادا، وە باشترە لە(١٠٠) ووشتر وە باشترە لە(١٠٠) کۆیلە.

## زیكری(سبحان الله وبحمده) وه(سبحان الله العظیم):

١-عـن أبـي هريـرة أنَّ رسـولَ الله (ﷺ) قـال: مَـنْ قـال سـبحان الله وبحمدهِ في يومٍ مِئَةَ مَرَّةٍ، حُطَّت خطاياهُ وإنْ كانت مثل زبَدِ البَحر. رواه البخاري(٦٤٠٥) ومسلم(٢٦٩١).

واته: هـهر یـهكێك لـه ڕۆژێكدا(١٠٠) جـاران بڵێ(سـبحان الله وبحمـده) گوناههكانی ههڵدهوهرێن ئهگهر وهكو كهفاوی دهریاش بن.

**سوود:**

له باسی زیكری بهیانیان و ئێواران فهرموودهیهكمان هێناوهتـهوه كـه باس له گهورهیی گوتنی ئهم زیكره دهكـات(١٠٠) جـار لـه كـاتی بـهیانی وه(١٠٠) جاریش له كاتی ئێواره.

٢- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) : كلمتان خفيفتان على اللسـان، ثقيلتـانِ فـي الميـزان، حبيبتـان الـى الـرّحمن: سـبحان الله وبحمدهِ سبحان الله العظيم. رواه البخاري(٦٤٠٦) ومسلم(٢٦٩٤).

واته: دوو ووشه ههن ئاسـانن لهسـهر زمـان ، گـرانن لهسـهر تـهرازوو، خۆشهویستن لای خـوای بـه بهزهیی:(سـبحان الله وبحمـدهِ) (سـبحان الله العظیم).

**سوود:** مانای ئهم دوو زیكره بهم شێوهیه:

سبحان الله وبحمده: پاكی بۆ خواو ستایش بۆ ئهو.

سبحان الله العظيم: پاكی بۆ خوای گهوره .

٣- عنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( أَلَا أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ) قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ فَقَالَ (إِنَّ أَحَبَّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)رواه مسلم(٢٧٣١)

**واته: (أبو ذر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا خەبەرت پێ بدەم بە خۆشەویسترین قسە لای خوا، منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا خەبەرم پێ بدە بە خۆشەویسترین قسە لای خوا، فەرمووی بێگومان خۆشەویسترین قسە لای خوا (سبحان الله وبحمده)یە.**

## زیکری(سبحان الله العظیم وبحمده):

١-عن جابر عن النبيّ (ﷺ) قال: مَنْ قال: سبحان الله العظيم وبحمده، غُرستْ لَهُ نَخلَةٌ في الجنّة. صحيح: رواه الترمذي(٣٤٦٤).

**واته: هەر یەکێك بڵێ:(سبحان الله العظیم وبحمده) دارخورمایەکی بۆ دەچێنرێ لە بەهەشتدا.**

### سوود:

**١-( سبحان الله العظیم وبحمده) واته: پاکی بۆ خوای گەورەو ستایش بۆ وی.**

**٢- هەر چەند جارێ ئەم زیکرە دووبارە بکەیتەوە دارخورمایەکی زیاترت بۆ دەچێنرێ لە بەهەشتدا.**

# سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)

١-عن ابي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ صلَّى عليَّ واحدةً صلى الله عليه عشراً. رواه مسلم (٤٠٨) وابوداود (١٥٣٠).

**واتە: هەر یەکێك یەك سەڵەواتم لەسەر لێبدات خودا دە سەڵەواتی لەسەر لێ دەدات.**

## سوود:

**لە باسی نوێژ بەهێزترین فەرموودەی پێغەمبەرمان هێناوەتەوە دەربارەی چۆنیەتی سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) وە ماناکەشی لێك دراوەتەوە.**

٢- عن عليّ قال: قال رسول الله (ﷺ) : أَلبَخِيلُ مَن ذُكِرتُ عندَهُ فَلَم يُصَلِّ عليَّ. صحيح: رواه الترمذي(٣٥٤٦).

**واتە: رەزیل ئەو کەسەیە کە ناوی منی لە لا دێت و سەڵەواتم لەسەر لێ نادات.**

٣- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) : لا تجعلوا قَبرى عِيداً، وصلُّوا عليَّ فَإنَّ صلاتَكُم تَبْلُغني حيث كنتم. صحيح: رواه ابوداود(٢٠٤٢).

**واتە: سەر گۆرەکەم وەك رۆژی جەژن لێ مەکەن، وە سەلەواتم لەسەر لێبدەن، بێگومان سەڵەواتەکانتان پێم دەگەن لە هەر کوێیەك بن.**

**سوود**:

**جائیز نییه سەفەر کردن بۆ سەردانی گۆری پێغەمبەر (ﷺ) , بەلام سەفەر کردن بۆ مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نوێژ کردن تیایدا سوننەتە , وە هەر نوێژێکیش لەم مزگەوتەدا بە هەزار نوێژ هەیە.**

٤- عن اوسِ بْنِ اوسٍ قال: قال رسول الله (ﷺ) إنَّ مِن أفضلِ أيّامِكم يومَ الجمعةِ فيهِ خَلَقَ اللهُ آدمَ وفيهِ قُبِضَ وفيهِ النَّفخَةُ، وفيهِ الصَّعْقَةُ، فأكثروا عليَّ من الصلاةِ فيه، فإنَّ صلاتكُم معروضَةٌ عليَّ، قالوا: كيفَ تُعرضُ صلاتنا عليك وقَدْ أَرِمتَ؟ فقال: إنَّ الله عز وجل حرَّم على الأرضِ أجسادَ الأنبياء. صحيح: رواه ابوداود(١٠٤٧) و ابن حبان(٩١٠).

**واتە: بێگومان لە باشترین رۆژەکانتان رۆژی جومعەیە، لەم رۆژەدا خوا ئادەمی دورست کردووە، وە لەو رۆژەدا گیانی کێشراوە، وە لەو رۆژەدا فوو بە(صور)دا دەکرێ، وە لەو رۆژەدا هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دان دەمرن(مەگەر کەسانێ خوا بیەوێ نەمرن)، جا لەم رۆژەدا زۆر سەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان سەڵەواتەکانتان نیشانم دەدرێ، گوتیان: چۆن سەڵەواتەکانمان نیشانت دەدرێ لە کاتێکا کە تۆ رزیوی؟ فەرمووی: بێگومان خوا(عز وجل) قەدەغەی کردووە لەسەر زەوی کە جەستەی پێغەمبەران(بخوات).**

## زیکری(رضیت بالله رباً....):

عن ابي سعيد الخدري قال: قال رسول الله (ﷺ) : منْ قال رَضِيتُ بالله رَبّاً وبالإسلام ديناً وبمحمدٍ (ﷺ) نبياً وجبت لَهُ الجنة[1].

واته: هەر یەکێك بڵێ (رَضِيتُ بالله رَبّاً وبالإسلام ديناً وبمحمدٍ (ﷺ) نبياً) بەهەشتی بۆ واجب دەبێت.

**سوود**: گوتنی ئەم ووشانە پاداشتیان بەهەشتە بەڵام نابێت گوتنی ئەم ووشانە تەنها قسەی بێ ناوەڕۆك بن، بۆ نمونە کە دەڵێ ی (وبالإسلام دينا) دین: واتە رێبازو بەرنامە جا کە تۆ دەڵێ ی رازیم ئیسلام دین و بەرنامەم بێت ، دەبێ تۆ بۆ هەموو لایەنەکانی ژیانت بگەڕێیتەوە بۆ ئەم ئیسلامە لە لایەنی عیبادەت و سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هەموو لایەنەکانی تر، وە ئیسلامیش باسی هەموو لایەنەکانی ژیانی تێدایە بە تەواوی ، وە بە شێوەیەك کە لە ئەوپەری رێك و پێکی دایە چونکە بەرنامەی خوایە.

عنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( أَلَا أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ) قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ فَقَالَ (إِنَّ أَحَبَّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)رواه مسلم(٢٧٣١)

واتە: (أبو ذر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا خەبەرت پێ بدەم بە خۆشەویسترین قسە لای خوا، منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا خەبەرم پێ بدە بە خۆشەویسترین قسە لای خوا، فەرمووی بێگومان خۆشەویسترین قسە لای خوا (سبحان الله وبحمده)یە.

---

(١) رواه ابن حبان في صحيحه(٨٦٥) وقال: شعيب الأرنؤوط: اسناده قويّ.

# زیکری بەیانیان و ئێواران

## کاتی زیکری بەیانیان و ئێواران

أَذكارُ الصَّباحِ يَبْتَدىءُ وَقْتُها مِنَ الفَجرِ إلى طُلُوعِ الشَّمس، وَ أَذكارُ المَساءِ ما بَينَ العَصْرِ وَ الغُروب[١].

**واتە: زیکری بەیانیان کاتەکەی دەست پێ دەکات لە بانگی بەیانیەوە تا رۆژ هەلاتن، وە زیکری ئێواران کاتەکەی دەکەوێتە نێوانی عەسرو رۆژ ئاوابوون.**

**را جیایی(خلاف) هەیە لە نێوان زانایان دا لەسەر کاتی زیکری بەیانیان و ئێواران، بەلاّم ئەم دوو کاتەی لێرەدا باس کراوە هیچ(خلاف)ێکی لەسەر نی یە.**

**وە باشتر وایە ئەم زیکرانە لە یەکەم کاتی دەستپێکردنیان بکرێن، بەلاّم ئەگەر لە کۆتا کاتەکانیش کران واتە پێش رۆژ هەلاّت و پێش رۆژ ئاوا بوون هەر باشەو بۆت بەردەکەوێت. وە دەشتوانی لە کردنی زیکرەکان پاش و پێشیان پێ بکەی، وە ئەگەر کات و رۆژگاری وات بەسەردا هات کە بێ تاقەتی رووی تێ کردی ئەو کاتە ئەوەندەی پێت بکرێ لەم زیکرانە بیکە، وە هەر کاتێکیش کە بێتاقەتیەکەت نەما ئەوە هەولّ بدە بە تەواوی زیکرەکان بکەی،**

---

(١) فقه السنة.

## پرسیار:

ئایا دروسته كه بانگی بەیانی دەدرێت یابانگی عەسر دەدرێت هێشتا قامەت نەكراوه تۆ لەم نێوانەدا زیكری بەیانیان و ئێواران بكەی.

## وەڵام:

بەڵێ دروست چونكه كاتەكانیان دەستی پێ كردووه، دەتوانی هەموو یا هەندێك لەم زیكرانه بكەی، وه له دوای نوێژو زیكرەكانی دوای نوێژ ئەوانی تریش بكەی ئەگەر كردت.

بەڵام ئەگەر لەنێوان بانگو قامەت خۆت خەریك بكەی بەدوعاو پارانەوه لەدوای تەواو بوونی نوێژو زیكرەكانی دوای نوێژ ئەوجا زیكرەكانی بەیانیان و ئێواران بكەی ئەمەش زۆر باشە،پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموویەتی (لا يُردُّ الدعاء بين الأذان والاقامة) [1] .واتە: دوعاو پاڕانەوه ناگەڕێندرێتەوه لەنێوانی بانگو قامەتدا .

---

(١) رواه أبو داود (٥٢١) وصححه الألباني..

# زیكری بەیانیان و ئێواران

## تێبینی

زیكرەكانی بەیانیانو ئێواران ئی وایان هەیە لەهەردووكات دەگوترێن، ئی وایان هەیە تەنها بەیانیان ئەنجام دەدرێ، ئی وایان هەیە تەنها ئێواران دەكرێ، جا هەموو جاران تەئكیدبكەوە لەسەرەوەی ئەم لاكێشەی كە زیكرەكەی تیادا نوسراوە باس لەوە كراوە كەزیكرەكە لەچ كاتێكدا دەكرێ، ئایا لەهەدوو كات دووبارە دەبێتەوە یا تەنها لە بەبانیان یان تەنها لەئێواران دەگوترێ.

## زیكری (١)

**ئەم زیكرەی لای خوارەوە بەیانیان یەك جار دەكرێ:**

| |
|---|
| أَللهم بِكَ أَصْبَحْنا، وبِكَ أَمْسَينا، وبِكَ نَحيا وبِكَ نَموت، وإِلِيكَ النُّشور.<br><br>**واتە: ئەی خودایە بە هۆی تۆوە بەیانیمان كردەوە، وە بەهۆی تۆوە ئێوارەمان كردەوە، وە بەهۆی تۆوە دەژین، وە بەهۆی تۆوە دەمرین، وە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ.** |

## زیکری (٢)

ئەم زیکرەی لای خوارەوە ئێواران یەك جار دەکرێ.

| أَللهُمَ بِكَ أَمْسَينا، وبِكَ أَصبَحنا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ، وإليكَ المصيرُ.<br><br>**واتە: ئەی خودایە بە هۆی تۆوە ئێوارەمان کردەوە، وە بەهۆی تۆوە بەیانیمان کردەوە، وە بەهۆی تۆوە دەژین، وە بەهۆی تۆوە دەمرین، وە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ.** |
|---|

## بەڵگە لەسەر زیکری (١) و (٢)

عن أبي هريرة قال: كانَ رَسول الله(ﷺ) يُعَلِّمُ أصحابَهُ يقول:(اذا أَصبحَ أحدكم فَليَقُلْ: أللهمَّ بِكَ أَصبَحنا، وبِكَ أمسَينا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموت، وإليكَ النُّشور، واذا أمسى فَلْيَقُل: أَللهُمَّ بَكَ أمسَينا، وبِكَ أَصبَحنا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ وإليكَ المَصيرُ). صحيح: **رواه ابوداود(٥٠٦٨) والترمذي(٣٣٨٨).**

**واتە: ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەسحابەکانی فێر دەکرد، دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەیانی کردەوە با بڵێ:** ( أللهمَّ بِكَ أصبَحنا، وبِكَ أمسَينا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموت، وإليكَ النُّشور).

**وە ئەگەر ئێوارەشی کردەوە با بڵێ:** أَللهُمَّ بَكَ أَمسَينا، وبِكَ أَصبَحنا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ وإليكَ المَصيرُ.

## زیکری (۳)

**ئەم زیکرەی خوارەوە بەیانیان (۱)جارو ئێوارانیش (۱) جار دەگوترێ:**

أصْـبَحْنا وأصْـبحَ المُلـكُ لله , والحمـد لله , لا إلـه إلا الله وحـدهُ لا شـريك لـه ، لـه المُلكُ وله الحمـدُ [illegible] على كل شـيء قـدير , ربِّ أسألُكَ خيرَ ما في هذا اليومِ وخيرِ ما بعدهُ , وأعو[illegible] ما في هذا اليـومِ وشَرِّ مـا بعدهُ , ربِّ أعـوذُ بِكَ مِنَ الكَسَـلِ وسُوءُ الكِبرِ ربِّ أعوذُ بِكَ مِن عذابٍ في النار وعذابٍ في القبر.

**واتـە: بـەیانیمان كـردەوە، هەرچـی دەسـتەڵات هەیـە بـۆ خوایـە، وەهەموو سوپاس‌و ستایشێك بۆ خوایـە، هـیچ پەرسـتراوێكی بەراسـتی نیە بێجگە لە خوا، تاكەو هـیچ شـەریكێكی نییـە، هـەموو دەسـتەڵاتێك بۆ ئەوە، وە هەموو سوپاس‌و ستایشێكیش هەر بۆ ئەوە، وەئەو خاوەن توانایە بەسەر هەموو شتێكا، ئەی پەروەردگارم داوای ئەم خێرانەت لـێ دەكـەم كـە لـەناو ئـەم ڕۆژە دایـەو وەئـەوەش كـە لـەدوای ئـەم ڕۆژەدایە،وەخۆم دەپارێزم بەتۆ لەهەمووزیانێك كە لەناو ئـەم ڕۆژە دایـە وە لەزیانی دوای ئەم ڕۆژەش، ئەی پەروەردگارم خـۆم دەپـارێزم بـەتۆ لەتەمبەڵی‌و لەخراپەی پـیری، ئـەی پـەروەردگارم خـۆم دەپـارێزم بـەتۆ لەسزایەك لەئاگر وە سزایەك لەقەبر (كەتووشم بێت).**

## تێبینی لەسەر زیکری (٣)

ئەم زیکرە بەیانیەکەی بەم شێوەیە دەکرێ کە نووسیمانە لەباسی زیکری (٣) , بەڵام ئێوارەکەی هەندێك جیاوازی هەیە لەبەر ئەوەی باسی ئێوارەییەو راناوەکانیش (ضمير) بۆ (الليلة) دەگەڕێنەوە لەبری (اليوم) , جا ئێوارەکەی بەم شێوەیە دەگوترێ:

| أمسينا وأمسى المُلكُ لله , والحمد لله , لا إله إلا الله وحدة لا شريك له ، له المُلكُ وله الحمدُ وهو على كل شيء قدير , ربِّ أسألُكَ خيرَ ما في هذه الليلة وخيرِ ما بعدها , وأعوذُ بِكَ مِن شَرِّ ما في هذه الليلة وشَرِّ ما بعدها , ربِّ أعوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ وسُوءُ الكِبَرِ , ربِّ أعوذُ بِكَ مِن عذابٍ في النار وعذابٍ في القبر. |
|---|

## بەڵگە لەسەر زیکری (٣)

عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: "كان نبي الله صلى الله عليه وسلم إذا أمسى قال: "أمسينا وأمسى الملك لله، والحمد لله، لا إله إلا الله وحده لا شريك له،(قال أراهُ قال فيهنَّ) له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، رب أسألك خير ما في هذه الليلة وخير ما بعدها، وأعوذ بك من شر ما في هذه الليلة وشر ما بعدها، رب أعوذ بك من الكسل وسوء الكبر، رب أعوذ بك من عذاب في النار، وعذاب في القبر"، وإذا أصبح قال ذلك أيضا: "أصبحنا وأصبح الملك لله"رواه مسلم (٢٧٢٣) وابوداود (٥٠٧١). والترمذي (٣٣٩٠)

## زیکری (٤)

**ئەم زیکرەی خوارەوە تەنها بەیانیان (١) جار دەگوترێ**

أصْبَحنا على فِطْرَةِ الإسلام، وكلمةِ الإخلاصِ، وعلى دينِ نبينا محمد صلى الله عليه وسلم، وعلى مِلَّةِ أبينا إبراهيمَ حنيفاً مسلما وما كان من المشركين.

**واتە: بەیانیمان کردەوە لەسەر ئایینی ئیسلام** (فطرة الاسلام) **، وە لەسەر وشەی یەکخواپەرستی (لا الـه الا الله)وە لەسەر ئاییـنی پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ)، وە لەسەر ئاییـنی باوکمان ئیبراهیم کە لە هەموو ئایینە ناراستەکان لایداوە بۆ پەرستنی خوا بەتەنها وموسڵمان بووە، وەبەهیچ جۆرێك لەهاوبەش پەیدا کەران نەبووە.**

## بەڵگە لەسەر زیکری (٤)

عن عبد الرحمن بن أبزى رضي الله عنه قال: "كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا أصْبَحَ قال: أصْبَحْنا على فِطْرَةِ الإسلامِ، وكلمةَ الإخلاصِ، وعلى دِيْنِ نَبِيِّنا مُحمَّدٍ صلى الله عليه وسلم، وعلى مِلَّةِ أبينا إبراهِيمَ حنيفاً مُسلماً وما كان مِن المُشركين" حديث صحيح : رواه الامام احمد (٣/٤٠٦-٤٠٧)وابن السني في عمل اليوم والليلة (٣٤)وغيرهما وانظر صحيح الجامع (٤٦٧٤).

## ماناى ووشەكان

أصبحنا بـەيانيمان كـردووە، چـووينە نـاو كـاتى بەيانى

فطرة الاسلام دين الاسلام،ئاييني ئيسلام

كلمـــــــــــة الاخلاص كلمـه التوحيـد (لا الـه الا الله) ووشــەى يەكخواپەرستى (لا اله الا الله)

ملة ئايين

حنيفاً لادەر لەهــەموو ئــايينێكى چــەوت بــۆ پەرستنى خوا بەتەنيا

## ماناى فەرموودەكە:

پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك كەبەيانى بكردباوە دەيفـەرموو: أصْبَحنا على فِطْرَةِ الإسلام، وكلمةِ الإخلاصِ، وعلى دينِ نبينا محمد صلى الله عليـه وسـلم، وعلـى مِلَّـةِ أبينـا إبـراهيمَ حنيفـاً مسـلما ومـا كـان مـن المشركين.

## زيكرى (٥)

ئەم زيكرەى ناو ئەم لاكێشەى خوارەوە بەيانيان (٤) جارو ئێوارانيش (٤) جار دەگوترێ:

اللهم إني أصبحتُ أُشْهِدكَ، وأُشْهِد حملةَ عرشِكَ، وملائكتَكَ، وجميعَ خَلْقِك: أنَّكَ أنت الله، لا إله إلا أنت، ، وأنَّ محمدًا عبدُك ورسولُك؛

**واتە: ئەی خودایە من بەیانیم کردەوە، تۆ دەکەم بەشایەت وە هەڵگرانی عەرشەکەت (دەکەم بەشایەت)،وەفریشتەکانت، وەهەموو دروست کراوانت، کەتۆ ئەو خوایەی بێجگە لەتۆ پەرستراوی تر نین،وە بێ گومان موحەممەد بەندەو نێرراوی تۆیە.**

## بەڵگە لەسەر زیکری (٥)

عن انس بن مالك ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم)قال : "من قال حين يُصبح او يمسي: اللهم إني أصبحتُ أُشْهِدكَ، وأُشْهِد حملة عرشك، وملائكتك، وجميع خَلْقك: أنك أنت الله، لا إله إلا أنت، ، وأن محمدًا عبدُك ورسولُك؛ أعتق الله ربعه من النار فمن قالها مرتين اعتق الله نصفه ،ومن قالها ثلاثا اعتق الله ثلاثة ارباعه فإن قالها أربعا أعتقه الله من النار." { رواه ابوداود(٥٠٦٩) والبخاري في الادب المفرد(١٢٠١)والنسائي في عمل اليوم والليلة(٩) وابن السني (٧٠) والخلاصة أن الحديث صحيح بشواهده وقد حسنه جمع من الائمة منهم النووي والحافظ بن حجر في نتائج الافكار والعلامة ابن باز في تحفة الاخيار والعلامة عبد المحسن العباد في شرحه لسنن ابي داود وبالله التوفيق.

**واتە: هەر یەکێك کاتێك کە بەیانی دەکاتەوە یائێوارە دەکاتەوە بڵێ :**

اللهم إني أصبحتُ أشْهدكَ. وأُشْهد حملة عرشك. وملائكتك. وجميع خَلْقك: أنك أنت الله. لا إله إلا أنت. ، وأن محمدًا عبدُك ورسولُك."

**خوا چارەکێکی لەئاگار ئازاد دەکات، وەهەر یەکێك دووجار بیڵێ خوا نیوەی ئازاد دەکات (لەئاگر)، وەهەریەکێك سێ جار بیڵێ خوا سێ لەسەر چوار بەشی ئازاد دەکات (لەئاگر)،وەئەگەر چوار جاری گوت، ئەوە خوا ئازادی دەکات لەئاگر.**

## زیکری (٦)

**ئەم زیکرەی خوارەوە بەیانیان (١) جارو ئێوارانیش (١) جار دەگوترێ:**

أصْبحنا وأصبحَ المُلكُ لله ربّ العالمين . اللهم إني أسألُكَ خير هذا اليومِ فَتْحَهُ ونَصرَهُ ونورَهُ وبَركَتَهُ وهُداهُ . وأعوذ بكَ مِن شرِّ ما فيه ومِن شرِّ ما بَعدهُ.

**واتە: بەیانیمان کردەوە، هەرچی دەستەڵاتیش هەیە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، ئەی خودایە داوای خێری ئەم رۆژەت لێ دەکەم، بەبەدەست هێنانی ئەوەی مەبەستمە، وەسەرکەوتنم بەسەر دوژمندا، وەبەدەست هێنانی زانیاریو کاری چاك کردن، وەئاسان کردنی بەدەست هێنانی رسقی حەڵاڵو پاك، وەجێگیر بوون لەسەر شوێن کەوتنی هیدایەتو سەرپێچی نەکردن، وەخۆم دەپارێزم بەتۆ لەزیانی ئەوەی لەناو ئەم رۆژە دایە، وەلەشەڕی دوای ئەم رۆژەش.**

## بەڵگەی لەسەر زیکری (٦)

عن أبي مالك أنَّ رسولَ اللهِ – صلى الله عليه وسلم – قال : إذا أصْبحَ أحَدُكُم فَلْيَقُلْ (أصْبَحْنا وأصبحَ الملْكُ لله رب العالمين ، أَللهمَّ إني أسأَلُكَ خيرَ هذا اليوم فَتْحَهُ ونَصرهُ ونُوره وَبركَتَهُ وهُداهُ ، وأعوذُ بكَ مِن شَرِّ ما فيه ومِنْ شَرِّ ما بَعدهُ ، ثمَّ إذا أمسى فَلْيَقُلْ مثلَ ذلك) رواه ابـوداود(٥٠٨٤) ** والحـاكم وصـححه ووافقـه الـذهبي ، وحسـنه الالباني في صحيح الجامع (٣٥٢).

## ماناى وشەكان

| | |
|---|---|
| فتحهُ | الظفر على المقصود |
| ونصره | النصرة على العدو |
| ونوره | بتوفيق العلم والعمل |
| وبركته | بتيسير الرزق الحلال الطيب |
| وهداه | الثبات على متابعة الهدى ومخالفة الهوى |
| إذا أمسى | كاتێك ئێوارەى كردەوە |

**تێبينى**:ئەم زيكرەى كە بەم شێوەى لاى سەرەوە باس كرا بەيانيان دەخوێنرێ بەڵام ئەگەر ئەم زيكرە ئێواران خوێندرا ئـەوە بـەم شـێوەى خوارەوەى لێ دێت.

أمسينا وأمسى الملك لله رب العالمين، اللهم إني أسالك خير هذه الليلة فتحها ونصرها ونورها وبركتها وهداها، واعوذ بك من شر ما فيها ومن شرّ ما بعدها

## زيكرى (٧)

**ئەم زيكرە بريتيە لە خوێندنى (آية الكرسي) بەيانيان يەك جار وە ئێوارانيش يەك جار كە بەم شێوەيە.**

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٢٥٥ ﴾ البقـــرة: ٢٥٥

## بەڵگە لەسەر زيكرى (٧)

عن أبيِّ بْنِ كَعْبٍ رضي الله عنه أنَّه كان له جِرْنٌ من تَمْرٍ فكان يَنقصُ ، فَحَرَسَهُ ذاتَ ليلةٍ فإذا هو بِدابَّةٍ شِبْهُ الغلامِ الْمُحْتَلِمِ فَسَلَّمَ عليه فَرَدَّ عليه السلام فقال : ما أنت جِنِيٌّ أم إنْسِيٌّ قال : جِنِّيٌّ، قال : فناوِلْنِي يدكَ ، فناوَلَهُ يدَهُ فإذا يدُهُ يَدُ كَلْبٍ وشَعْرُهُ شَعْرُ كَلْبٍ ، قال : هذا خلقُ الْجِنِّ ؟ !! قال : قَدْ عَلِمَتِ الْجِنُّ أنَّ ما فيهم رجل أشدُّ مِنِّي ، قال : فما جاء بِكَ ؟ قال : بَلغنا أنَّكَ تُحِبُّ الصَّدقةَ ، فَجِئْنا نُصِيبُ مِن طعامِكَ ، قال : فما يُنْجِينا مِنكم ؟ قال : هذه الآية التي في سورة

البقرة :(ألله لا اله الا هو الحيٌّ القيُّوم) مَن قالها حين يُمسي أُجِيرَ مِنَّا حتى يُصْبِحَ ، ومَن قالها حين يُصبح أُجِيرَ مِنا حتى يُمسِي .
فلما أصْبَحَ أتى رسولَ الله صلى الله عليه وسلم – فذكرَ ذلك لَهُ – فقال : صدقَ الخَبيثُ "[1]

## ماناى وشهكان

| | |
|---|---|
| جُرن | وه (جَرين) موضع التمر الذي يجفف فيه . |
| | واته: شوێنی وشك كردنهوهى قهسپ. |
| دابة | گيانلهبهر |
| المحتلم | بالغ |
| فَناوِلني | پێم بده |
| شَعرهُ | مووى |
| فمـــــا يُنجينا | چى دهربازمان دهكات |
| أُجير | دهپارێزرێت |

(1) رواه الطبراني في (المعجم الكبير) بإسناد جيد برقم (٥٤١) واللفظ له والنسائي في عمل اليوم والليلة (٩٦٠) وابن حبان في صحيحه (٧٨٤) وذكره الهيثمي في المجمع برقم (١٧٠١٢) وقال رجاله ثقاة، وصححه الشيخ الالبان في صحيح الترغيب والترهيب برقم (٦٦٢).

| | |
|---|---|
| أَصبحَ | بەیانی کردەوە |
| الخبیث | پیس‌و نەگریس |

## مانای فەرموودەکە

ئوبەییی کوڕی کەعب (ڕەزای خـوای لێبـت) دەڵـیٚ: شـوێنێکم هـەبوو قەسـپم لـیٚ وشـك دەکـردەوە، بـەڵام دەمـدیت قەسـپەکە کـەمی دەکرد،شەوێکیان حەرەسیاتم لیٚ گرت گیانلبەرێکی وەکو گەنجێکی بالغم بینی، سەلامم لیٚ کرد ئەویش سەلامەکەی وەڵام دایەوە، پێی گوت: ئەتۆ چی جنۆکە یا ئینسانی؟ گوتی: جنۆکە، پێی گوت دەستت بێنە دەستی هێنا، جا دەستی وەکو دەستی سەگ بوو وە مووی وەکو مـووی سـەگ بوو، ئوبەی گوتی بەڵیٚ ئـەوە جنۆکەیـە، جنۆکەکـە گـوتی: جنۆکـەکان زانیان کە لەمنیان بەهێزتر تیادا نەبوو (بۆیەمنیان ڕەوانەکردووە) ئوبەی گوتی: بۆچی هاتووی؟ گوتی: پێمان گەیشتووە کەتۆ حـەز لەبەخشـینی مـاڵ دەکـەی، جـا هـاتووین بـۆ ئـەوەی هەنـدێك لەخواردنەکـەت ببـەین، ئوبـەی گـوتی: چـی ڕزگارمـان دەکـات لـەئێوە؟ جنۆکەکـە گـوتی: ئـەو ئایەتەی کەلەسورەتی (بقرة) دا هەیە( الله لا اله الا هو الحي القیوم) هەر یـەکێك ئێـوارە بیخوێنـیٚ دەپـارێزریٚ لەئێمـە تابـەیانی، وەهـەر یـەکێك بیخوێنـیٚ کاتێـك کەبـەیانی دەکاتـەوە دەپـارێزریٚ لەئێمـە تـائێوارە دەکاتەوە جا ئوبەی کاتێك کەبەیانی کردەوە چووە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەم بەسەر هاتەی بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ئەم پـیس ونەگریسـە ڕاستی گوتووە.

## زیكری (٨)

ئەم زیكرە بریتیە لە خوێندنی سورەتی (الإخلاص) و(الفلـق)و (النـاس) سـێ جـار سـێ جـار ئێـواران وەسـێ جـار سـێ جاریش بەیانیان كە ئەم سورەتانەن:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)﴾ الاخلاص: ١ – ٤

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١) مِن شَرِّ مَا خَلَقَ (٢) وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (٣) وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ (٤) وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (٥)﴾ الفلق: ١ - ٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ (١) مَلِكِ النَّاسِ (٢) إِلَٰهِ النَّاسِ (٣) مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ (٤) الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ (٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ (٦)﴾ الناس: ١ - ٦

## بەڵگەی لەسەر زیکری (٨)

عن عبدالله بْنِ خُبَيبٍ(رضي الله عنه) قال: خرجنا في ليلةٍ مَطيرةٍ وظُلمةٍ شديدةٍ نطلبُ رَسولَ اللهِ(ﷺ) يُصَلّي لنا، قال: فأَدْرَكتُهُ فقال:(قل) فلم أقل شيئاً، ثُمَّ قال:(قل) فلم أقُل شيئاً قال:(قل) فقلتُ: ما أَقولُ؟ قال: قل:(قل هو الله أحدٌ)، والمعوِّذَتين حينَ تُمسي و تُصْبحُ ثلاث مرّات تَكفيكَ مِنْ كلِّ شيءٍ). **حسن: رواه أبوداود(٥٠٨٢) والترمذي(٣٥٧٥).**

**واتە: عبدالله كوری خوبەیب(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ لە شەوێكی بارانـاوی زۆر تاریكدا رۆیشتین بە دوای پێغەمبەردا دەگەراین بۆ ئەوەی پێش نوێژیمان بۆ بكات، جا عبدالله دەڵێ بە پێغەمبەر گەیشتم فەرمووی بڵێ، منیش هیچم نەگوت، لە پاشان فەرمووی بڵێ، منیش هیچم نەگوت، فەرمووی بڵێ گوتم چی بڵێم. فەرمووی بڵێ(قل هو الله احد) وە(فلق) و(ناس)یش بخوێنە كاتێك كە ئێوارە دەكەیتەوە وە كاتێكیش كە بەیانی دەكەیتەوە سێ جاران هەموو زیان خراپەیەكت لێ لا دەدەت(تدفع عنك كل سوء).**

## ماناى سورەتى (إخلاص)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١ اللَّهُ الصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌ ۝٤﴾

## ماناى ووشە:

| | | |
|---|---|---|
| قُلْ | : | (ئەى موحەممەد) بلّێ. |
| هُوَ | : | ئەو. |
| أَحَدٌ | : | تاك و تەنيا. |
| الصَّمَدُ | : | جێى نياز و ئومێد. |
| لَمْ يَلِدْ | : | كەسى لێ نەبووە. |
| وَلَمْ يُولَدْ | : | وە لە كەس نەبووە. |
| وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ | : | وە بۆ ئەو نييە. |
| كُفُوًا | : | هاوتا، هاوشێوە. |

## ماناى ئایەتەكان بە كورتى:

(ئەی موحەممەد) بلّێ ئەو خوایەكی تاك وتەنیایە (١) نیاز كراو و داوا لیّ كراوە بۆ جیّ بەجیّ كردنی هەموو پێداویستیەك (٢) كەسی لیّ نەبووە و لەكەس نەبووە (٣) وە هیچ كەس وێنەی خوا نەبووە و نییە (٤).

## ماناى سورەتى (الفلق)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾﴾

## ماناى ووشە:

| | |
|---|---|
| أَعُوذُ | پەنا دەگرم، خۆم دەپارێزم. |
| ٱلْفَلَقِ | بەیانی. |
| غَاسِقٍ | شەو كە زۆر تاریك دەبێت. |
| وَقَبَ | (دخل) هاتە ناو. |
| ٱلنَّفَّٰثَٰتِ | فووكەران. |

| | |
|---|---|
| ٱلۡعُقَـدِ | گرێیەکان. |
| حَاسِدٍ | ئەوەی کە حەسوودی دەبات. |
| حَسَدَ | حەسوودی برد، ئێرەیی برد. |

## ماناى ئایەتەکان بە کورتی:

بڵێ خۆم دەپارێزم بە پەروەردگاری بەیان (١) لە زیانی ئەوەی کە دروستی کردووە (٢) وە لەزیانی تاریکی شەو کاتێ کە دێ (٣) وە لەزیانی فووکەران (جادووگەران) بەگرێیان دا (٤) وە لەزیانی حەسوود کاتێك کە حەسوودی ببات (٥).

## ماناى سورەتی (الناس)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ (١) مَلِكِ ٱلنَّاسِ (٢) إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ (٣) مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ (٤) ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ (٥) مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ (٦)﴾

## ماناى ووشه:

| | |
|---|---|
| قُلۡ | بلێ. |
| أَعُوذُ | پەنا دەگرم، خۆم دەپارێزم. |
| مَلِكِ | پادشا. |
| إِلَـٰهِ | پەرستراو. |
| ٱلۡوَسۡوَاسِ | وەسوەسە پەیداکەر. |
| ٱلۡخَنَّاسِ | زۆر خۆ پەنهان کەر. |
| ٱلۡجِنَّةِ | جنۆکە، ئەجندە. |

## ماناى ووشه به ووشهى ئايهتهكان:

بلێ پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی (١) پادشای خەڵکی (٢) پەرستراوی خەڵکی (٣) لە شەڕو خراپەی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهان کەر (٤) ئەوەی کە وەسوەسە و بیر و خەیاڵی خراپ دەخاتە ناو دڵی خەڵکی (٥) لەجنۆکە و ئادەمیزاد (٦).

## زیكری (٩)

**ئـەم زیكـرەی نـاو ئـەم چـوار چـێوەی خـوارەوە بـەیانیان جارێكو ئێوارانیش جارێك دەگوترێ**

| |
|---|
| أللهـمَّ أنت ربّي لا اله إلاّ أنت خلقتني وأنا عبدكَ وأنا على عَهدِكَ ووعدِكَ ما اسْتَطعت. أعوذ بِكَ مِن شَرِّ ما صنعتُ. أَبوءُ بنعمَتِكَ أبوءُ بَذَنبي فَاغفر لي إنَّهُ لا يغفِرُ الذُّنوبَ إلا أنت) <br><br> **ئـەی خودایـە ئـەتۆ پـەروەردگاری مـنی، هـیچ پەرسـتراوێكی بـە ڕاستی نی یە بێجگە لە تۆ، منت دورست كردووە وە منـیش بەنـدەی تۆم، وە من بە پێ ی توانا لەسەر ئەو پەیمان و بەڵێنەم كە بـە تـۆم داوە، خۆم دەپارێزم بە تۆ لە خراپـە و زیـانی ئـەوەی ئـەنجامم داوە لـە گونـاح، دان دەنـێم بـە نـازو نیعمەتـەكانت، وە دان دەنـێم بـە گوناهەكانم، جا لێم خۆش بە، چـونكە بـە ڕاسـتی جگـە لـە تـۆ هـیچ كەسێك نیە لە گوناهان خۆش بیت.** |

## بەڵگە لەسەر زیكری (٩)

عن أبن بُريدة عن أبيه عن النبيِّ(ﷺ) قال: من قال حينَ يُصبحُ أو حين يُمسي: **واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی: هـەر یـەكێك كاتێـك كە بەیانی دەكاتەوە یا كاتێك كە ئێوارە دەكاتەوە بڵێ:**

أللهـمَّ أنـت ربّي لا الـه إلاّ أنـت خلقتني وأنـا عبـدك وأنـا على عَهـدِكَ ووعدِكَ ما اسْتَطعتُ، أعوذ بِكَ مِن شَرِّ ما صنعتُ، أَبوءُ بنعمَتِكَ أبوءُ بِذَنبي فَاغفر لي إنَّهُ لا يغفِرُ الذُّنوبَ إلا أنـت). فماتَ من يومه أو من ليلتهِ دَخلَ الجنّة[1].

**واته: له ڕۆژەکەی دا بمرێ یا له شەوەکەی دەچێته بەهەشت.**

## زیکری (١٠)

**ئەم زیکرەی ناو ئەم چوارچێوەی خوارەوە بەیانیان یەك جارو ئێوارانیش یەك جار دەگوترێ:**

(اللهـمَّ إني أسـألُكَ العافيـة في الـدنيا والآخـرة، اللهـم إني أَسـأَلُك العَفْـوَ والعافية في ديني ودنياي وأهلي ومالي، اللهم استُرْ عوراتي وآمِنْ روعاتي، أللهم احْفَظني من بينِ يَدَيَّ و مِنْ خَلْفي وعن يَميني وعن شمالي ومِنْ فَوقِي وأعوذُ بِعظَمَتِكَ أَنْ أُغتالَ مِنْ تَحتي).

**واته: ئەی خودایه من داوای بێ وەیت لێ دەکەم له دونیاو دوارۆژ، ئەی خودایه من داوای لێبوردنو بێوەیت لێ دەکـەم بـۆ دیـن و دونیـاو کـەس و کارو ماڵم، ئەی خودایه عەیب و عارم داپۆشه، وه ترسەکانم مەهێڵه، ئـەی خودایه بمپارێزه له پێشمەوەو له دوامەوه، وه له ڕاست و چەپمەوه وه لـه سەرووممەوه، وه خـۆم دەپـارێزم بـه گـەورەیی تـۆ لـەوەی کـه ڕۆ بچـم لـه ژێرمەوه( به ناخی زەوی دا)**

---

(١) صحيح: رواه ابو داود(٥٠٧٥) و هذا لفظهُ والبخاري(٦٣٠٦) عن شداد بن أوس.

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٠)

عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) لم يكن النبيّ(ﷺ) يَدَعُ هؤلاء الكلمات حين يُمسى و حين يُصبح:( اللهمَّ إني اسألُكَ العافيـة في الدنيا والاخرة، اللهم إني أَسألُك العَفْوَ والعافية في ديني ودنياي وأهلي ومالي، اللهم استُرْ عوراتي وآمِنْ روعاتي، أللهم احْفَظني من بينِ يَدَيَّ و مِنْ خَلْفي و عن يَميني وعن شمالي ومِنْ فَوقِي وأعوذُ بِعظَمَتِكَ أَنْ أُغتالَ مِنْ تَحتي ). صحيح:رواه ابوداود((٥٠٧٤)وابن ماجة(٣٨٧١)

## زیکری (١١)

**ئـەم زیکـرەی نـاو ئـەم لاکێشـەیە بـەیانیان سـێ جـارو ئێوارانیش سێ جار دەگوترێ.**

بسم الله الذي لا يَضُرُّ معَ اسمِهِ شيءٌ في الارض ولا في السماء وهو السميع العليم

واتە: بەناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەودا هەرچی لـەئاسمانو لە زەویدایە زەرەرو زیانی نابێت، وە ئەو زۆر بیسەرو زانایە.

## بەڵگە لەسەر زیکری (١١)

عن عثمان بن عفان(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) ما مِن عبدٍ يقولُ في صباحِ كلِّ يومٍ ومساءِ كُلِّ ليلةٍ: بسم الله الذي لا يَضُرُّ مع اسْمِهِ شيءٌ في الارض ولا في السَّماء وهو السَّميعُ العليم، ثلاث مَرات، إلاّ لم يَضُرَّه شيء. حسن صحيح: رواه ابوداود(٥٠٨٨) والترمذي(٣٣٨٨).

**واتە: هەر بەندەیەك(عەبدێك) بەیانی هەموو ڕۆژێك وە ئێوارەی هەموو شەوێك سێ جاران بڵێ:** ( بسم الله الذي لا يَضُرُّ مع اسْمِهِ شيءٌ في الارض ولا في السَّماء وهو السَّميعُ العليم)، **هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنی.**

## زیکری (١٢)

**ئەم زیکرەی ناو ئەم لاکێشەی خوارەوە بەیانیان (١٠٠) جار دەگوترێ ئێوارانیش (١٠٠) جار**

| سبحان الله وبحمده<br><br>**واتە: پاکی بۆ خواو ستایش بۆ وی** |
|---|

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٢)

عن أَبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قالَ حِينَ يُصْبِحُ وحينَ يُمسي: سبحانَ الله وبحمدهِ مِئَةَ مَرَّة لَم يأْتِ أحدٌ يومَ القيامةِ بأفضَلَ مما جاءَ بهِ، إلاّ أحَدٌ قالَ مِثلَ ما قالَ أو زادَ) رواه مسلم(٢٦٩٢).

**سبحان الله وبحمدة: پاكی بۆ خواو ستایش بۆ وی.**

**مانای فەرموودەكە:**

**هـەر یـەكێك كاتێـك كـە بـەیانی دەكاتـەوە وە كـاتێكیش كـە ئێـوارە دەكاتـەوە سـەد جـاران بڵێ(سـبحان الله وبحمـدە) كـەس نـایێ لـە ڕۆژی قیامەت شتێكی لە ئەو باشتری هێنابێ تەنها یەكێك نـەبیت وەكـو ئـەوی گوتبی یا زیاتر.**

**سوود:**

عن جابر(رضي الله عنه) أَنَّ رسول الله (ﷺ): قال:(مَن قال سُبحانَ الله وبحمده في يومٍ مائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خطاياه وإن كانت مِثلَ زَبَدِ البحر).

**رواه البخاري(٦٤٠٥).**

**واتە: هەر یـەكێك لـە ڕۆژێكـا(١٠٠) جـار بڵێ(سـبحان الله وبحمـدە) گوناهەكانی دەسرێنەوە ئەگەر وەكو كەفاوی دەریاش بێت.**

## زیکری (١٣)

**ئەم زیکرەی خوارەوە بەیانیان یەکجار دەگوترێ وەئێوارانیش یەك جار دەگوترێ وەیەك جاریش کاتێك دەچیە ناو جێگای نووستن:**

(أَللهمَّ فاطِرَ السَّماواتِ والأرضِ، عالِمَ الغيبِ والشَّهادةِ، رَبَّ كُلِّ شيءٍ ومَليكَهُ، أشهدُ أن لا إله إلا أنت.أعوذُ بكَ مِن شَرِّ نفسِي و شَرِّ الشيطانِ وشِركِهِ).

**واتە: ئەی خودایە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا، پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوی بە ڕاستی نییە بێجگە لە تۆ، خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەری نەفسم وە لە شەری شەیتان و ئەوەی بانگی بۆ دەکات لە شیرك.**

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٣):

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ أبابكرٍ الصِّدِّيق(رضي الله عنه) قال: يا رسول الله مُرْني بكلماتٍ أقولُهُنَّ إذا أصبحتُ واذا أمسيتُ، قال: قُلْ:(أَللهمَّ فاطِرَ السَّماواتِ والأرضِ ، عالِمِ الغيبِ والشَّهادةِ، رَبَّ كُلِّ شيءٍ ومَليكَهُ، أشهدُ ان لا إله إلا أنت ،أعوذُ بكَ مِن شَرِّ نفسي . وشَرِّ الشيطانِ وشِركِهِ) قالَ: قُلها إذا أصبحتَ، وإذا أمسيتَ، وإذا أخَذتَ مَضْجِعَكَ). صحيح: رواه ابوداود(٥٠٦٧) والترمذي(٣٣٩٢).

**فاطر: داهێنەر.**

وملیكه: أي: مالكه، **یانی: خاوەنی.**

وشِركِهِ: أي ما یدعو الیهِ من الإشراك بالله. **یانی: لەوەی كە بانگی بۆ دەكات لە شەریك پەیدا كردن بۆ خوا.**

## ماناى فەرموودەكە

**ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵێ: ئەبوبەكر(خوای لیّ رازی بێت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێ ووشەم پێ بفەرموو بەیانیان و ئێواران بیلێم: ئەویش فەرمووی: بلێ:**(أَللهمَّ فاطِرَ السَّماوات والأرضِ، عـالِمَ الغیـبِ والشَّـهادةِ، رَبَّ كُـلِّ شـيءٍ ومَلیكـهُ، أشـهدُ أن لا إلـه إلا أنت،أعوذُ بكَ مَن شَرِّ نَفسِي , وشَرِّ الشیطانِ وشِركِهِ).

**واتە: ئـەی خودایـە داهێنـەری ئاسمانـەكان و زەوی، زانـای پـەنهان و ئاشكرا، پەروەردگارو خاوەنی هـەموو شـتێك، شـایەتی دەدەم كـە هـیچ پەرستراوی بە ڕاستی نی یـە بێجگـە لـە تـۆ، خـۆم دەپـارێزم بـە تـۆ لـە شەری نەفسم وە لە شەری شەیتان و ئەوەی بانگی بۆ دەكات لە شیرك. جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە بڵێ كاتێ كە بەیانی دەكەیتەوە، وە كاتێـك كـە ئێـوارە دەكەیتـەوە وە كـاتێكیش كـە دەچـیتە نـاو جێگـای نوستن.**

## زیکری (١٤)

**وەئێوارانیش (١) جار دووبارە ئەم زیکرەی ناو ئەم لاکێشە خوارەوە بەیانیان (١) جار دەکرێ دەکرێتەوە.**

| |
|---|
| يا حيُّ يا قَيُّومِ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ، أصلِحْ لي شَأني كُلَّهُ، ولا تكِلْني إلى نفسي طَرفةَ عَينٍ). |
| **واتە: ئەی (خوای) زیندووی سەرپەرشتیکاری بوونەوەر , بە بەزەیی و رەحمەتت داوای فریاکەوتن دەکەم ، هەموو کاروبارم چاك بکەو بۆ چاو لێکنانێك مەمدەرە دەستی نەفسی خۆم.** |

## بەڵگەی لەسەر زیکری (١٤)

عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) لفاطمة: ما يَمنَعكِ أنْ تقولي اذا أَصبحتِ و اذا أَمسيتِ: يا حيُّ يا قيوم بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ، أصلِحْ لي شَأني كُلَّهُ، ولا تكِلْني إلى نفسي طَرفةَ عَينٍ. رواه النَّسائي والبزار والحاكم وصححه، ووافقه الذهبي.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بە فاتیمەی فەرموو: چی مەنعت دەکات کاتێك کە بەیانی دەکەیتەوە وە کاتێکیش کە ئێوارە دەکەیتەوە بڵێ ی**(يا حيُّ يا قيوم بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ، أصلِحْ لي شَأني كُلَّهُ، ولا تكِلْني إلى نفسي طَرفةَ عَينٍ).

**سوود**:

**ئەم دوعایە دوعایەکی شاملە هەموو خێرو بێرەکانی دونیاو قیامەت دەگرێتەوە، با موسڵمان هەوڵ بدات جگە لەم دوو کاتە لە کاتی تریش ئەم دوعایە بکات.**

## زیکری(١٥)

**ئەم زیکرەی خوارەوە تەنها بەیانیان (٣) جار دووبارە دەکرێتەوە**

| |
|---|
| سُبحانَ اللهِ عددَ خلْقهِ، سبحان الله رِضا نفْسهِ، سبحان الله زِنَةَ عرْشِهِ، سبحانَ الله مِدادَ كَلِماتهِ). |
| **واتە: پاکیو بێ گەردی بۆ خوا بەقەد ژمارەی دروست کراوەکانی، پاکیو بێ گەردی بۆ خوا بەقەد ئەوەندەی خوا خۆی پێی رازی بێت، پاکیو بێ گەردی بۆ خوا بەقەد سەنگی عەرشەکەی، پاکیو بێ گەردی بۆ خوا بەقەد ئەندازەی مەرەکەبی کەلیمەو وشەکانی** |

**تێبینی**:

**ئەم زیکرە لەریوایەتێکی تری (صحیح)ی موسلیم دا بەم شێوەیە هاتووە.** ( سُبحانَ اللهَ وبحمده عدد خلقه، ورضا نفسه، وزنَةَ عرشه، ومِداد كلماتهِ).

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٥):

عـن امِّ المـؤمنينَ جُويريـة بنـتِ الحـارث( رضـي الله عنهـا) أنَّ النبـيَّ (ﷺ) خَرَج مِنْ عندها بُكرةً حينَ صَلّى الصبحَ وهي في مسـجدها، ثُمَّ رَجَـعَ بَعـدَ أن أَضـحى و هِيَ جالِسـةٌ فقـال: مـا زِلـتِ على الحـالِ التي فارقتُـكِ عليهـا؟ قالـت: نعـم، فقـال النبـيُّ (ﷺ) لقـد قُلـتُ بَعْدَكِ أَربَـعَ كَلِماتٍ ثلاثَ مَرّاتٍ، لَوْ وزنَـتْ بما قُلْـتِ مُنـذُ اليومِ لَوَزَنَتْهُنَّ، سبحانَ الله وبحمدهِ عددَ خلقهِ، ورضـا نفسـه، وزنةَ عرشِـهِ ومدادَ كلماتهِ، وفي روايةٍ لَهُ(سُبحانَ اللهَ عدد خلقهِ، سبحان الله رضا نفسهِ، سبحان الله زِنَةَ عرشِهِ، سبحانَ الله مِداد كلماتهِ) (١).

## ماناى ووشه:

١-في مسجدها: موضع صلاتها، شوێنى نوێژ كردنى.

٢- اضحى: دخلَ في وقت الضحى، چووه ناو كاتى چێشتەنگاوەوه.

٢- لوزنتهنّ لساوتهنّ في الاجر والفضل، بەرامبەر دەبن لە پاداشت.

٤- عدد خلقه: بە قەد ژمارەى دورستكراوەكانى خودا.

٥- ورضا نفسهِ: وە ئەوەندەى خودا خۆى پىّ ى رازى بێت.

٦- وزنة عرشه: وە بە قەد سەنگى عەرشى خودا.

٧- ومداد كلماته: وە بە قەد ئەندازەى مەرەكەبى ووشەكانى خوا .

---

(١) رواه مسلم(٢٧٢٦) و(ابوداود(١٥٠٣) والترمذي(٣٥٥٠).

## ماناى فەرموودەكە:

دايكى ئيمانداران جوەيريەى كچى حارث(رەزاى خـواى لـىٚ بێـت) كـە خێزانــى پێغەمبــەر بــووە (ﷺ) دەفــەرمووىٚ: بەيانيــەكى زوو پێغەمبەر (ﷺ) نوێژى بەيانى كردو دەرچـووە دەرەوە، منـيش لـەو كاتەدا لـە شـوێنى نوێژكردنمـدا بـووم، لـە پاشـان لـە چێشـتەنگاودا هاتــەوە، تــا ئـەو كاتــە مـن لـەو شـوێنى خۆمـدا دانيشـتبووم، جـا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: تۆ تا ئێستا لەو بارو حالەتـەداى كـە مـن بــەجێم هێشــتووى لەســەرى؟ گــوتم بــەڵىٚ، جـا پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمووى: من  لە دواى تـۆ چـوار وشـەم گوتـووە سـىٚ جـار، ئەگـەر هەڵبكێشرێن لەگەڵ ئەوەى كە تۆ كردووتـە بـە درێـژيى ئـەو ماوەيـە هەردوولا بەرامبـەر دەوەسـتن(سبحانَ الله وبحمده عددَ خلقهِ. ورِضا نَفْسِه، وزِنَةَ عَرْشِهِ ومِدادَ كَلِماته) وە لـە ريوايەتـەكى ترى(مسلم) بـەم شـێوەيە هــاتووە :(سُبحانَ اللَهَ عدد خلقـهِ، سبحان الله رِضا نفسـهِ، سبحان الله زِنَةَ عرشِهِ، سبحانَ الله مِداد كلماتهِ).

## زیکری (١٦)

**ئەم زیکرەی لای خوارەوە تەنها ئێواران (٣) جار دەگوترێ**

أعوذُ بكلماتِ اللهِ التّامّاتِ مِنْ شَرّ ما خلق .

**واتە: خۆم دەپارێزم بەوشەی تەواوەکانی خوا (کە قورئانە) لەزیانی ئەوەی کە دروستی کردووە**

## بەڵگەی لەسەر زیکری (١٦):

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ (ﷺ) قال: مَنْ قال حينَ يُمسي ثلاثَ مراتٍ: أعوذُ بِكلماتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ. لَمْ يَضُرَّهُ حُمَةٌ تلكَ الليلة. **صحيح رواه النسائي(٥٩٠) في(عمل اليوم والليلة) والترمذي (٣٦٠٤).**

**واتە: هەر یەکێك کە ئێوارە دەکاتەوە سێ جاران بڵێ:** أعوذُ بِكلِماتِ اللهِ التَّاماتِ مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ.

**لەم شەوەدا هیچ زەهرێك زەرەری پێ ناگەیەنێ. (وەك زەهری مارو دوپشك و ئەم جۆرانە).**

## مانای وشەکان

| | |
|---|---|
| اعوذُ | **خۆم دەپارێزم، پەنا دەگرم** |
| بكلمات الله | **بە وشەکانی خوا، ئیمام نەوەوی دەڵێ: واتە قورئان، (ابن حجر) دەڵێ: واتە هەموو وشەکانی خوا بەقورئانو غەیری قورئانیشەوە** |
| التمامات | **تەواوەکان واتە: بێ کەمو کوڕیو بێ عەیب** |
| حُمة | **هەموو زیندەوەرێك کە زەهری هەبێت وەك: دووپشكو مارو لەم جۆرانە** |

**سوود**:

١- ئـەم فەرموودەيـە باسـی خۆپاراسـتنی تيادايـە بەكـەلامی خـوا كەواتـە كـەلامی خـوا سـيفەتی خوايـە، مـەخلوق دروسـت كـراو نييـە، وەئەگەر دروست كراو بوايە نەدەبا خۆی پێ بپارسترابايە.

٢- ئەم زيكرە يەك جاريش دەگوترێ لەو كاتەی دەچيە جێگايەك

عن خَوْلَةَ بنتِ حكيم قالت: سمعتُ رسول الله (ﷺ) ، يقول: (مَنْ نزلَ مَنزلاً ثُمَّ قال:(أعوذ بكلمات الله التامّاتِ مِن شرِّ ما خلقَ) لم يَضُرَّهُ شيء حتى يرتحِلَ مِن منزلِهِ ذلك) رواه مسلم(٢٧٠٨).

واتە: هەر يەكێك چووە جێگايەكەوە لە پاشان بڵێ: ( اعوذ بكلمات الله التامّات من شرِّ ما خلق) هيچ شتێك زيانی پێ ناگەيەنی تا لەم جێگايە دەڕوات.

## زيكری (١٧)

**بەيانيان (١) جار ئەم زيكرەی خوارەوە دەكرێ**

رَضيتُ بِاللهِ رَبًا، وبِالإسلام ديناً وبِمحمدٍ نبياً.

**واتە: رازيم بەوەی كەخوا پەروەردگارم بێت، وەبەوەی ئيسلام ئايينم بێت، وە بە موحەممەد پێغەمبەرم بێت**

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٧):

عَـنِ الْمُنَيْـذِرِ صَـاحِبِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ، وَكَـانَ يَنْـزِلُ بِإفْرِيقِيَّةَ ، قَالَ : سمعت رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( مَنْ قَالَ اذا أَصْبحَ : رَضِـيتُ بِاللَّـهِ رَبًّـا ، وبالأسـلام دينـا وَبِمُحَمَّـدٍ نَبِيًّـا ، فَأَنَـا الزَّعِيمُ لآخُـذَنَّ بِيَـدِهِ حتى أدْخلَـهُ الْجَنَّـةَ ) قـال المنـذري فـي الترغيـب والترهيــب : رواه الطـبراني باسـناد جيـد وانظـر سلسـلة الصـحيحة مجلـد (٦)رقـم (٢٦٨٦).

**واتە: مونەیزیر -ڕەزای خوای لێ بێت- ئەسحابەی پێغەمبەر (ﷺ) کە خەڵکی قارڕەی ئەفریقیا بوو (ئێستاش قەبرەکەی لە (طرابلس) لەلیبیایە) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) دەیفەرموو: هەر یەکێك کاتێك کەبەیانی کردەوە بڵێ:** (رَضيتُ بِاللهِ رَبّا، وبِالإسلام ديناً وبِمحمدٍ نبياً).

**ئەوا کەفیلی ئەوە دەکەم کە دەستی بگرم تاوەکو دەیخەمە بەهەشتەوە.**

## زیکری (١٨):

ئـەم زیکـرەی لای خـوارەوە بـەیانیان (١) جـارو ئێـوارانیش (١) جـار دەگوترێ، بەڵام لەئی ئێواران لەجیاتی (ماصبح) دەڵێ (ما أمسى).

| اللهمَ ما أَصْبحَ بي مِن نِعمةٍ فَمِنكَ ، وحدكَ لا شريكَ لكَ ، فَلكَ الحمدُ ولكَ الشكر.<br><br>**واتە: ئەی خودایە من هەر نازو نعمەتێکم هەیە ئـەوە لەلایـەن تۆوەیـە کـەتاکیو هـیچ شـەریکێکت نییـە، سـوپاسو سـتایش هـەر بـۆ تۆیە،وەشوکریش هەر بۆ تۆیە.** |
|---|

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٨):

عن عبدِالله بنِ غنَّام أنَّ رسولَ الله صلى الله عليه وسلمِ قال :" من قال حين يُصبح اللهم ما أصبحَ بي مِن نِعمةٍ فَمنكَ وحدكَ لا شريك لك ، فلك الحمدُ ، ولك الشكرُ ، فقد أدَّى شُكرَ يومه ، ومَن قال مثل ذلك حين يُمسي فقد أدَّى شُكر لَيْلَتهِ" ** **رواه أبو داود (٥٠٧٣) وهذا لفظه " ورواه ابن حبان في صحيحه (٢٣٦٣)" وحسنه العلامة ابن باز رحمه الله كاملاً في التحفة . وحسنه الحافظ ابن حجر في شرح الاذكار وجود اسناده النووي وحسنه الشيخ الارنؤوط ***

## ماناى فەرموودەکە

**هەر یەکێك کاتێك کەبەیانی دەکاتەوە بڵێ : (اللهم ما أصبح بي من نعمةٍ فَمنك وحدك لا شريك لك ، فلك الحمدُ ، ولك الشكرْ) .**

**ئەوە ئـەو رۆژە شـوکرانە بـژێری جێبـەجێ کـردووە ، وەهەریـەکێکیش کاتێك کە ئێوارە دەکاتەوە وەکو ئەمە بڵـێ ئـەوە شـوکرانە بـژێری ئـەم شەوەشی جێبەجێ کردووە.**

## زیکری (١٩)

**ئەم زیکرەی لە ناو ئەم لاکێشەی خوارەوە دایە بەیانیان یەك جارو ئێوارانیش یەك جار دەگوترێ**

| |
|---|
| لا إله الا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير<br>**واتە: هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نیە بێجگە لەخوا، تاکەو هیچ شەریکێکی نیە، هەموو دەسەڵاتو سوپاسو ستایشێك بۆ ئەوە،وە ئەو خاوەن توانایە بەسەر هەموو شتێکدا .** |

## بەڵگە لەسەر زیکری (١٩)

عن أبي عَيَّاش أنَّ رسول الله (ﷺ) قال:(مَنْ قالَ إذا أَصبَحَ: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، كانَ لَهُ عِدلُ رَقَبَةٍ من ولَدِ اسماعيل، وكُتبَ له عشر حسنات، و حُطَّ عنهُ عَشرُ سيِّئاتٍ، ورُفعَ له عشرُ درجاتٍ، وكانَ في حِرزٍ مِنَ الشيطانِ حتى يُمسيَ، وإن قالها إذا أَمسى كانَ لَهُ مثل ذلك حتى يُصبحَ).

قال في حديث حَمّاد: فرأى رجلٌ رسول الله (ﷺ) فيما يرى النائِمُ فقال: يا رسول الله إنَّ أبا عياش يُحدِّثُ عنك بكذا وكذا قال(صدقَ أَبو عياش). **صحيح: رواه ابوداود(٥٠٧٧) والترمذي(٣٨٦٧).**

واتە: هەر یەکێك کاتێ کە بەیانی دەکاتەوە بڵێ (لا الە الا اللە وحدە لا شریك لە، لە الملك ولە الحمد وهو علی کل شيءٍ قدیر). بە ئەندازەی ئازاد کردنی بەندەیەك لە نەوەکانی(اسماعیل) پاداشتی بۆ دەنوسرێ، وە دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە دە خراپەی لەسەر لا دەبرێ، وە دە پلەی بەرز دەکرێتەوە، وە پارێزراو دەبێ لە شەیتان تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە، وە ئەگەر کاتێکیش کە ئێوارە دەکاتەوە بیڵێ ئەو خێرو بێرانەی بۆ هەیە تاوەکو بەیانی دەکاتەوە، لە ریوایەتی(حماد) دا دەڵێ: پیاوێك پێغەمبەری (ﷺ) لە خەودا بینی، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو عیاش فەرموودەیەکی ئاواو ئاوا لە تۆ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەبو عیاش راست دەکات.

## زیکری (٢٠)

**ئەم زیکرەی کە لەناو ئەم چوار چێوە دایە (١٠) جار بەیانیان و (١٠) جاریش ئێواران دەگوترێ:**

> لا إلە الا اللە وحدە لاشریك لە لە الملك ولە الحمد وهو علی کل شيء قدیر
>
> **واتە: هیچ پەرستراوێکی بەراستی نیە بێجگە لەخوا، تاکەو هیچ شەریکێکی نیە، هەموو دەسەڵاتو سوپاسو ستایشێك بۆ ئەوە،وە ئەو خاوەن توانایە بەسەر هەموو شتێکا**

## بەڵگە لەسەر زیکری (٢٠)

عن أبي أيوب الأنصاري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) : مَنْ قال غُدوةً لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير. عشر مرّات كتبَ الله له عشرَ حسنات، ومحا عنه عشر سيِّئات وكُنَّ لَهُ بِقَدر عَشرِ رِقابٍ، وأجارهُ الله من الشيطان، ومن قالها عشيةً مثل ذلك)(١).

غُدوةً: بەیانی(ما بین صلاة الغداة وطلوع الشمس) یانی: نێوانی نوێژی بەیانی و ڕۆژهەڵاتن.

عَشيةً: نێوانی نوێژی(مغرب) و عشا، زوهری دەڵێ(العشيُّ) ما بين زوال الشمس وغروبها، ئەم فەرموودەیە لە ڕیوایەتی(امام احمد هاتووە دەڵێ: فإن قالها حين يمسي).

## مانای فەرموودەکە

واتە هەر یەکێك لە کاتی بەیانیدا دە جاران بڵێ: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير. خوا دە چاکەی لە بۆ دەنوسی وە دە خراپەی لێ دەسرێتەوە وە بۆی دەبنە مایەی پاداشتێك بە ئەندازەی ئازاد کردنی دە کۆیلە وە خوا دەیپارێزی لە شەیتان، وە هەر یەکێکیش کاتی ئێوارەکەش ئەم دە جارە بڵێ هەمان ئەو چاکانەی بۆ هەیە.

---

(١) رواه النسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٢٤) وقال الألباني في(سلسلة الصحيحة رقم(١١٣): وهذا إسناد صحيح رجاله ثقات رجال مسلم غير قران هذا وهو ثقة. وانظر(صحيح الترغيب والترهيب: ١/٢٧٢)

## زیکری (٢١)

**ئەم زیکرەی ناو ئەم لاکێشەی خوارەوە تەنها بەیانیان تا ئێوارە(١٠٠) جار دەگوترێ**

| لا إله الا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير<br><br>**واتە: هیچ پەرستراوێکی بەراستی نیە بێجگە لەخوا، تاکەو هیچ شەریکێکی نیە، هەموو دەسەڵاتو سوپاسو ستایشێك بۆ ئەوە،وە ئەو خاوەن توانایە بەسەر هەموو شتێکا** |
|---|

## بەڵگە لەسەر زیکری (٢١)

عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله (ﷺ) قال: من قالَ لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، في يومٍ مِئَةَ مَرَّةٍ كانت لَهُ عَدلَ عشرِ رِقابٍ، وكُتبتْ لَهُ مِئةُ حَسنةٍ، ومُحيت عنهُ مِئةُ سَيِّئةٍ، وكانت لَهُ حِرزاً من الشيطانِ يومَهُ ذلكَ حتى يُمسيَ، ولَمْ يأتِ أحَدٌ بأفضَلَ مِمّا جاءَ بِهِ، إلاّ أحَدٌ عَمِلَ أكثَرَ مِنْ ذلك. رواه البخاري(٣٢٩٣) ومسلم(٢٦٩١).

واتە: هەر یەکێك لە ڕۆژێکا(١٠٠) جاران بڵێ(لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير) بە قەد ئازاد کردنی دە بەندە پاداشتی بۆ دەنوسرێ، وە(١٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە(١٠٠) خراپەی لێ دەسڕێتەوە، وە بۆی دەبنە پارێزەرێك لە شەیتان ئەو ڕۆژەی تا وەکو ئێوارە، وە هیچ کەسێك نایێ(لە قیامەت) کارێکی لەو باشتری هێنا بێت مەگەر یەکێك لە ئەو زیاتری کردبێت.

**سوود**:

١-ئەم زیکرە تەنها بەیانیان تا ئێوارە سەد جار دەگوترێ موسڵمان دەتوانێ کە بانگی بەیانیدا هەر لە ڕێی چوونە مزگەوت و پێش نوێژی بەیانی ئەم زیکرە بکات .

٢- ئەم سێ زیکرەی ڕابرد هەرسێکیان یەك جۆرن بەڵام یەکێکیان (١) جار دەگوترێ یەکێکیان (١٠) جار دەگوترێ یەکێکیان تەنها بەیانیان تا ئێوارە (١٠٠) جار دەگوترێ، جا تۆ دەتوانی هەرسێکیان بکەی یادوانیان بکەی یا یەکێکیان بڵێی.

٣- ئەم زیکرەیان کە گوتمان بەیانیان (١٠٠) جار دەگوترێ، ئیمام نەوەوی دەڵێ ڕووکەشی فەرموودەکە وایە هەریەکێك ئەم زیکرە بکات لەڕۆژکەیدا جا هەمووی لەسەر یەك بکات یا بە پچر پچڕی بیکات هەندێکی لەسەرەتای ڕۆژەوە بکات وەهەندێکی لەکۆتاییەکەی بکات ئەوە پادەشتەکەی بۆ دەنوسرێ بەڵام دەڵێ باشتر وایە هەمووی لەسەرەتای ڕۆژەوە بکرێ لەسەر یەك بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژەکە بپارێزرێ لەشەیتان.

## زیکری٢٢):

**(١٠٠) جار زیکری (استغفرالله) گوتن تەنها لەبەیانیاندا**

| |
|---|
| أستغفرالله (١٠٠) جار تەنها لەبەیانیاندا<br>**واتە: داوای لیّ خۆشبوون دەکەم لەخوا** |

## بەڵگە لەسەر زیکری (٢٢)

عن أبي بُردةَ بن أبي موسى، عن ابيه قال: جاء رسول الله (ﷺ) ، ونحن جلوسٌ فقال: ما أَصْبحتُ غداةً قطُّ إلّا اسْتغْفرتُ الله فيها مِئةَ مرّةٍ. **حديث صحيح: رواه الطبراني،انظر: صحيح الجامع (٥٥٣٤).**

**واتە: باوکی بوردە دەڵیّ کە باوکی گوتوویەتی : پیّغەمبەر (ﷺ) ، هاتە لامان لەکاتیّکدا کە ئیّمە دانیشتبووین فەرمووی: قەت هیچ بەیانیەکم نەکرۆدتەوە ئیللا (١٠٠) جاران داوای لیّخۆش بوونم کردووە لەخوا.**

## زیکری (٢٣)

**ئەم زیکرەی خوارەوە بەیانیان (٣) جارو ئێوارانیش (٣) جار دەگوترێ.**

اللّهُمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي ، اللّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي ، اللّهُمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي ، لا إِلَهَ إلا أَنْتَ ، اللّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ ، اللّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، لا إِلَهَ إلا أَنْتَ

**واتە: ئەی خودایە جەستەم سەلامەت بکەی، ئەی خودایە بیستنم سەلامەت بکەی، ئەی خودایە بینینم سەلامەت بکەی، هیچ پەرستراوێکی بەراستی نییە بێجگە لەتۆ، ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لەکوفرو لە هەژاری ، ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لەعەزابی قەبر، هیچ پەراستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە تۆ .**

## بەڵگە لەسەر زیکری (٢٣)

عن عبدِ الرحمن بن أبي بَكرةَ أنهُ قال لأبيه : يا أبتِ إني أسْمَعُكَ تَدعُو كلَّ غداةٍ أَللهمَّ عافِني في بَدني أَللهمَّ عافِني في سمعي أَللهم عافني في بصري لا إله إلا أنت تُعيدها ثلاثاً حين تُصبحُ , وثلاثاً حين تُمسي فقال إني سمعت رسولَ الله صلى الله عليه وسلم يدعو بِهنَّ فأنا أُحِبُّ أنْ أَسْتَنَّ بِسُنَّتِه قال عباس فيه وتَقولُ أَللهمَّ إنّي أَعوذُ بكَ من الكُفر والفَقر أَللهم إني أعوذُ بِكَ من عذاب القبر لا إله إلا أنتَ تُعيدها ثلاثا حين تُصبحُ وثلاثا حين تُمسي فَتدعو بِهنَّ فَأُحِبُّ أن أسْتن بِسُنَّته

** رواه ابوداود (٥٠٩٠) وقال الشيخ الألباني : حسن الإسناد.

واته: (عبدالرحمن) بەباوكی ووت واته بە(أبوبكرة)ئەی باوكی خۆم مـن هەموو بەیانیەك‌و هەموو ئێوارەیەك لەتۆ دەبیستم (٣) جار (٣)جار ئەم دوعایـه دەكـەی (اللَّهُـمَّ عَـافِنِي فِـي بَـدَنِي ، اللَّهُـمَّ عَـافِنِي فِـي سَـمْعِي ، اللَّهُـمَّ عَـافِنِي فِـي بَصَـرِي ، لا إِلَـهَ إِلا أَنْـتَ ، اللَّهُـمَّ إِنِّـي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ).

جـا (ابوبكرة) فـەرموی: مـن گـوێم لەپێغەمبـەری خـوا بـووە ئـەم دوعایانەی دەكرد، منیش پێم خۆشە وەكو ئەو بكەم.

## زیكری (٢٤)

**ئـەم زیكـرەی خـوارەوە بـەیانیان(٧) جـارو ئێـوارانیش (٧) جاری تر دووبارە دەكرێتەوە.**

حسبي اللهُ لا اله الا هو عليه توكلتُ وهو رب العرش العظيم.

واتـــە: خـــوام بەســـە (بـــۆ هـــەموو كـــارو فـــەرمانێكم) كـــەهیچ پەرستراوێكی بەڕاستی نییە بێجگە لەو،تـەنها پشـت بـەو دەبەسـتم، وەئەویش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

## بەڵگەی لەسەر زیکری (٢٤)

عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: (من قال إذا أصبح وإذا أمسى: حسبي الله لا إله إلا هو عليه توكلت وهو رب العرش العظيم سبع مرات كفاه الله ما أهمه؛ صادقاً كان بها أو كاذباً!) ].رواه ابو داود (٥٠٨١) وصححه الالباني موقوفا في السلسلة الضعيفة(٥٢٨٦) لكن استنكر الجملة الاخيرة.

واتە: (ابو الدراء) دەڵێ: هەر یەکێك کاتێك کە بەیانی کردەوە وەکاتێکیش کە ئێوارەی کردەوە(٧) جاران بڵێ: (حسبی اللهُ لا الە الا هو علیە توکلتُ وهو رب العرش العظیم).

ئەوە خوا هەموو ئاواتێکی دێنێتە دی، جا بەڕاستی گوتبێتی، یا لەوکاتە کەگوتوویەتی بەدڵ ئامادەی نەبووبێت.

**تێبینی**: ئەم فەرموودەیە بە مەوقوفی تا (أبو الدرداء) فەرموودەیەکی (صحیح)ە

(موقوف) واتە (ابو الدرداء) نالێ پێغەمبەر دەفەرمووێ: هەر چەندە لە شوێنی تر وا دەڵێ بەلام فەرموودەکە (صحیح) نیە ، جا زانایان دەڵێن ئەم فەرموودەیە حوکمی (مرفوع)ی هەیە چونکە ناکرێ )(أبو الدرداء)ئەم شتانە هەر لەخۆوە بڵێ.

وەئەم بەشەی فەرموودەکەش کە دەڵێ (صادقا كان بها أو كاذبا) ئەگەر ئەم بەشەی فەرموودەکە ساغ بێتەوە کەفەرموودەی پێغەمبەرە) (ﷺ) ، ئەوە ئی وا هەیە لەزانایان دەڵێ: (او کاذباً) واتە ئەو کاتەی کە دەیڵێ دڵی لەلای نیە.

## زیكری (٢٥)

**ئەم چوار زیكرانەی خوارەوە هەر یەكەو (١٠٠) جار بەیانیان‌و (١٠٠) جارانیش ئێواران دەگووترێ:**

١-سبحان الله : ((١٠٠) جار بەیانیان (١٠٠) جار ئێواران).

**واتە: پاكی‌و بێ گەردی بۆ خوا**

٢- الحمد لله : (١٠٠) جار بەیانیان (١٠٠) جار ئێواران)

**واتە: هەموو سوپاس‌و ستایشێك بۆ خوا**

٣- الله اكبر : (١٠٠) جار بەیانیان (١٠٠) جار ئێواران)

**واتە: خوا لەهەموو كەسێك‌و لە هەموو شتێك گەورەترە.**

٤- لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير : (١٠٠) جار بەیانیان (١٠٠) جاریش ئێواران.

**واتە: هیچ پەستراوێكی بەڕاستی نییە بێجگە لەخوا، تاكەو هیچ شەریكێكی نییە، هەرچی دەستەڵات هەیە بۆ ئەوە، وەهەرچی سوپاس‌و ستایشیش هەیە بۆ ئەوە، وەئەو بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە.**

## بەڵگە لەسەر زیكری (٢٥)

عن عَمْرِو بن شُعيبٍ، عن أبيه، عن جَدِّه، قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " مَن قال: سبحان الله مِائَةَ مرَّةٍ قبل طُلوعِ الشَّمسِ

وقبلَ غُروبها كان أفضلُ من مِائَةِ بَدَنةٍ، ومن قال: الحمد لله مِائةَ مَرَّة قبل طُلوعِ الشمس، وقبل غُروبها كان أفضلُ مِن مِائةِ فَرسٍ يُحملُ عليها، ومن قال: الله أكبر مِائَة مَرةٍ قبل طُلوعِ الشمس وقبل غُروبها، كان أفضلُ مِن عِتقِ مِائةِ رَقبةٍ، ومن قال: لا إله إلا الله، وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير مائة مرَّة قبل طُلوع الشمس وقبل غُروبها، لم يجئْ يومَ القيامة أحدٌ بِعملٍ أفضلَ مِن عَملهِ إلا مَن قالَ قوْلَهُ أوْ زادَ **رواه النسائي في عمل اليوم والليلة (٨٢١)وحسنه الالباني.

## ماناى فه‌رمووده‌كه

هه‌ر يه‌كێك (١٠٠) جاران بڵێ (سبحان الله) پێش رۆژهه‌ڵاتو پێش رۆژ ئاوابوون، باشتره له‌وه‌ی كه‌(١٠٠) ووشتری قه‌ڵه‌و بكه‌یه‌ خێر وه‌ هه‌ر یه‌كێك (١٠٠) جاران بڵێ (الحمد لله) پێش رۆژهه‌ڵاتو پێش رۆژ ئاوابوون باشتره له‌ (١٠٠) ئه‌سپو ماینی ئاماده‌كراو بۆ جیهاد كردن له‌رێگای خوا،وه‌هه‌ریه‌كێك (١٠٠) جاران بڵێ (الله اكبر) پێش رۆژهه‌ڵاتو پێش رۆژئاوابوون، ئه‌وه‌ باشتره‌ له‌ئازاد كردنی (١٠٠) كۆیله‌ ، وه‌هه‌ریه‌كێك (١٠٠) جاران بڵێ (لا اله الا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير).پێش رۆژ هه‌ڵاتو پێش رۆژئاوابوون، ئه‌وه‌ هیچ كه‌سێ نایێ له‌قیامه‌ت كرده‌وه‌یه‌كی باشتری له‌كرده‌وه‌ی ئه‌و هێنابێت، مه‌گه‌ر یه‌كێ: وه‌كو ئه‌وی گوتبێ یازیاتری گوتبێ.

# زیكری له خەو هەستان

١- عن حُذيفةَ قال: كان النبيُّ(ﷺ) اذا نام قالَ: (أللهمّ بِاسمكَ أحيا وأموت، واذا اسْتيقظَ قالَ: الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا و إليه النُّشور). رواه البخاري(٦٣١٤) و مسلم(٢٧١١) وأبوداود(٥٠٤٩).

**واتــه: حوزەیفــه دەڵــێ: پێغەمبــەر(ﷺ) ئەگــەر خــەوتبا دەیفەرموو**(أَللهمّ بِاسْمِكَ أَحْيا وأَمُوت) **واتە: ئەی خودایە بە ناوی تـۆ دەژیـمو دەمـرم، وە ئەگـەر خەبـەری بایـەوە دەیفـەرموو**(ألحمد لله الـذي أحْيانـا بعـدَ مـا أماتَنـا وإليـه النُّشـور) **واتــە: هــەموو ســوپاس ستایشێك بۆ ئەو خوایەی كە زینـدووی كردوینـەوە دوای ئـەوەی كـە ئێمەی مراندبوو، وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە.**

٢- عن أبي هريرة عن النبي (ﷺ) قال: إذا اسْتيقظَ أَحدُكم فَلْيَقُلْ، الحمدُ لله الذي ردَّ عَلَيَّ رُوحي، وعافاني في جَسدي، وأذِنَ لي بِذِكْرِهِ، **حسن : رواه الترمذي (٣٤٠١).**

**واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی: كاتێـك یـەكێك لـە ئێـوە لـە خـەو هەسـتا بـا بڵـێ:** (الحمدُ لله الذي ردَّ عَلَيَّ رُوحي، وعافاني في جَسدي، وأذِنَ لي بِذِكْرِهِ) **واتە: هـەموو سـوپاس و ستایشـێك بـۆ ئـەو خوایـەی كـە گیـان و ڕۆحـی بـۆ گەڕاندمـەوە، وە جەستەمی سەلامەت كرد، وە ئیزنی دام كە یادی بكەم .**

## زیكری جل و بەرگ(اللباس):

١-عن أنس قال: قالَ رسول الله(ﷺ): سِترُ ما بينَ أَعينِ الجِنِّ وعوراتِ بنى آدم إذا وضَعَ أحَدَهُم ثوبَهُ أنْ يَقولَ: بِسْمِ اللهِ. صحيح: انظر(صحيح الجامع: ٣٦١٠).

**واتە: پەردەی نێوان چاوی جنۆکەکان و عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە کە کاتیٚ یەکێکیان پۆشاکی لەبەر کردەوە بلّیٚ:( بسم الله ).**

٢- عن ابي هريرة قال: قالَ رسول الله(ﷺ) إذا لَبِستم وإِذا توضّأْتم فابْدءوا بأيامِنِكُم. صحيح: رواه ابوداود(٤١٤١).

**واتە: ئەگەر شتێکتان لەبەر کرد، وە ئەگەر دەست نوێژتان شۆرد بە لای راستەتان دەست پیٚ بکەن، کەواتە: کراس و قەمسەڵەو کورتەك و فانیلەو شەرواڵ و پانتۆل و بێجامە و لەم جۆرانە بە دەستی راست و پیٚ ی راست دەست پیٚ دەکەی.**

٣- عن معاذ بن انس عن ابيه أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: من لَبسَ ثوباً فقالَ: الحمدلله الذي كَساني هذا الثوبَ ورَزَقَنيهِ مِن غيرِ حَولٍ مِنّي ولا قُوَّة غُفر لَهُ ما تقَدَمَّ مِن ذنبِهِ وما تأخَّرَ. **رواه ابو داود(٤٠٢٣) قال الألباني حسن دون زيادة(وما تأخر).**

**واتە: هەر یەکێك پۆشاکێك لەبەر بکات جا بلّیٚ:**(الحمد لله الذي كساني هذا الثوب ورزقنيه من غير حَولٍ منّي ولا قوة) **خوا لە گوناهەکانی پێشوو پاشوی خۆش دەبێت.**

### سوود:

**١-سوننەتە ئەو کەسەی جل و بەرگی نویٚ لەبەر دەکات بلّیٚ(** اللهم لك الحمد أنت كَسَوْتَنيهِ، أسألُكَ من خَيرهِ وخير ما صُنِعَ لَهُ، وأعوذ بِكَ من شَرِّهِ وشَرِّ ما صُنِعَ لَهُ). صحيح: رواه ابوداود(٤٠٢٠).

٤- عن ابي سعيدٍ الخدريّ قال: قال رسول الله(ﷺ): إزرةُ المُسلمِ الى نِصْفِ السَّاق، ولا حَرَجَ(أو لا جُناحَ) فيما بينهُ وبَين الْكَعْبين، فما كانَ أسفلَ من الْكَعبينِ فهو في النار، ومنْ جَرَّ إزارهُ بَطراً لم يَنظُرِ اللهُ إليهِ. صحيح الأسناد: رواه ابوداود(٤٠٩٢).

واته: جل و بەرگی موسڵمان تا نیوەی لاقە وە گوناح نی یە ئەگەر جل و بەرگەکە لە نێوانی نیوەی قاچ و گۆزینگەکان بن، وە ئەوەش کە لە خوار گوزینگەکانە ئەوە لە ئاگرە، وە ئەو کەسەش کە جلەکەی شۆر دەکا لەبەر خۆ بەگەورە زانین ئەوە خوا تەماشای ناکات.

**سوود**:

عثيمين(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) درێژی کراسی دابەش کردووە بۆ چوار بەش:

١-السُّنَّة: کە هەتا نیوەی لاقە.

٢- الرُّخْصة: ئەوەیە کە لە نیوەی لاق شۆربێتەوە تا گۆزینگ ئەمە جائیزە.

٣- كبيرة من كبائر الذنوب: ئەوەیە لە گۆزینگ زیاتر شۆر بێتەوە بەڵام لەبەر خۆ بە گەورە زانین نەبێت، ئەمە لە گوناهە گەورەکانە.

٤- ئەوەیە کە لەبەر خۆ بەگەورە زانین جلەکانی شۆر دەکاتەوە، گوناهەکەی لەوەی پێشوو گەورە ترە[(١)].

کەواتە کەسێك بۆ جوانی یا بەبێ بیر لێ کردنەوە جلەکانی لە گۆزینگی زیاتر شۆر دەکاتەوە لەبەر خۆ بەگەورە زانینی نییە ئەوەش تووشی گوناهە گەورەکان دەبێت.

---

(١) رياض الصالحين، بشرح عثيمين.

# چۆن پێڵاو لە پێ دەکەی:

١-عن أبي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إذا انتعلَ أحَدُكم فَلْيبدأْ باليُمنى، وإذا خَلَعَ فَلْيبدأْ بالشّمال، ولْيُنْعِلهما جميعاً أو لِيَخلَعْهُما جمعيا. رواه البخاري(٥٨٥٦) ومسلم(٢٠٩٧).

(إِنْتَعَلَ): **پێلاوی لە پێ کرد(النَّعل) واتە:الحِذاء، یانی: پێڵاو.**

**<u>واتە:</u> ئەگەر یەکێك لە ئێوە پێڵاو و نەعلی لە پێ کرد با بەراستە دەست پێ بکات، وە ئەگەر لە پێی کردەوە با بەچەپە دەست پێ بکات، وە با هەردووکیان پێکەوە لەپێ بکات، یا با هەردووکیان پێکەوە لەپێ بکاتەوە.**

**سوود: ١-سووننەتە بەپێی راستە پێڵاو و نەعل لە پێ بکەی، وە بەپێی چەپە لە پێی بکەیتەوە.**

**٢- ئاگادار بە لە جێبەجێ کردنی ئەم سوننەتە ئاسانانە کەمتەرخەمی مەکە**

٢- عن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : (لَا يَمْشِ أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا) **رواه مسلم(٢٠٩٧)**

**واتە:با یەکێك لە ئێوە نەروا بە یەك تاکە نەعل ، هەردووکیان لە پێ بکات ، یا هەردووکیان لە پێ بکاتەوە .**

**سوود : ١-مەکروهە موسلمان بەیەك تاکە پێڵاو بڕوا بەرێوە .**

**٢- شەیتان بە یەك تاك نەعل دەروا بە رێوە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:** (إنَّ الشيطانَ يَمْشي في النعل الواحدة) **أنظر السلسلة الصحيحة(٦١٦) ، واتە :بێ گومان شەیتان بە یەك تاك نەعل دەروا**

## تارەت گرتن و چوونە سەر ئاو:

١-عن عليّ أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: سترُ ما بين أَعْيُنِ الجِنِّ وعَوراتِ بَني آدمَ إذا دَخَلَ أحَدُكُم الخلاءَ أن يقولَ: ( **بسم الله**).
صحيح: رواه الترمذي(٦٠٦) وابن ماجه(٢٩٧).

**واتە: پەردەی نێوان جنۆکەو عەورەتی ئادەمیزادکان کاتێك کە یەکێکتان دەچێتە ئاو دەست ئەوەیە کە بڵێ(بسم الله) واتە: بە ناوی خوا.**

**کەواتە ئەگەر دەتەوێ جن و شەیتانەکان عەورەتت نەبینن کاتێك چویتە ئاودەست بڵێ:(بسم الله)**

٢- عن أنس قالَ: كانَ النبيُّ (ﷺ) اذا دخلَ الخلاءَ قال: أللهمَّ إنّي أعوذُ بِكَ من الخُبْثِ والخَبائِثِ. رواه البخاري(١٤٢) ومسلم(٣٧٥).

**١-الخُبث: کۆیە، تاکەکەی(خبيث)ە، واتە: شەیتانی نێرە. وە ئەم ووشەیە بە(الخُبُث)یش دەخوێندرێتەوە واتە بە بۆر(ضمة) لەسەر پیتی بائەکە.**

**٢- الخبائث: کۆیە، تاکەکەی(خبيثة)یە، واتە: شەیتانی مێ یە.**

**واتە: ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك چووبا سەر پێشاو دەیفەرموو (أللهم إني أعوذُ بِكَ مِنَ الخُبثِ والخبائث). واتە: ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەیتانە نێرەکان و مێیەکان.**

٣- عن عائشة أنَّ النبيَّ (ﷺ) كان إذا خَرجَ من الغائطِ قالَ: **غُفْرانَكَ**. صحيح: رواه أبوداود(٣٠) وابن ماجة(٣٠٠).

**واتە: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر لە ئاودەست دەربچووبایە دەیفەرموو(غُفرانك) (داوای) لێبوردنت(لێ دەکەم خودایە).**

**سوود**:

**فەرموودەیەك هەیە دەڵێ: كاتێك كە پێغەمبەر (ﷺ) لە ناو دەست بهاتبایەدەر دەیفەرموو(الحمدلله الذي اذهب عني الأذى وعافاني) ئەم فەرموودەیە(ضعیف)ە، بۆیە كاری پێ ناكرێ.**

٤- عن ابي قتادة عن النبيِّ(ﷺ) قال: إذا بالَ أحدُكم فلا يأخُذَنَّ ذَكَرهُ بيمينهِ، ولا يَستَنجي بيمينهِ، ولا يَتَنَفَّسُ في الإِناء. رواه البخاري(١٥٤).

**واتە: ئەگەر یەكێك لە ئێوە میزی كرد با زەكەری بە دەستی راستی نەگرێ، وە با تارەت نەگرێ بە دەستی راستی وە با هەناسەش نەخواتەوە لە ناو جام دا.**

**سوود**: **حەرامە تارەت كردن بە دەستی راستە.**

٥-عن حفصة أنَّ النبيَّ(ﷺ) كانَ يَجعلُ يَمينهُ لطعامِهِ وشرابِهِ وثيابهِ ويَجعلُ شمالَهُ لما سوى ذلك. صحيح: رواه أبوداود(٣٢).

**واتە: حەفسەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) راستەی بە كار دەهێنا بۆ خواردن وە بۆ خواردنەوە وە بۆ جل و بەرگ لەبەر كردن ، وە چەپەشی بۆ غەیری ئەوانە بەكار دەهێنا.**

**سوود**:

**هەر چەندە بەڵگەیەكی راستەخۆ نییە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) بەپێی چەپ چووبێتە ئاودەست و بە پێ ی راست لێ ی هاتبێتەدەر ، بەڵام ئیمام شەوكانی لە(السیل الجرار) دا بە شێوەی گشتی دەڵێ سوننەتە.**

# زیکری دەرچوون لە ماڵ

١-عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): منْ قال إذا خرجَ مِن بَيتهِ: بسمِ اللهِ توكَّلتُ على الله ولا حول ولا قوة إلاّ بالله، يُقالُ لَهُ: كُفيت وَوُقيتَ، وتَنَحّى عنْهُ الشَّيطان. صحيح: رواه ابوداود(٥٠٩٥) والترمذي(٣٤٢٦).

**واتە: هەر کەسێك کاتێ کە لە ماڵی خۆی دەچێتە دەرێ بڵێ:( بسم الله , توكّلتُ على الله , ولا حول ولا قوة الا بالله) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: ئەوەندەت بەسە، وە پارێزراوی، وە شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە.**

**<u>مانای زیکرەکە:</u> بە ناوی خوا، پشتم بەست بە خوا، لادان لە هەڵەو خراپەو توانا بۆ خێرو چاکە نیە مەگەر بە خوا.**

٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ مَا خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَيْتِي قَطُّ إِلَّا رَفَعَ طَرْفَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ : ( اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ)

**صحيح :رواه ابوداود(٥٠٩٤) والترمذي(٣٤٢٦)**

**واتە: (أم سلمة) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) قەت لە ماڵی من دەرنەچووە ئیللا چاوی بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمان و فەرموویەتی:** ( اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ) .

**واتە: ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لەوەی کە خەڵك گومڕا بکەم یا گومڕا بکرێم، یا خەڵك هەڵبخلیسکێنم یا بخلیسکێم، یا زوڵم بکەم یا زوڵمم لێ بکرێ، یا نەفامی بکەم یا نەفامیم لەگەڵدا بکرێ.**

# زیکری هاتنەوە بۆ ماڵ

## ١- سوننەتە کە موسڵمان دەچێتەوە ماڵەوە بڵێ (بسم الله)

١-عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إذا دخَلَ الرَّجُلُ بيته فَذَكَرَ اللهَ عند دُخُوله وعند طعامه، قال الشيطانُ لأَصحابِهِ: لا مَبيتَ لَكُم ولا عَشاءَ، وإذا دَخَلَ فَلم يَذكُر اللهَ عند دخوله قال الشيطان: أدركتُم المبيتَ، وإذا لم يذكر الله عند طعامه قال: أدركتُم المبيتَ والعَشاء. رواه مسلم(٢٠١٨).

١-عشاء: جمع(أعشية): طعام العشي: خواردنی ئێوارە.

واتە: هەر کاتێك پیاو چوو بۆ ماڵەوەو ناوی خوای هێنا لە کاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی نان خواردنیدا شەیتان بە هاوڕێکانی دەڵێ: نەشەو مانەوەو نەخواردنی ئێوارەتان بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر چووە ماڵێ ناوی خوای نەهێنا لە کاتی چوونە ژووریدا شەیتان دەڵێ: شەو مانەوەتان دەست کەوت , وە ئەگەر ناوی خوای نەهێنا لە کاتی خواردنیشیدا دەڵێ: شەو مانەوەو خواردنی ئێوارەتان دەست کەوت.

## ٢- سوننەتە کە دەچیتە ماڵەوە سیواك بکەی:

عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ سَأَلْتُ عَائِشَةَ قُلْتُ بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يَبْدَأُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ قَالَتْ بِالسِّوَاكِ .

(رواه مسلم : ٢٥٣)

واتە: باوکی میقدامی کوڕی شورەیح دەڵێ: لە عائیشەم پرسی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەهاتەوە ماڵ بەچی دەستی پێ دەکرد؟ فەرمووی بە سیواك کردن.

## ٣- سوننەتە کاتێك کە دەچیتەماڵەوە سەلام بکەیت

- عن أبي أُمامة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ثلاثةٌ كُلّهم ضامِنٌ على الله، إنْ عاشَ رُزِقَ وكُفي، وإن ماتَ أدْخلهُ اللهُ الجنة: مَنْ دخَلَ بيتهُ فَسلَّمَ، فَهو ضامِنٌ على الله، ومَنْ خَرَجَ إلى المسجد فَهو ضامِنٌ على الله، ومن خرجَ في سبيلِ اللهِ فَهو ضامنٌ على الله. صحيح (رواه أبوداود :٢٤٩٤) وغيره

واتە: خوا کەفیلی سێ کەس دەکات: بەوەی ئەگەر ژیا رزق و رۆزی پێویستی بۆ دابین بکات , وە ئەگەر مردیش بیخاتە بەهەشتەوە، یەکێ بچێتەوە بۆ ماڵ سڵاو بکات، ئەوە زەمانەتی لە سەر خوایە، وە هەر کەسێك لە ماڵ دەربچێ بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، ئەوەش زەمانەتی لە سەر خوایە، وە هەر کەسێکیش لە ماڵ دەرچێ بۆ جیهادو تێکۆشان لە رێی خوادا ئەوەش زەمانەتی لەسەر خوایە.

سوود : کاتێك کە دەچیتە ماڵەوە سەلام دەکەی پاداشتەی زۆر گەورەیە ,جا هەوڵ بدە خۆت ئەنجامی بدەی , وە کەس و کارەکەشت فێر بکەو رابهێنە لەسەری , ئەو کاتە وەکو پاداشتی ئەوانیش بۆ تۆ دەنوسرێ .

# بانگ و قامەت

سوننته بۆ هەر یەكێك كە گوێی لـە بـانگ دەبێـت، وەك بانگدەر ئەو چی دەڵێت ئەویش وا بڵێت، تەنها لە (حَيَّ على الصلاة) وە (حَيَّ على الفلاح) دا بڵێ (لا حول ولا قوه إلا بـالله)، ئـەوجا لـەدوای بـانگ صــەڵاوات لەســەر پێغەمبــەر (ﷺ) بـدات كـە ئەمـە یەكێكـە لـە شێوەكانی (**اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد، اللهم بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد**) رواه البخاری.

ئەوجا لەدوای ئەو سوننەتە داوای (الوسـیله) بـۆ پێغەمبـەر بكـات (ﷺ)، كە لە دوای ئەمە چۆنیەتەكەی باس دەكەین.

عـن عبـدالله بـنِ عَمـرٍو بْـنِ العـاص أنَـهُ سـمع النبـيَّ(ﷺ) يقـولُ: إذا سَمِعتُمُ المُؤَذِّنَ فقولوا مِثلَ ما يقولُ، ثُمَّ صَلُّوا عليَّ، فَإِنَّهَ مَنْ صَلَّى عليَّ صلاةً صَلّى الله عليه بِها عَشراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الوسيلةَ، فَإِنَّها مَنْزِلَةٌ في الجنّةِ لا تنبغي إلاّ لِعَبدٍ مِنْ عبادِ اللهِ وأرجُو أَنْ أكونَ أنا هو، فَمَنْ سألَ لِيَ الوسيلةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفاعَةُ. رواه مسلم(٣٨٤).

واتە: هەر كات گوێتان لە بانگدەر بوو ئێوەش وەك ئەو بڵێن ، پاشان صەڵەواتم لەسەر بدەن ، چونكە هەر كەسێك یەك جار صـەڵەواتم لەسـەر بدات خوا بەهۆی ئەوەوە دە جار صەڵەواتی لەسـەر دەدات ، لـە پاشـان داوای وەسـیلەم بـۆ لـە خـوا بكـەن، چـونكە وەسـیلە پلـەو پایەیەكـە

**لەبەهەشتیٚ بەس بۆ یەك بەندە لە بەندەکانی خوا دەشیٚ , وە من هیوادارم کە ئەو بەندەیە من بم، جا هەر کەسێك داوای وەسیلەم بۆ لە خوا بکات شەفاعەتی بۆ شایستەو ڕەوا دەبێت .**

## چۆنیەتی و گەورەیی داوای وەسیلە کردن بۆ پێغەمبەر

عن جابر بن عبدالله: أنّ رسول اللهِ(ﷺ) قال:(من قال حين يسمعُ النّداءَ: اللهمّ ربَّ هذهِ الدّعوةِ التّامّةِ والصلاةِ القائمةِ آتِ مُحمّداً الوسيلةَ والفضيلةَ وابْعَثْهُ مَقاماً محموداً الذي وعدتهُ حَلّتْ لَهُ شفاعتي يومَ القيامة). رواه البخاري(٦١٤) ومسلم(٣٨٣).

**واتە: هەر یەکێك گوێی لە بانگ بوو بڵێ:( اللهمَّ ربَّ هذهِ الدَّعوةِ التَّامَّةِ والصلاةِ القائمةِ آتِ مُحمّداً الوسيلةَ والفضيلةَ وابعَثْهُ مَقاماً محموداً الذي وعدتهُ) شەفاعەتی بۆ دەکەم لە قیامەتدا.**

**سوود:**

**لە دوای بانگ ئەم دوعایە سوننەتە بخوێنریٚ بەڵام لە دوای قامەت سوننەت نییەو هیچ دەقی شەرعی لەسەر نەهاتووە، ئەوانەش کە دەڵێن بە قیاس لەسەر بانگ لە دوای قامەتیش دەخوێنریٚ زانایانی ڕۆچوو دەڵێن ئەم قیاسە بۆ ئەمە هەڵەیە ، پێغەمبەر**–صلى الله عليه وسلم– **فەرموویەتی:**( من سمع النداء) **نەیفەرمووە** ( من سمع الندائين) **تا قامەتیش بگرێتەوە , خۆ ئەگەر گوتمان سوننەتە لە دوای قامەتیش بخوێنریٚ ئەو کاتەش نابێت بە دەنگی بەرز بخوێنریٚ وەکو ئێستا زۆر لە مامۆستایان دەیکەن.**

## چۆنیەتی و گەورەیی وەڵام دانەوەی بانگ

**عن عُمرَ بْنَ الخَطابِ(رضي الله عنه) قال: قالَ رسول(ﷺ) إذا قالَ المُؤْذنُ: الله أَكبر ألله أكبر، فقالَ أحدكُمْ: الله اكبر الله اكبر، ثُمَّ قالَ: أشهد أن لا اله الا الله، قال: أشهد أن لا اله الا اللهُ ، قالَ أشهد أنَّ محمداً رسولُ الله، قالَ: أشهد أن محمداً رسولُ الله، ثُمَّ قالَ حَيَّ على الصّلاة، قالَ: لا حول ولا قوة إلاّ بالله، ثُمَّ قالَ حَيَّ على الفلاح، قالَ: لا حول ولا قوة الا بالله ثُمَّ قالَ: الله اكبر الله اكبر قال الله اكبر الله اكبر، ثُمَّ قالَ لا اله الا الله قالَ: لا اله الا الله من قلبه دخَلَ الجنّة.** رواه مسلم(٣٨٥) وابوداود(٥٢٧).

**واتە: عومەری کوری خەتتاب(رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: پیّغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر بانگدەر گوتی(** الله اكبر الله اكبر)، **یەکێك لە ئێوەش گوتی** :(الله اكبر الله اكبر ) **لە پاشان گوتی** :(اشهد ان لا اله الا الله) **ئەویش گوتی** : (أشهد ان لا اله الا الله ) **لە پاشان گوتی** : (اشهد ان محمدا رسول الله) **ئەویش گوتی** : (أشهد ان محمدا رسول الله) **لە پاشان گوتی** : (حَيَّ على الصلاة) **ئەویش گوتی** : (لا حول ولا قوة الا بالله )**لە پاشان گوتی** :(حَيَّ على الفلاح )**ئەویش گوتی** :(لا حول ولا قوة الا بالله) **لە پاشان گوتی** :(الله اكبر الله اكبر) **ئەویش گوتی**:( الله اكبر الله اكبر) **لە پاشان گوتی**: (لا اله الا الله) **ئەویش گوتی** :(لا اله الا الله) **لە دڵیەوە دەچێتە بەهەش**

## زیكرێكی گەورە دوای شایەتمانی بانگ

عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ:( مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ ) رواه مسلم (٣٨٦)

**واتە: هەر یەكێك كاتێك گوێی لە بانگدەر دەبێت بڵێ:** (اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له وان محمدا عبده ورسوله رضيتُ بالله ربا وبمحمد رسولاً وبالإسلام ديناً) **خوا لە گوناهەكانی خۆش دەبێت.**

### سوود

**ئەو زیكرە لەدوای** (اشهد ان محمدا رسول الله) **ی دووەمی بانگ دەگوترێ.**

## بێ دەنگ بوون لە كاتی بانگداندا

قال ابن حجر في (الفتح):عن ابن جريح أنه قال:(حُدِّثْتُ أنَّ الناسَ كانوا يَنْصتون لِلْمُؤَذِّنِ إنصاتَهم للقراءة) [الفتح]حديث(٦١١) باب ما يقول إذا سمع المنادي

**واتە: (ابن حجر) لە** (فتح البارئ )**دا دەڵێ : لە (ابن جريح) گێردراوەتەوە كە ووتویەتی :بۆم گێردراوەتەوە كە خەڵكی لەمەو پێش بێ دەنگ دەبوون بۆ بانگدەر وەك چۆن بێ دەنگ دەەبوون بۆ قورئان خوێندن .**

# پاڕانەوە لە دوای بانگدا قەبولە

١- عن انس بن مالك(رضى الله عنه) قال: قالَ رسول(ﷺ) لا يُرَدُّ الــدُّعاءُ بَــينَ الأذانِ والإقامَــةِ. **صـــحيح رواه ابـــو داود(٥٢١) والترمذي(٢١٢).**

**واتە: دوعاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ناگێردرێتەوە(واتە قەبول دەبێت).**

٢- عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ عَمْـرٍو أَنَّ رَجُـلًا قَـالَ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ : (إِنَّ الْمُؤَذِّنِينَ يَفْضُـلُونَنَا فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قُـلْ كَمَـا يَقُولُونَ فَإِذَا انْتَهَيْتَ فَسَلْ تُعْطَهْ)حسن صحيح:رواه أبوداود(٥٢٤)

**واتـە: پیاوێـك گـوتی ئـەی پێغەمبـەری خـوا بانگـدەرەکان لـە ئێمـە باشترن (بەهۆی پاداشتی بانگدانەوە)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوان چۆن دەڵێن تۆش وابڵێ، جا کاتێك کە تەواو بوویت داوا بکە لە خوا پێت دەدرێت.**

# بابەتی پەیوەندیدار بە بانگ و قامەت

**١- قسەی راجح ئەوەیە کە بانگ و قامەت فەرزی (کیفایە)یە، واتە ئەگـەر یەکێك پێی هەستا گوناح لەسەر ئەوانی تر لادەچێ، بەڵام بۆ ئەو کەسەی کـە بەتەنیا نوێژ دەکات بانگ و قامەت سوننەتە بۆی.**

**٢- لەکاتی نوێژی (جمع) یەك بـانگ و دوو قامـەت دەکـرێ، وە یـەك زیکـری دوای نوێژەکان دەکرێ لەدوای نوێژی دووەم.**

٣- (الصلاة على النبي بعد الآذان سنة والكيفية بدعة) سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای بانگ سوننەتە، بەلاَم بەدەنگی بەرز وەکو بانگەکە بگوترێ ئەمە بیدعەیە.

٤- لە نوێژی بەیانیاندا دوو جار بانگ دەدرێ، جا ئەگەر یەك جار بانگدرا ئەوە (الصلاة خير من النوم) ناگوترێ، چونکە ئەمە تەنها لە بانگی یەکەمدا دەگوترێ و، لەبانگی دووەمدا بیدعەیە، وە هەروەها ئەمەش بیدعەیە لەجیاتی بانگی یەکەم (أستغفر الله) و (سبحان الله) و زیکری تر بکرێ.

٥- (ابن باز) دەڵێ: بانگ و قامەت بۆ ئافرەت لە شەرعدا نەهاتووە بەڵکو بە (الله أكبر) دەست بە نوێژەکەی دەکات.

٦- ئەگەر کەسێك قورئانی دەخوێند بانگدرا باشتر وایە واز لە قورئان خوێندن بێنێ و خەریکی وەلاَم دانەوەی بانگەکە بێت.

# له زیكره‌كانی ده‌ست نوێژ

## ١- نیه‌ت هێنان

نیه‌ت هێنان بۆ ده‌ست نوێژ مه‌رجه، وه شوێنه‌كه‌شی ناو دڵه‌و نابێت نیه‌ته‌كه به زمان بگوترێ چونكه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بۆ ده‌ست نوێژ شوشتن نیه‌تی به زمان نه‌هێناوه، وه هه‌ر یه‌كێك قۆڵ و باسكی هه‌ڵكرد دانیشت بۆ ده‌ست نوێژ گرتن ئه‌وه نیه‌تی هێناوه، وه هه‌ر یه‌كێكیش هه‌ستێ بۆ نوێژ كردن ئه‌وه نیه‌تی نوێژی هێناوه.

عن عمر ابْنَ الخطاب قال: سمعتُ رسولَ الله (ﷺ) يقولُ: (إنَّما الأعمالُ بالنِّيَّاتِ، وإنَّما لِكلِّ امْرِيءٍ ما نوى...) رواه البخاري(١) ومسلم(١٩٠٧).

واته: هه‌ر كرده‌وه‌یه‌ك به‌پێی نیه‌ته، نیه‌تی هه‌ر كه‌س چۆن بوو هه‌ر ئاوای به‌ر ده‌كه‌وێ.

## ٢- سیواك كردن

سوننه‌ته پێش ئه‌وه‌ی ده‌ست بكه‌ی به ده‌ست نوێژ شوشتن سیواك بكه‌ی یا پێش ئاو له‌ده‌م وه‌ركردن (مضمضة)

عن أبي هريرة قال رسولُ الله (ﷺ): لولا أن أشُقَّ على أمتي لأمرتُهم بالسواك مع كل وضوء. صحيح : أنظر: ( صحيح الجامع ٥٣١٦).

واته: ئه‌گه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه نه‌بوایه كه ئوممه‌ته‌كه‌م سه‌غڵه‌ت بكه‌م فه‌رمانم پێ ده‌كرن كه‌سیواك بكه‌ن له گه‌ڵ هه‌موو ده‌ست نوێژ گرتنێك .

## ٣- خوێندنی (بسم الله)

ئیمام نەوەوی لە کیتابی (الأذکار)دا دەڵێ: سوننەتە گوتنی (بسم الله الـرحمن الـرحیم) لەسـەرەتای دەسـتنوێژ، وە ئەگـەر تـەنها بڵـێ (بسـم الله) ئەمـەش کافیـە، ئەگـەر لەسـەرەتاوە نـەیگوت بـا لەناوەندەکانی دەستنوێژەکەی بیڵێ بەڵام ئەگەر نەیگوت تا دەست نوێژەکەی تەواو کرد لـەپاش دەسـت نوێژەکـە کـاتی نـامێنێ، بـەڵام دەست نوێژەکەی تەواوە ئەگەر بەئەنقەست نـەیکردبێ یـا بـە لـەبیر چوون.

جمهوری زانایـان ئیمـام شـافیعی و مالـك و ئـەبو حەنیفـە لەسـەر ئەوەن کە گوتنی (بسم الله) سوننەتە.

ئیمـام أحمـد دەڵـێ: نـەم زانیـوە هـیچ فەرموودەیـەکی (صـحیح) دەربارەی گوتنی (بسم الله) هاتبێ لەدەست نوێژ شووشتن.

بەڵام کۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن فەرموودەی گوتنی (بسـم الله) لـە دەست نوێژ بەهەموو ڕێگاکانی بەرز دەبێتەوە بۆ پلەی (حسن).

پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێ: (لا وضـوء لمـن لم یـذکر اسـم الله) حدیث ضعیف.

## ٤- سێ جار دەست شووشتن

سوننەتە لەدوای خوێندنی (بسم الله) پێش ئەوەی دەست بکەی بە ئاو لەدەم وەرکردن و لە کەپوو رادان سێ جاران دەستت بشۆی (فَغَسلَ كَفَّيْه ثلاثَ مَرَّات....) رواه البخاري (١٦٤) ومسلم (٢٢٦).

## ٥- ئاو لە دەم و کەپوو رادان سێ جار بەیەك مشت ئاو

(عبدالله) کوڕی زەید لە بارەی چۆنیەتی دەست نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: (أدخَلَ يدهُ فَسْتَخْرَجَها، فَمَضْمَضَ واسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ واحدة، ففعلَ ذلك ثلاثاً) رواه البخاري (١٩٢) ومسلم (٢٣٥).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەستی خستە ناو ئاوەکەو دەریهێنا بەیەك مست ئاوی لەدەم و کەپووی رادا، وە ئەمەشی سێ جاران دووبارە کردەوە.

ابن القيم لە (زاد المعاد) دا دەڵێ: (ولم يجيء الفصل بين المضمضة والإستنشاق في حديث صحيح البتة....) وكان يستنشق بيده اليمنى ويستنشر باليسرى، واتە: لە هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) دا نەهاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە جیا جیا ئاوی لە دەم و لووتی رادابێ، بەڵکو بە یەك مست ئاو لەیەك کاتدا ئاوی لە دەم و کەپووی وەرکردووە، وە پێغەمبەر (ﷺ) بەدەستی راستی ئاوی لە کەپووی وەردەکردو بەدەستی چەپی فنی دەکردەوە.

## ٦- چۆن مەسحی سەرت دەكەی

عن عبدالله بن زيد أنَّ رسول الله (ﷺ) مَسحَ رأسهُ بِيَدَيْهِ فَأقبلَ بهما وأَدْبرَ، بَدأَ بِمُقَدَّمِ رَأسِهِ حتى ذهبَ بِهما الى قفاهُ ثم رَدَّهُما إلى المكانِ الذي بَدأَ مِنهُ . رواه البخاري (١٨٥).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ)،، بەهەردوو دەستی مەسحی سەری کرد بردینە پێش‌و گێڕانیەوە دواوە، لەپێشە سەریەوە دەستی پێ کرد ئینجا بەرەو پشتی ملی بردن، پاشان گێڕاینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێیەوە دەستی پی کردبوو.**

**سوود :- یەك جار مەسحی هەموو سەر فەرزە، لەهیچ فەرموودەیەکی (صحیح) دا نەهاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ)، بەشێك لەسەری مەسح کردبێ بەڵکو ئەگەر عەمامەشی لەسەر بوایە مەسحی بەسەردا دەکردو هەموو سەری پێ تەواو دەکرد.**

## ٧- مەسحی دوو گوێیەکان

عن عبدالله بن زيد قال: قال رسولُ الله (ﷺ)،: ألأُذُنانِ مِنَ الرأس.

**حسن: رواه ابن ماجه (٤٤٣).**

**واتە: دوو گوێیەکان بەشێکن لەسەر .**

**سوود:١- لەمەزهەبی شافیعی مەسحی گوێیەکان سوننەتە .**

**٢- هەندێك دەڵێن مادام دوو گوێیەکان بەشێکن لەسەر کەواتە فەرزە مەسح بکرێن، ئەم فەرموودەیەش بەبەڵگە دەهێننەوە.**

٣- لەفەرموودەی راستدا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ)، ناوەوەو دەرەوەی گوێی مەسح کردووە.

٤- بەسەندێکی راست هاتووە کەئیبن عومەر ئاوێکی نوێی بەکارهێناوە بۆمەسحی گوێیەکانی.

## ٨- زیکری دوای دەست نوێژ

عن عمر بن الخطاب(رضى الله عنه) قال: قالَ رسول الله (ﷺ) منْ توضَّأَ فأحْسَنَ الوُضوء، ثُمَّ قَالَ: أشهَدُ أن لاإله إلا الله وحده لا شريك له , وأشهد أنَّ محمداً عبدهُ ورَسُولُه، اللهمَّ اجْعَلني مِنَ التَّوَّابين واجْعَلني مِنَ المتطهِّرين، فُتِحَتْ لَهُ ثمانيةُ أبواب الجنَّةِ، يَدْخُلُ مِن أيِّها شاء) رواه مسلم(٢٣٤) والترمذي(٥٥) بەلام ئەم بەشە(اللهمَّ اجْعَلني مِنَ التَّوَّابين واجْعَلني مِنَ المتطهِّرين) لە ریوایەتی (مسلم )دا نەهاتووە بەڵکو لە ریوایەتی(ترمذي)دا هاتووە کە(البانی) بە(صحیح)ی داناوە.

واتە: هەر یەکێك دەست نوێژ بشوات بە جوانی لە پاشان بڵێت(أشهَدُ أن لااله الا الله وحده لا شريك له وأشهد أنَّ محمداً عبدهُ ورَسُولُه، اللهمَّ اجْعَلني مِنَ التَّوَّابين واجْعَلني مِنَ المتطهِّرين) هەشت دەرگاکانی بەهەشتی لێ دەکرێتەوە لە کامیان حەز بکات دەچێتە ژوورەوە.

وە سوننەتیشە ئەم زیکرەش بکەی (**سُبحانكَ اللهمَّ وَبِحَمْدكَ أشهدُ أن لا إله إلّا انتَ أَسْتَغْفِرُكَ واتوبُ إليك**) حديث صحيح رواه النسائي في (عمل اليوم والليلة) والحاكم (١/٧٥٢).

## ٩- دوو رکات نوێژ کردن لەپاش دەست نوێژ

**سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە دەست نوێژ دەشوات لەپاش دەست نوێژەکەی راستەوخۆ پێش ئەوەی کاتێکی زۆری بەسەردا بڕوات دوو رکات نوێژ بکات.**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ:** (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ ، فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ ، مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ ، إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ) رواه مسلم(٢٣٤).

**واتە: هەر موسڵمانێك دەست نوێژ بشوات، دەست نوێژەکەی جوان بشوات , لەپاشان هەستێ دوو رکعات نوێژ بکات بە دڵ و بە رووی رووی لە نوێژەکەی بێت ئیللا بەهەشتی بۆ واجب دەبێت.**

**(ابن تیمیە) رەحمەتی خوای لێ بێت لە (الفتاوى الكبرى) (٣٤٥/٥) دا دەڵێ: (ويُستحب أن يُصلى ركعتين عقب الوضوء ولو كان وقت النهي وقال الشافعية).**

**واتە: وە سوننەتە دوو رکات نوێژ بکات لەدوای دەست نوێژ هەر چەندە کاتەکە کاتی نەهی بێت، وە ئەمەش شافعیەکان وا دەڵێن.**

## دەست نوێژ و سڕینەوەی گوناح

عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: إذا توضَّأَ العبدُ المسلمُ أَوِ المؤمنُ، فَغَسَلَ وجهَهُ خرجَ من وجهِهِ كُلُّ خطيئةٍ نَظَرَ اليها

بِعَيْنَيهِ مَعَ الماءِ(او مَعَ آخِرِ قَطْرِ الماء)، فإذا غَسَلَ يَدَيْهِ خرج مِن يَدَيهِ كُلُّ خطيئةٍ كان بَطَشَتْها يَداهُ مع الماءِ،( او مَعَ آخِرِ قَطْرِ الماء)، فأذا غَسَلَ رِجليهِ خَرجتْ كُلُّ خطيئةٍ مَشَتْها رِجلاهُ مَعَ الماءِ(او مَعَ آخِرِ قَطْرِ الماء) حتى يَخرُجَ نَقِيّاً من الذُّنوب. رواه مسلم(٢٤٤).

واته: کاتێك بەندەی موسڵمان یان بەندەی باوەڕدار دەست نوێژ دەشوا کە دەم و چاوی شوشت ئەو گوناهانەی بە چاوەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەست نوێژەکەدا دەڕۆن، یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دەڕۆن، کە دەستی دەشوات ئەو گوناهانەی بە دەستەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەست نوێژەکەدا دەڕۆن یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دەڕۆن، کە هەردوو پێیەکانی دەشوات ئەو گوناهەی کە بە پێیەکانی بۆی ڕۆیشتووە لەگەڵ ئاوەکەدا دەڕۆن، یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا هەتا پاك دەبێتەوە لە گوناح.

جا موسڵمانی بەڕێز کاتێك دەتەوێ دەست نوێژ بشۆی ئەوە بزانە کارێکی گرنگ بۆ دونیاو قیامەت ئەنجام دەدەی دڵت خۆش بێت، هەوڵ بدە دەست نوێژێکی جوان بشۆی سوننەتەکانی تیادا جێ بەجێ بکەیت زیادە ڕۆیی نەکەی لە ئاو سەرف کردن، وە ئەگەر بە مەسینە دەست نوێژ بشۆی ئەمە زۆر گرنگە بۆ خۆ پاراستن لە زیادە ڕۆیی لە ئاو سەرف کردن.

## سوننەتە بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ بشۆی

١- عن أبو أسد قال: سألتُ أنسَ بنِ مالكٍ عنِ الوُضُوء فقال: (كان النبي (صلى الله عليه وسلم) يَتَوَّضأُ لِكُلِّ صلاةٍ وكُنَّا نُصَلِّي الصلواتَ بِوُضُوءٍ واحدٍ) رواه البخاري (٢١٤) وأبو داود (١٧١) وهذا لفظه.

**واتە: ئەبو ئەسەد دەڵێ لەبارەی دەست نوێژ پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالك کرد گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژی دەشووشت، وە ئێمەش نوێژەکانمان بەیەك دەست نوێژ دەکرد، لە ریوایەتی (بخاری) دەڵێ: (ما لم يحدث) واتە: بەیەك دەست نوێژ , تا دەست نوژەکەمان نەدەما هەر نوێژمان پێ دەکرد.**

٢- عن سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الْفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ لَقَدْ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ قَالَ عَمْدًا صَنَعْتُهُ يَا عُمَرُ) رواه مسلم(٢٧٧)

**واتە: باوکی بورەیدە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە رۆژی (فتح) هەموو نوێژەکانی بەیەك دەست نوێژ کرد وە مەسحی لەسەر خوففەکانی کرد، جا ئیمام عومەر گوتی: ئەمرۆ شتێکت کرد کە پێشتر نەت کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بە ئەنقەست وام کرد ئەی عومەر.**

## پارێزگاری لە دەست نوێژ نیشانەی ئیمانە

عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اسْتَقِيمُوا وَلَنْ تُحْصُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ خَيْرَ أَعْمَالِكُمْ الصَّلَاةَ وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ) صحيح رواه ابن ماجة (٢٧٧)

**واتە: راست بن و شوێنی حەق بکەون (ولن تحصوا) واتـە (ولن تطيقوا) یانی پێشتان ناکرێ بەتەواوی ئەمە بکەن، وە بزانن بێ گومان باشـترینی کردەوەکانتان نوێژە، وە پارێزگاری لە دەست نوێژ ناکات ئیللا ئیمانـدار نەبێت.**

### سوود

**١- کەسی موونافیق پارێزگاری لە دەست نوێژ ناکـات چـونکە دەسـت نوێژ دەتوانی نەتبێت و کەسیش پێـی نـەزانێ، جـا ئـەو کەسـەی کـە لـە کاتی ساردی و گەرمیـدا لـە هـەموو کاتێکدا نوێـژەکانی بەدەسـت نوێـژ دەکات ئەمە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە ئەم کەسە ئیماندارە.**

**٢- سـوننەتە موسـڵمان بـە بـەردەوامی دەسـت نوێـژی هـەبێت هـەر کاتێك دەست نوێژی شکا دەست نوێژ بشواتەوە.**

# زیکرەکانی ناو نوێژ

## بەرزکردنی هەردوو دەستەکان لەکاتی (الله اکبر) کردنی نوێژدا

لە فەرموودەی (صحیح) دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە چوار شوێندا لەگەڵ گوتنی (الله أكبر) دەستی بەرز کردۆتەوە تا بەرامبەر شانەکانی وە تا بەرامبەر گوێیەکانی با نوێژکاریش هەر جارەو جۆرێکیان ئەنجام بدات ئەم چوار شوێنەش ئەمانەن

عن عبدالله بن عمر قالَ: رأيت النبيّ(ﷺ) افتتحَ التكبيرَ في الصَّلاةِ فَرَفَع يَديهِ حينَ يُكبِّرُ حتّى يجعَلْهُما حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ وإذا كَبَّر لِلرّكوعِ فعَلَ مِثلَهُ وإذا قالَ: ربنا ولك الحمد ولا يفعل ذلك حين يَسجُدُ و لا حينَ يَرفَعُ رأسَهُ مِنَ السُّجود. رواه البخاري(٧٣٨) ومسلم(٣٩٠).

واتە: عبدالله کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەرم(ﷺ) بینی(الله اكبر)ی نوێژ دابەستنی کرد هەردوو دەستەکانی لە کاتی(الله اكبر) کردندا بەرز کردەوە تا ئاستی شانەکانی وە کاتێك(الله اكبر)ی بگوتبایە بۆ ڕکوع ئەم دەست بەرزکردنەوەی دوو بارە دەکردەوە وە ئەگەر بیگوتبا(سمع الله لمن حمده) بە هەمان شێوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە وە دەیفەرموو(ربنا ولك الحمد) بەڵام لە کاتی سەجدە بردن و کاتی هەستانەوە لە سەجدە دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە.

**سوود**:

**١-لە صحيحی بخاری دا هاتووە لە فەرموودەی(٧٣٩) کە عبدالله کوڕی عومەر لە کاتی هەستانەوە لە دووەم رکات دەستی بەرز کردۆتەوەو وە ئەمەشی داوەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)**

**٢- لە صحيحی موسليم دا هاتووە لە فەرموودەی(٣٩١) کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستەکانی بەرز کردۆتەوە تا بەرامبەر گوێیەکانی**(رفع يديه حتى يُحاذي بهما أُذُنَيهِ).

## چۆنیەتی دەست گرتن لە نوێژدا

**١- وائیلی کوڕی حیجر لە درێژەی باسی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ**: (... ثُمَّ وضَعَ يده اليُمنى على كفِّهِ اليسرى والرُّسْغِ والساعد...)

صحيح : رواه النَّسائي (٨٨٧).

**واتە: لەپاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەستی راستی لەسەر پشتی دەستی چەپی و جومگەی دەست و باسکی و باسکی دانا، واتە دەستی راستی لەسەر بەشێکی پشتی دەستی و جومگەو بەشێکی باسکی چەپی دانا.**

٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ قَالَ أَبُو حَازِمٍ لَا أَعْلَمُهُ إِلَّا يَنْمِي ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِسْمَاعِيلُ يُنْمَى ذَلِكَ وَلَمْ يَقُلْ يَنْمِي .رواه البخاري (٧٤٠)

واتە: سەهلی کوڕی سەعد دەڵێ (خەڵك پێشتر فەرمانیان پێ دەکرا کە پیاو لەنوێژدا دەستی راستی لەسەر باسکی چەپی دابنێ، ئەبو حازم دەڵێ من هەر ئەوە تێدەگەم کە مەبەستی پێغەمبەر بێت (ﷺ) (کە فەرمانی بە خەڵك کردووە).

جا تۆش هەر جارەو بە جۆرێك لەم شێوەیە دەستت بگرە لە نوێژدا.

## پەنا گرتن، خۆ پاراستن (إستعاذة) ی ناو نوێژ

١- خودا دەفەرمووێ ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾ (النحل: ٩٨).

واتە: هەر کاتێك کە ویستت قورئان بخوێنیت خۆت بپارێزە بە خوا لە شەیتانی دەرکراوو دوورخراوە لە رەحمەتی خوا.

لەبەر ئەم ئایەتە (جمهور العلماء) (إستعاذة) یان بەم شێوە هەڵبژاردووە: (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ).

٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ بِاللَّيْلِ كَبَّرَ , ثُمَّ يَقُولُ:( سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ) ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا ثُمَّ يَقُولُ أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ . صحيح :رواه الترمذي (٢٤٢)

واتە: ئەبو سەعید دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك هەستابایە بۆ نوێژ لە

شەودا (الله اكبر) ی دەگوت، لە پاشـان دەیفـەرموو: (**سـبحانك اللـهم وبحمدك ,وتبارك أسمك، وتعالى جَدّك، ولا إلـه غـيرك**) لـە پاشـان دەیفەرموو: (الله أكبر كبيرا) لەپاشـان دەیفـەرموو (**أعـوذ بـالله السـميع العليم من الشيطان الرجيم من همزه ونفحه ونفثه**).

واتــە: خــۆم دەپــارێزم و پــەنا دەگــرم بــەخوای زۆر بیســەرو زانــا لــە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی خوا، لە وەسوەسەی وە لە فووی خۆ بـە گەورە زانی بەبەرداکردنی وە لە شعیری خراپ فێرکردنی.

## سوود

١- (إستعاذة) جگە لـەم شـێوەی کـە باسـکرا بـە دوو شـێوەی تـریش هاتووە

أ- (أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم) (**صفة الصلاة للألباني- ٩٥-٩٦**).

ب- (أعـوذ بـالله مـن الشـيطان الـرجيم مـن هَمْـزه ونفخـه ونفثـه) (**إرواء- ٣٤٢**).

جا هەوڵ بدە هەر جارەو بە یەکێك لەم سێ جۆرە (إستعاذة) لە نوێژدا بخوێنی.

٢- خۆپاراستن، پـەنا گـرتن (إستعاذة) لای زۆربـەی زانایـان تـەنها لـە رکاتی یەکەم لە پێش خوێندنی فاتیحەدا سوننەتە , وە لە فەرموودەشدا تەنها بەم شێوەیە هاتووە، بەڵام شافیعی، رەحمەتی خوای لێ بێـت، لـە هەموو رکاتەکان بە سوننەتی دەزانێ، بەڵام رای زۆرینە بەڵگەدارترە.

## دعاء الاستفتاح(دوعای دەست پێكردنی نوێژ)

**أ- خوێندنی دوعای استفتاح سوننەتێكی موئەكەدەیە.**

**ب- جائیز نییە لە یەك (دعاء الإستفتاح) زیاتر لەناو یەك نوێژدا بخوێنرێ.**

**جـ- (دعاء الاستفتاح) زۆرن، هەوڵ بدە هەر جارەو یەكێكیان بخوێنی لە پاش (تكبيرة الإحرام) ئەمانەی خوارەوە هەندێك لە دوعای (استفتاح)ن.**

١- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَالَ : [سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ] [١].

**واتە: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك دەستی بە نوێژ كردن بكردبایە لەدوای (الله أكبر) گوتن دەیفەرموو** (سُبحانكَ[٢] اللهمَّ[٣] وَبِحَمْدِكَ، وتَبارَكَ اسْمُكَ، وتعالى جَدُّكَ(٤)، ولا إلهَ غَيرُكَ).

---

(١) سبحانك: أُنَزِّهُكَ، **یانی تۆ بە پاك دەگرم** ، (سبحان) و (تسبيح) **لە** (سَبح) **وە هاتووە**، (تسبيح) **واتە** (تنزيه) یانی: **بەپاك راگرتن**.

(٢) اللهم: واته (يا الله) یانی : ئەی خوایە.

(٣) جَدُك: واته: (عظمتك) یانی گەورەییت (تعالى جدك) على جلالك وعظمتك.

(٤) صحيح، رواه أبو داود (١٧) وأحمد (٢٠٢٣٧).

واتە: ئەی خودایە پاكی و بێ گەردی و سوپاس و ستایش بۆ تـۆ، وە ناوت پیرۆزو بەرزە، وە گەورەییت بـەرزو بڵنـدە، وە هـیچ پـەرسـتراوێكی بەڕاستی نییە بێجگە لەتۆ.

٢- قال أَبُو هُرَيْرَةَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً قَالَ أَحْسِبُهُ قَالَ هُنَيَّةً فَقُلْتُ بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ مَا تَقُولُ قَالَ أَقُولُ (اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ[1]).

واتـە: ئـەبو هـورەیرە دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لـە نێـوانی تـەكبیرەی ئیحـرام و خوێنـدنی (فاتحة) كـەمێك بـێ دەنـگ دەبـوو، جـا گـوتم ئـەی پێغەمبەری خوا دایك و باوكم بـە فیـدات بـن، كـە بـێ دەنـگ دەبیـت لـە نێـوانی تـەكبیرەی ئیحـرام و خوێنـدنی (فاتحة) چـی دەڵێـی؟ فـەرمووی: دەڵێم:

(اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَاي كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَاي بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ).

واتە: ئەی خودایە نێوانی من و نێوانی گوناحەكانم ئەوەندە لەیەك دوور بیەخـەوە، هـەروەكو كـە نێـوانی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژ ئـاوات لەیـەك دوور

---

(١) رواه البخاري (٧٧٤) ومسلم (٥٩٨).

خستۆتەوە، ئەی خوایە پاکم بکەوە لە گوناحان، هەروەکو چۆن پۆشاکی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەکرێتەوە، ئەی خودایە گوناحەکانم بشۆ بە ئاوو بەفرو تەزرە.

٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ قَالَ وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنْ الْمُسْلِمِينَ , اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلَاقِ لَا يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلَّا أَنْتَ وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لَا يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلَّا أَنْتَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) رواه مسلم (٧٧١).

واتە: عەلی رەزای خوای لێ بێت، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك هەستابا بۆ نوێژ کردن (لەدوای تەکبیرەی ئیحرام) دەیفەرموو: وَجَّهْتُ وَجْهِيَ تا کۆتایی فەرموودەکە.

واتە: رووم کردە ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، وە من لە هاوبەش دانەران نیم، بێ گومان نوێژو سەربرین و ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، هیچ شەریکێکی نییە، وە بەوە فەرمانم پێکراوە، وە منیش یەکێکم لە موسڵمانان، ئەی خودایە تۆ پادشای، هیچ پەرستراوی بەڕاستی نییە بێجگە لەتۆ، تۆ پەروەردگارمی وە من

بەندەی تۆم، ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە، وە دان دەنێم بە گوناهەکانم، لە هەموو گوناهەکانم خۆش بە، بێ گومان هیچ کەسێك نییە لە گوناحان خۆش بێت بێجگە لەتۆ، هیدایەتم بدە بۆ جوانترینی رەوشت، هیچ کەسێك رێنموونی ناکات بۆ باشترینی رەوشت بێجگە لەتۆ، رەوشتە خراپەکانم لێ لابدە، هیچ کەسێك نییە رەوشتە خراپەکانم لێ لابدات بێجگە لەتۆ، خوایە من بەدەنگ بانگەوازەکەتەوە هاتووم، هەموو خێرێك بەدەستی تۆیە، وە هیچ خراپەیەکیش لای تۆ نییە، من بەتۆوە هەم و بۆلای تۆش دەگەڕێمەوە، گەورەو بەرزی، داوای لێبوردنت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆلات.

**سوود**:

١- ئەم زیکرە هەروەکو ئەلبانی دەڵێ: لە نوێژە فەرزەکان و سونەتەکان دەخوێنرێ.

٢- کەسێك کە بە رکاتی دووەم و سێ یەم و چوارەم رادەگات لە نوێژی جەماعەت دەتوانێ (دعاء الاستفتاح) بخوێنێ، بەڵام ئەگەر ئیمام قورئانی دەخوێند با گوێ بداتە قورئانەکە.

٤- عن أَبي سلَمَةَ قَالَ سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا بِم كَانَ يَسْتَفْتِحُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاتَهُ إِذَا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ ؟ قَالَتْ كَان يَقَولَ : اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنْ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ *

حسن رواه ابن ماجة (١٣٥٧) والترمذي(٣٤٢).

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: لە عائیشەم پرسی پێغەمبەر (ﷺ) بەچی نوێژەکانی دەست پێ دەکرد کاتێک کە بەشەو هەڵبستایە؟ گوتی دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنْ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ).

واتە: ئەی خودایە پەروەردگاری جبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل، داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای نهێنی و ئاشکرا، تۆ حوکم دەدەیت لە نێوانی بەندەکانتدا لەو شتانەی کە ئەوان تیایدا جیاوازن، هیدایەتم بدە بۆ ئەو حەق و رێگە راستەی کە ئەوان تیایدا جیاواز بوون بە ئیزنی خۆت، بێ گومان تۆ هیدایەتی ئەو کەسە دەدەیت کە ویستت لەسەر بێت بۆ رێگای راست.

**سوود**:

لە ریوایەتی (ابن ماجه) هاتووە کە (عبدالرحمن بن عمر) یەکێکە لە راویەکانی ئەم فەرموودەیە، دەڵێ: بەم شێوەیە لەبەری بکەن (جبرائِيل) چونکە بەم شێوە لە پێغەمبەرەوە هاتووە، لە ریوایەتی (ترمذي) بە (جِبريل) هاتووە، وە لە قورئانیش بە (جِبريل) هاتووە.

# چەند باسێك دەربارەی سورەتی (الفاتحة)

ئیمامی نەوەوی لە کیتابی (الأذکار) دا دەڵێ: بزانە خوێندنی قورئان گەورەترین زیکرە، وە لە فەرموودەی راستی پێغەمبەریشدا هاتووە (ﷺ) کە سورەتی (فاتحة) گەورەترین سورەتە لە قورئاندا وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (لا صلاة لِمَنْ لم يقرأ بفاتحة الكتاب)، رواه البخاري (٧٥٦) ومسلم (٣٩٤)، واتە: ئەوەی سورەتی (فاتحە) نەخوێنێ لە نوێژەکەیدا ئەوە نوێژەکەی دروست نییە.

بۆیە زانایان دەڵێن: خوێندنی سورەتی (فاتيحة) لە ناوە نوێژدا روکنە جا تۆش دەتوانی لە رێگای سورەتی (فاتحة) خێرێکی زۆر بۆ خۆت کۆ بکەیتەوە، هەوڵ بدە ماناکەی بزانی بە شێوەیەکی جوان و بە (تجوید) بیخوێنیەوە، وە لە نوێژو لە دەرەوەی نوێژ فێر بە چۆن و لە چ کاتێکدا دەیخوێنیەوە، جا ئێمەش لێرەدا بۆ ئەم مەبەستە بە شێوەیەکی سادە چەند خاڵێك دەربارەی ئەم سوورەتە دەخەینە روو.

## خاڵی یەکەم: مانای (فاتحة) بە کورتی:

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای بەبەزەیی و بە رەحم

(ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ) هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

(ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) زۆر بەزەیی و زۆر بە رەحم

(مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ) خاوەنی رۆژی پاداشت و سزا

(إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ) بەتەنها تۆ دەپەرستین و بەتەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین.

( ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ) هیدایەتمان بدە بۆ رێگای راست.

( صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ) رێی ئەوانەی چاکەو نیعمەتت لەگەڵدا کردوون نەك (رێی) ئەوانەی غەزەبیان لێ گیراوە نەك (رێی) گومڕایان.

## خاڵی دووەم: مانای هەندێك لە ووشەکانی (فاتحة)

(ٱلْحَمْدُ ) هەموو ستایشێك، لە (مختار الصحاح) دا دەڵێ: (ٱلْحَمْدُ) ضد الذّم، واتە: (ٱلْحَمْدُ) پێچەوانەی زەم کردنە .

(رَبِّ ) پەروەردگار .

(ٱلْعَٰلَمِينَ ) جیهانیەکان (ٱلْعَٰلَمِينَ ) کۆی (عالم)ە، واتە: جیهان، وەك جیهانی ئینسان، جیهانی فریشتە، جیهانی گیانلەبەران، جیهانی رووەك....، (ٱلْعَٰلَمِينَ ) جگە لە خوا هەموو شتێکی تر دەگرێتەوە.

( مَٰلِكِ ) خاوەن.

(يَوْمِ ٱلدِّينِ ) یوم الجزاء، رۆژی پاداشت و سزا.

(إِيَّاكَ نَعْبُدُ ) تەنها تۆ دەپەرستین (إِيَّاكَ ) مەفعولە، پێش فیعل و فاعیلەکەی کەوتووە ئەمەش مانای (حصر) دەداتەوە.

(نَسْتَعِينُ ) داواى يارمەتى دەكەين.

( اَهْدِنَا ) هيدايەتمان بدە، ڕێنماييمان بكە.

(اَلْمَغْضُوبِ ) غەزەب لىَ گيراو .

(اَلضَّآلِّينَ ) گومڕايان .

## خاڵى سێيەم

خوێندنى (فاتحة) روكنە لە هەموو ركاتێكى نوێژ بخوێنرىَ، بەلاَم لە نوێژە ئاشكراكان (الجهرية) هەندێك لە زانايان دەڵێن دەخوێندرىَ، هەندێكى تر دەڵێن ناخوێندرىَ , نوێژە ئاشكراكان مەبەست پێى ركاتى يەكەم و دووەمى نوێژى (مغرب) و (عشاء) و بەيانييە.

وە لەم ركاتى يەكەم و دووەمە تەنها (فاتحة) دەخوێندرىَ بۆ ئەوانەى كە پێيان وايە دەخوێندرىَ، دروست نيە قورئانى لە دوادابخوێنن.

## خاڵى چوارەم:

با هەموو كەسىَ هەولَ بدات (فاتحة)كەى بۆ كەسێكى زۆر شارەزا لە قورئان بخوێنێتەوە واز نەهێنىَ تا هەموو هەڵەكانى چاك دەكاتەوە، وە بەتايبەتيش ئەوانەى كە پێش نوێژى دەكەن.

## خاڵی پێنجەم:

ئیمامی شافیعی دەڵێ هەدیە کردنی خێری قورئان خوێندن ناگات بە مردوو ، وە لەدوای بانگ نابێت (فاتیحة) هەدیە بکرێ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وای نەفەرمووە، وە کاتێک بەلای قەبرستان تێدەپەڕی (فاتیحة) هەدیە ناکرێ بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی سەلامیان لێ بکەن بەو جۆرەی کە لە فەرموودەکاندا هاتووە.

## خوێندنی قورئان دوای فاتیحە لە نوێژدا

١- (جمهور العلماء) لەسەر ئەوەن کە خوێندنی قورئان سوننەتە لەدوای سورەتی (فاتحة) لە ڕکاتی یەکەم و دووەم، وەك گوتمان تەنها لە نوێژە ئاشكراكان نەبێت.

عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِنَا فَيَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا وَكَانَ يُطَوِّلُ الرَّكْعَةَ الْأُولَى مِنْ الظُّهْرِ وَيُقَصِّرُ الثَّانِيَةَ وَكَذَلِكَ فِي الصُّبْحِ .رواه مسلم (٤٥١)

واتە: ئەبو قەتادە دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بۆ دەکرین لە نیوەڕۆو عەسردا لە دوو ڕکاتی یەکەمدا سورەتی (فاتحە) و دوو سورەتی دەخوێند، وە هەندێ جار ئایەتێکی بەر گوێمان دەدا، وە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆی درێژ دەکردەوە دووەمی کورت دەکردەوە، وە هەروەها لە نوێژی بەیانیشدا هەر وای دەکرد.

٢- خوێندنی قورئان له دوای فاتحه لـه رکـاتی سـێیه‌م و چـواره‌م لـه فه‌رمووده‌ی بخاری (٧٥٩) وه مسلم (٤٥١) له ئه‌بو قه‌تاده‌وه هاتووه که پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له نوێژی نیـوه‌ڕۆو عه‌سـر لـه رکـاتی سـێیه‌م و چـواره‌م ته‌نها فاتیحه‌ی خوێندووه، به‌لاَم لـه فـه‌رمووده‌ی (مسـلم/٤٥٢) لـه ئـه‌بو سه‌عیده‌وه هاتووه کـه پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) لـه رکـاتی سـێیه‌م و چـواره‌می نیوه‌ڕۆو عه‌سر قورئانی خوێندووه.

که‌واته پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) جاری وا هه‌بووه له رکاتی سـێیه‌م و چـواره‌م قورئانی خوێندووه جاری وا هه‌بووه نه‌یخوێندووه.

جا هه‌ندێك لـه زانایـان ده‌ڵێن غالـب وابـووه کـه پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) لـه رکاتی سـێیه‌م و چـواره‌م دوای (فاتحة) قورئـانی نه‌خوێنـدووه وه هه‌نـدێ جاریش خوێندوویه‌تی، که ئه‌گه‌ر ته‌ماشای به‌ڵگه‌کانی تریش بکه‌ی بـۆت ده‌رده‌که‌وێ که ئه‌م قسه به‌هێزه.

وه ئیمامی شافیعی له یه‌کێك له ووته‌کانی فه‌رمووده‌ی ئه‌بو سه‌عیدی پێش خستووه نوێـژه‌کانی تریشـی له‌سـه‌ر قیـاس کـردووه **واته** ده‌ڵـێ سوننه‌ته له رکاتی سێیه‌م و چواره‌می نوێژی مه‌غریب و عیشاش قورئـان بخوێنرێ.

٣- له رکاتی یه‌که‌م و دووه‌می نوێژه ئاشکراکان بۆ ئه‌و که‌سـه‌ی کـه سوره‌تی (فاتحة) ده‌خوێنێ دروست نیه زیاتر له سوره‌تی (فاتحة) بخوێنێ، به‌ڵکو گوێ له قورئان خوێندنه‌وه‌ی ئیمامه‌که‌ی ده‌گرێ.

## گوتنی (آمين) دوای (فاتحة)

١- عن أبي هريرة أن النبي (ﷺ) قال: (إذا أمَّنَ الإمامُ فأمِّنُوا ، فإنَّهُ مَن وافَقَ تأمينُهُ تأمينَ الملائكةِ، غُفِرَ لَهُ ما تقدَّمَ مِن ذنبه) رواه البخاري (٧٨٠) ومسلم(٤١٠).

**واته: كاتێك ئيمام (آمين) ى گوت ئێوەش بڵێن (آمين)، بێگومان هەر يەكێك (آمين)ەكەى موافق بێت لەگەڵ (آمين)ى فريشتەكان، خوا لە گوناهی پێشووی خۆش دەبێت.**

### سوود:

**أ- كاتێك ئيمام لە نوێژە ئاشكراكان (فاتحە) دەخوێنێ سوننەتە نوێژ خوێنانی دوای ئەو (آمين) بڵێن.**

**ب- (آمين) واتە: إستجب، يانی: وەڵاممان بدەوە دوعاكەمان قەبول بكە.**

**جـ- تەنها دەگوترێ (آمين) نابێ بڵێی (آمين يا رب العالمين).**

٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : ( إِذَا قَالَ الْإِمَامُ :[ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ] ، فَقُولُوا آمِينَ ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ )رواه البخاري(٧٨١)

**واتە: كاتێك ئيمان گوتی: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ ئەوجا ئێوەش لەدوای ئەوە بڵێن (آمين)، بێگومان هەر يەكێك (آمين)ەكەى موافق بێت لەگەڵ (آمين)ى فريشتەكان، خوا لە گوناحی پێشووی خۆش دەبێت.**

# زیکرەکانی روکوع

## ١- (سبحانَ ربّيَ العظيم)

عن حذيفة قال: صَلَّيتُ مع النبيِّ(ﷺ) فكانَ يقولُ في رُكوعه: سبحان رَبّيَ العظيم، وفي سُجودِهِ: سبحان رَبّيَ الأعلى. صحيح رواه أبوداود(٨٧١) والترمذي(٢٦٢).

١- سبحان رَبّيَ العظيم: **پاك و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری گەورەم.**

٢- سبحان رَبّيَ الأعلى: **پاك و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم.**

**واتە:** حذيفة **(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد لە رکوعدا دەیفەرموو**(سبحان رَبّيَ العظيم) **وە لە سەجدەدا دەیفەرموو**(سبحان رَبّيَ الأعلى).

٢- عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ . رواه مسلم (٤٨٧)

**واتە: عائشە رەزای خوای لێبێت، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە روکوع و سەجدەدا دەیفەرموو (سُبُّوحٌ [١]، قُدُّوسٌ [٢]، رَبُّ الملائكةِ وَالرُّوح) واتە: زۆر پاك و بێ گەردە ، پەروەردگاری فریشتەکان و جوبرائیل.**

---

(١) سبوح: المبرأ من القصاص والشريك وكل ما لا يليق بالإلاهية.

(٢) قدوس: پاك و بیگەرد.

٣- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي . رواه البخاري(٧٩٤)ومسلم(٤٨٤)

**واته: عائشه دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) له ركوع و سەجدەدا دەیفەرموو (سُبْحانكَ اللهمَّ ربنا وَبِحَمْدِكَ، اللهم اغْفِرْ لي) واتة: ئەی خودایه به پاكت دەگرم پەروەردگارمان ستایشت دەكەم، ئەی خوایه لێم خۆش به.**

٤- عن عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ قُمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً فَلَمَّا رَكَعَ مَكَثَ قَدْرَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ . صحيح : رواه ابوداود(٨٧٣)والنسائي(١٠٤٩)

**واته: عەوفی كوڕی مالیك دەڵێ: شەوێكیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا هەستام، جا كاتێك كه چووه ركوع بەقەد خوێندنی سوورەتی (بقره) له ركوعەكەیدا مایەوەو دەیفەرموو(سبحان ذي الجبروت[1]، والملكوت والكبرياء[2]، والعظمة) واته: پاكی بۆ خوای خاوەنی گەورەیی و دەسەڵات -بەسەر هەموو شتێكدا- وه خاوەنی گەورەیی و مەزنایەتی.**

(١) الجبروت: الكبير، يانى (العظمة) گەورەیی.

(٢) الكبرياء: العظمة، گەورەیی ، مەزنی.

٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا رَكَعَ قَالَ : (اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلكَ أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي ). رواه مسلم (٧٧١)

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵب دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بچووبا روکوع دەیفەرموو: (**اللهُمَّ لكَ ركَعْتُ، وبكَ آمنتُ، ولك اسْلَمتُ، خشعَ لكَ سَمعي وبَصري ومُخي وعَظْمي وعَصَبي**) واتە: ئەی خودایە بۆ تۆ چەمیمەوە، وە بەتۆ بڕوام هێنا، وە تەسلیمی تۆ بووم، بیستنم و دیتنم و بۆخم و ئێسقانم و دەمارم بۆتۆ گەردن کەچن.

**سوود**:

سوننەتە لە روکوعدا یەکێك لە زیکرەکانی روکوع بخوێندرێن، وە پەسەند نییە لەیەك کاتدا لە روکوع و سەجدەدا دوو جۆر یان زیاتر لە زیکرەکانی روکوع و سەجدە پێکەوە کۆ بکرێنەوە، وە هەوڵیش بدە تەنها یەك زیکر نەخوێنی بەڵکو هەر جارەو زیکرێك بخوێنە.

(نووی) لە کیتابی (الأذکار) دا دەڵێ: (ولكن الأفضل أن يجمع بين هذه الأذكار كلها إن تمكن...) واتە: نەوەوی لە باسی زیکرەکانی روکوعدا دەڵێ: باشتر وایە هەموو زیکرەکان بخوێنێ ئەگەر بۆی کرا , بەلأم بۆ ئەم قسەی بەڵگە نییە , وە دەڵێ: زیکرەکانی روکوع خوێندنیان سوننەتە ، بەلأم ئیمام ئەحمەدو هەندێکی تر دەڵێن واجبە.

## هەستانەوە لە روکوع (الاعتدال)

١- عن أبي هريرة أنه قال: كان رسول الله (ﷺ) يقولُ: سمع الله لِمَن حَمِده حين يَرفَعُ صُلْبَهُ من الركوع، ثم يقول وهو قائمٌ، ربنا ولك الحمد) رواه مسلم (٣٩٢).

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەوکاتەی کە پشتی بەرز دەکردەوە لە رکووع دەیفەرموو (سمع الله لِمَنْ حمده) لە پاشان دەیفەرموو لەکاتێکدا کە دەوەستا (ربّنا ولك الحمد).

**سوود**: (سمع الله لِمَنْ حمده، ربّنا ولك الحمد)

واتە: هەر کەسێك ستایشی خوا بکات خوا دەیبیستێ و لێی وەردەگرێ، وە ئەی پەروەردگارمان سوپاس بۆ تۆیە.

٢- (ربَنا ولك الحمد) بەسێ جۆری تریش هاتووە.

أ- (ربّنا لك الحمد) مسلم (٤٧٧).

ب- (أللهم ربنا ولك الحمد) بخاري (٧٩٥).

جـ- (أللهم ربنا لك الحمد) بخاري (٧٩٦).

٢- عن رِفاعةَ بنِ رافعٍ الزرقِيِّ قال: كُنّا يوماً نُصلّي وراءَ النبيِّ صلى الله عليه وسلم، فلما رفع رأسَه مِن الركعة، قال: (سمع الله لمن حمده). قال رجل وراءه: ربنا ولك الحمد، حَمداً كثيراً طيِّباً مُباركاً فيه. فلمَّا انْصَرفَ، قال: (مَن المتَكَلِّمُ). قال: أنا، قال: (رأيتُ بِضْعَةً وثلاثينَ مَلكاً يَبْتَدِرُونها، أيُّهم يَكْتُبُها أوَّل). رواه البخاري (٧٩٩)

واتە: ریفاعەی کوڕی نافع دەڵێ: ڕۆژێکیان نوێژمان لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد کاتێك سەری بەرز کردەوە لە رکووع فەرمووی: (سمع الله لمن حمده) پیاوێك لە دوایەوە فەرمووی (ربنا ولك الحمد، حَمداً کثیراً طیِّباً مُبارکاً فِیهِ) جا کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ئەوە کێ بوو ئەم قسەی کرد، پیاوەکە ووتی من، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سیوو ئەوەندە فریشتەم بینی پێشبڕکێیان دەکرد کامیان یەکەم کەس بینووسێتەوە.

**سوود:**

(حمداً کثیراً طیبا مبارکا) واتە: ستایشێکی زۆرو پاك و چاك و بە بەرەکەت.

٣- عن ابن عباس أن النبي (ﷺ) کان إذا رفع رأسَهُ من الرکوع قال: (أللهم ربنا لك الحمد مِلْءَ السَّموات ومِلْءَ الأرض وما بینهما ومِلْءَ ما شئتَ مِنْ شيءٍ بَعدُ) رواه مسلم (٤٧٨).

واتە: (ابن عباس) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە سەری بەرز دەکردەوە لە روکوع دەیفەرموو: (أللهم ربنا لك الحمد مِلْءَ السَّموات ومِلْءَ الأرض وما بینهما ومِلْءَ ما شئتَ مِنْ شيءٍ بَعدُ) .

واتە: ئەی خوایە پەروەردگارمان ستایش بۆ تۆیە پڕ بە ئاسمانەکان و پڕ بە زەوی وە (پڕ) بەوەی کە لە نێوانیاندا هەیە، وە پڕ بە هەر شتێکی دیکە کە بتەوێ.

**سوود**: ئەم زیکرە بەچەند شێوەیەکی دیکەش هاتووە:

١- (مِلْءَ السماوات وملْءَ الأرض، ومِلْءَ ما شئت من شيء بعد) رواه مسلم (٤٧٦).

٢- مِلْءَ السَّموات وملْءَ الأرض وما بينهما ومِلْءَ ما شئتَ مِنْ شئ بَعدُ، أهلُ الثَّناءِ وَالمجْد، لا مانعَ لِما أَعْطَيتَ ولا مُعطيَ لِما مَنَعْتَ ولا يَنْفعُ ذا الجَدِّ منكَ الجَدُّ،

(أهلُ الثَّناءِ وَالمجْد )واتە: ئەی خاوەنی مەدح و سەناو پایەی بەرز (لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجدّ)، واتە: ئەی خوایە هیچ ڕێگرێك نییە لەوەی کە دەیبەخشی , وە هیچ کەسێکیش ناتوانێ شتێك ببەخشێ لەوەی کە تۆ نایدەی , وە ماڵ و سامانی هیچ خاوەن ماڵێك لە بەرامبەر دەسەڵاتی تۆدا سوودی پێ ناگەیەنێ.

٣- مِلْءَ السَّموات وملْءَ الأرض وما بينهما ومِلْءَ ما شئتَ مِنْ شيء بَعدُ، أهل الثناء والمجد، أحَقُّ ما قال العبدُ وكُلُّنا لكَ عبدٌ، أللهم لا مانعَ لما أعْطيتَ، ولا مُعطيَ لما مَنْعتَ ولا يَنفعُ ذا الجَدِّ منكَ الجَدُّ، رواه مسلم (٤٧٧).

**پرسیارێك**: ئایا ئەگەر تۆ پڕ بە ئاسمانەکان و پڕ بە زەوی و ئەوەش کە لە نێوانیاندا هەیە وە پڕ بە هەر شتێکی دیکە کە خوا بیەوێ ستایشی خوا بکەی ئایا دەبێ پاداشتەکەی چەند گەورە بێت، جا بۆیە هەوڵ بدە یەکێك لە جۆرەکانی ئەم خاڵی سێیەمە لە کاتی هەستانەوەت لە رکوعودا بخوێنی.

## چەند ڕوونکردنەوەیەك:

١- سوننەتە لەو کاتەی سەرت بەرز دەکەیەوە لە ڕکوع بۆ (إعتـدال) دەستەکانیشت بەرز بکەیەوە.

٢- ئارام گرتن (الإطئنان) فەرزە لە ڕاوەستانی دوای ڕکوع، پێغەمبـەر (ﷺ) بەکەسێکی ووت کە نوێژەکەی بـەناڕێکی کـرد فـەرمووی: (ثم أرفع رأسك حتى تعتدل قائماً فيأخذَ كُلُّ عَظمٍ مأخَذَهُ).

واتـە: لـە پاشـان سـەرت بـەرز بکـەوە تاڕێـك ڕادەوەسـتی و هـەموو ئێسقانێك دەچێتەوە شوێنی خۆی، جا دیـارە ئەمـەش بـەبێ ئـارامگرتن (طمأنينة) نایەتەدی.

٣- پێغەمبەر (ﷺ) زۆر لە ڕاست بوونـەوەی دوای ڕکـووع دەمایـەوە بە قەد نزیکی مانەوەی لە سەجدەکەیدا.

عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ إِنِّي لَا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِنَا قَالَ ثَابِتٌ كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ يَصْنَعُ شَيْئًا لَمْ أَرَكُمْ تَصْنَعُونَهُ كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ قَامَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ ) رواه البخاري(٧٨٧) ومسلم (٤٧٢).

واتە: سابتی بونانی دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالك گوتی: من نوێژ کورت ناکەمەوە کاتێك کە پێش نوێژیتان بۆ دەکەم (بەم شـێوەیە نوێـژتان بـۆ دەکەم) هەروەکو بینیومە پێغەمبەر (ﷺ) پێش نوێژی بۆ ئێمە کردووە، جا سابت دەڵێ: ئەنەس شتێکی دەکرد ئێوە نابینم ئەوە بکـەن، کاتێـك سەری بەرز بکردبایەوە لە ڕکوع ئەوەندە زۆر دەوەستا تاوەکو دەوتـرا

دەبێ لەبیری نەچوبێتەوەو لێی تێك نەچووبێت، وە لە دانیشتنی نێوان سەجدەكان ئەوەندە دەمایەوە تاوەكو قسەكار دەیگوت لەبیری كردووە.

٤- نەوەوی لە كتێبی (الاذكار) دا دەڵێ: (إعلم أنه يستحبُّ أن يجمع بين هذه الأذكار كلها) واتە: بزانە سوننەتە كە ئەم زیكرانەی (إعتدال) هەمووی بەیەك جاریش بڵێی، وە دەشڵێ ئەم زیكرانە هەموویان سوننەتن.

كەواتە دەتوانی تەنها بڵێی (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) وە دەشتوانی ئەمەی بۆ زیاد بكەی (حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه) وە دەشتوانی ئەمەشی بۆ زیاد بكەی (مِلْءَ السَّموات ومِلْءَ الأرض وما بينهما ومِلْءَ ما شئتَ مِنْ شيء بَعدُ) یان یەك لە جۆرەكانی تری ئەم زیكرە، بەڵام لە نوێژی جەماعەت لەوانەیە تەنها بتوانی لەگەڵ (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) یەكێك لە زیكرە كورتەكان بخوێنی.

## زیكرەكانی كڕنۆش(سجدة)

١- عن حذيفة قال: صليت مع النبيّ (ﷺ) ذات ليلة .... وفيه: ثُمَّ سجدَ فقالَ: (سبحان ربّيَ الأعلى) رواه مسلم (٧٧٢).

واتە: حوزەیفە دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژم كرد (لە درێژەی فەرموودەكە ئەوەی تیادایە كە دەڵێ) لە پاشان سەجدەی برد فەرمووی: (سبحان ربّيَ الأعلى) واتە: پاكی و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم*

٢- (سُبّوحٌ قُدُّوس، ربُّ الملائكة والرّوح).

٣- (سبحانك اللهم، ربّنا وبحمدك، أللهم اغْفر لي).

**تێبینی:**

**مانای ئەم دوو زیکرە لە باسی زیکرەکانی روکوع باس کراوە لەگەڵ دوو فەرموودەکە جا کەمێك بگەڕێوە بۆ دواوە مانای زیکری چوارەمیش کە لەدوای ئەمە دێت ئەویش لە باسی زیکرەکانی روکوع لێکدراوەتەوە.**

٤- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ قَالَ قُمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً فَقَامَ فَقَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ لَا يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ فَسَأَلَ وَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ فَتَعَوَّذَ قَالَ ثُمَّ رَكَعَ بِقَدْرِ قِيَامِهِ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ قِيَامِهِ ثُمَّ قَالَ فِي سُجُودِهِ مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ بِآلِ عِمْرَانَ ثُمَّ قَرَأَ سُورَةً سُورَةً. صحيح :رواه ابوداود (٨٧٣).

**واتە: عەوفی کوڕی مالیك دەڵێ: شەوێکیان هەستام لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نوێژکردن، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا سورەتی (بقرة)ی خوێند، بەسەر هیچ ئایەتێکی رەحمەت تێنەدەپەڕی ئیللا دەوەستاو داوای دەکرد، وە بەسەر هیچ ئایەتێکی عەزاب تێنەدەپەڕی ئیللا دەوەستاو پەنای دەگرت و خۆی دەپاراست (بەخوا) جا دەڵێ: لە پاشان رکوعی برد بەقەد ماوەی**

**وەســـتانەکەی و لــە رکوعەکــەی دەیفــەرموو:** (سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة) **لــە پاشــان ســەجدەی بــرد بەقــەد مــاوەی وەستانەکەی لە پاشان لە سەجدەکەی وەکو روکوعەکـەی گـوت (واتـە:** سبحان ذي الجبروت.....) **لە پاشان هەستاوە لە رکاتی دووەم سورەتی** (آل عمران)**ی خوێند، لەپاشان سورەت سورەتی دەخوێند.**

٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَجَدَ قَالَ اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ . رواه مسلم (٧٧١)

**واتــە: عــەلی رەزای خــوای لــێ بێــت دەڵــێ: کاتێـك کـە پێغەمبــەر (ﷺ) سەجدەی ببردایە دەیفەرموو:** (أللهمَّ لكَ سَجدتُ وبِكَ آمنتُ، ولكَ أسْلمتُ، سجدَ وجْهي لِلذي خَلَقَهُ وصَوَّرَهُ، وشَقَّ سَمْعَهُ وبصرهُ تبارك اللهُ أحسنُ الخالِقين).

**واتە: ئەی خودایە بۆتۆ سەجدەم برد، وە بە تۆ ئیمانم هێنـا، وە گـەردن کەچی تۆ بووم، رووی من کڕنۆشی برد بۆ ئەوەی کە دروسـتی کـردووەو وێنەی کێشاوە، وە بیستن و بینینی تیادا رەخساندوون، بەرزو پایـەدارە ئەو خوایەی کە باشترینی بەدیهێنەرانە.**

٦- عَنْ هِلَالِ بْنِ يَسَافٍ قَالَ قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ مَضْجَعِهِ فَجَعَلْتُ أَلْتَمِسُهُ وَظَنَنْتُ أَنَّهُ أَتَى بَعْضَ جَوَارِيهِ فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَيْهِ وَهُوَ سَاجِدٌ وَهُوَ يَقُولُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ. **صحيح : رواه النسائي (١١٢٤).**

**واتـە: هیلالـی کـوڕی ییسـاف دەڵـێ: عائشـە ڕەزای خـوای لـێ بێـت فەرموویەتی: بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕام لەناو جێگای نوستنەکەیدا وە وا گومانم برد کە ئەو چووەتە لای هەنـدێك لـە خێزانـەکانی، جـا دەسـتم بۆی گێڕا دەستم پێی کەوت لەو کاتەدا ئەو لە سەجدەدابوو دەیفـەرموو:** (أللهم اغْفر لي ما أسْرَرْتُ وما أعلنتُ) **واتـە: ئـەی خودایـە لـە گوناحـەکانم خۆش بە ئەوەی کە شاردوومەتەوە، وە ئەوەش کە ئاشکرام کردووە.**

٧- عـن أبـي هريـرة أنّ رسـولَ الله (ﷺ) كـان يقـولُ فـي سُـجودِهِ: (أللهم اغفر لي ذَنبي كُلَّهُ، دِقَّهُ وجِلّهُ، وأوّلهُ وآخِرهُ، وعلانيتهُ وسِرَّهُ) رواه مسلم (٤٨٣) وأبو داود (٨٧٨).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لە سەجدەکانی دەیفەرموو:** (أللهم اغفر لي ذَنبي كُلَّهُ، دِقَّهُ وجِلّهُ، وأوّلهُ وآخِرهُ، وعلانيتهُ وسِرَّهُ) **واتـە: ئـەی خودایـە لەهـەموو گوناحەکانم خۆش بە، لە گچکەو گەورەی، وە لە ئی پێشێ و دوایـێ، وە لە ئاشکراو پەنهانی.**

٨- عـن عائشـة قالـت: فقـدتُ رسـولَ الله (ﷺ) ليلـة مـن الفـراش فالْتمسـتُهُ فَوقعـتْ يَـدي علـى بطـنِ قدميـهِ وهـوَ فـي المسـجد وهمـا منصوبتان وهو يقولُ: (أللهم أعوذُ بِرِضاكَ مِنْ سَخَطِكَ وبِمُعافاتِكَ من عقوبتِكَ، وأعوذ بِك منك لا أُحصي ثناءً عليك أنت كما أثْنَيْتَ على نفسك) رواه مسلم (٤٨٦).

**واتـە: عائشـە ڕەزای خـوای لـێ بێـت، دەڵـێ: شـەوێکیان پێغەمبـەر (ﷺ)، لەناو جێگای نووستندا نەمابوو، جا دەستم دایێ، دەستم کەوتـە**

سەر بنی پێیەکانی کە لەو کاتەدا لە مزگەوت بوو وە پێیەکانیشی چەقێندرابوون وە دەیفەرموو: (**اللهم أعوذ برضاك من سخطك، وبمعافاتك من عقوبتك، واعوذ بك منك، لا احصی ثناء علیك انت كما اثنيت على نفسك**).

واتە: ئەی خوایە من خۆم دەپارێزم و پەنا دەگرم بە رەزامەندیت لە تووڕەییت، وە بە سەلامەت کردنت لە سزات، وە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە تۆ، من ناتوانم بەو شێوەی کە خۆت مەدح و سەنای خۆت کردووە، (مـن بەم شێوە) مەدح و سەنات بکەم.

## ڕوونکردنەوە:

١- زانایان خیلافیان هەیە لەوەی ئایا کە دەچی بۆ سەجدە یەکەم جار دەستت دادەنێی یان چۆکت (ابن القیم) دەڵێ: (وكان (ﷺ) يضع ركبتيه ثم يده ثم جبهته وأنفه هذا هو الصحيح) [1].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك چووەتە سەجدە یەکەم جار چۆکەکانی لە زەوی داناوە لە پاشان دەستەکانی لە پاشان نێو چەوان و کەپووی هەر ئەوەش راستە. بەلام ئەلبانی دەڵێ یەکەم جار دەستەکانت دادەنێی ئەوجا چۆکت , جا ئەگەر تەماشای رووکەشی فەرموودە بکەی ئەوە قسەی ئەلبانی بەهێزتر دەبینرێ .

٢- ئارام گرتن (إطمئنان) لەسەجدەدا فەرزە، بۆیە پێویستە ماوەیەك تێیدا بمێنیتەوە تا لەشی لە جوولە دەوەستێت.

---

(١) صحيح، رواه أبو داود (١٧) وأحمد (٢٠٢٣٧).

**٣- دەبێ لەکاتی سەجدەدا کەپوشت لەسەر زەوی دابنێی ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ (لا صلاة لمَنْ لا يصيبُ أنْفُهُ من الأرضِ ما يصيبُ جَبينهُ)[1].**

## دوعاکردن لە سەجدەدا

١- عن أبي هريرة أَن رسول الله(ﷺ) قال: أقربُ ما يكونُ العبدُ مِن ربِّهِ وهو ساجدٌ فأكْثِروا الدُّعاءَ. رواه مسلم(٨٤٢) وأبوداود(٨٧٥).

**واتە: نزیکترین حاڵەتی بەندە لە پەروەردگاریەوە کاتێکە کە سەجدەی بردووە، جا لەو حاڵەتەدا زۆر بپارێنەوە.**

**سوود:**

**١- دەتوانی لە نوێژە فەرزەکان و لە نوێژە سوننەتەکاندا دوعا لە سەجدە بکەی .**

**٢- لە سوننەتدا نەهاتووە لە غەیری نوێژدا سەجدەیەك بەتەنیا ببەی و دوعای تیادا بکەی**

## تەحییات و سەڵەوات خوێندن لە نوێژدا

عن عبدالله قال: كُنّا نقولُ في الصّلاة خَلفَ رسولِ اللهِ(ﷺ) السلام على الله السلام على فلان، فقال لنا رسول اللهِ(ﷺ) ذاتَ يومٍ: إنَّ الله هو السَّلامُ فإذا قَعَدَ أحدُكم في الصّلاةِ فَلْيَقُلْ: التَّحيّاتُ للهِ

---

(١) صحيح، صفة الصلاة للألباني، ١٢٣.

والصَّـلَواتُ والطَّيِّبـاتُ السـلامُ عليـكَ أَيُّهـا النبـيُّ ورحمـة الله وبركاتـهُ السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين(فإذا قالها أصابَت كُلَّ عبدٍ للهِ صالحٍ في السّماء والارض) أشْهَدُ أن لا إله إلا الله وأشهدُ أنّ محمداً عبدُهُ ورسُلُهُ(١)، رواه البخاري(٨٣٠) ومسلم(٤٠٢).

**واتـە: عبـدالله كـوڕی مەسـعود(ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەڵـێ: ئێمـە لەکاتی خۆی لە ناو نوێژدا لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) دەمانگوت سەلام لـە خوا سەلام لە فلان، جا پێغەمبـەر(ﷺ) ڕۆژێکیـان پێـی فـەرمووین: بـێ گومان خودا خۆی ناوی(سلام)ە جا کاتێك یەکێك لە ئێوە دانیشت لە ناو نوێژدا بۆ خوێندنی تـەحییات بـا بڵـێ** (التَّحيّاتُ للهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ السلامُ عليكَ أَيُّها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين) **جا کاتێك ئەمەی گوت واتە**(السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين) **سلاوەکەی بەر هەموو بەندەیەکی چاکی خودا دەکـەوی لـە ئاسمـان و لـە زەویدا،** أشهد أن لا اله الا الله وأشهدُ أَنَّ محمداً عبدهُ ورسوله.

## سوود:

**١–ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە کـە دەڵـێ**(السلام على فلان) **ئـەوە سەلام کردن بووە لە فریشتە.**

**٢– ئەم تەحییاتەی باس کرا بەهێزترین تەحییاتە لـەڕووی سـەنەدەوە کە بەم شێوەیە:**

**التَّحيّاتُ للهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ السلامُ عليكَ أَيُّها النبيُّ**

(١) سەر لە فەرمووده صەحیحەکان بدە ١٤٣–١٤٤، بە ماناوەیە لەگەڵ سوودەکەش.

**ورحمـةُ اللهِ وبركاتـهُ السـلامُ علينـا وعلـى عِبـادِ اللهِ الصَّـالحينَ أشهدُ أن لا اله الا الله وأشهدُ أَنَّ محمداً عبدُهُ ورَسُولُه.**

٢- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنْ الْقُرْآنِ فَكَانَ يَقُولُ (التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ). **رواه مسلم (٤٠٣)**

**واته: (ابن عباس) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) تەحیاتی فێر دەکردین هەروەکو چۆن سورەتێکی لە قورئاندا فێـر دەکـردین دەیفـەرموو:** (التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله.

## مانای تەحییات (تشهد)

**(تحيات) كۆی (تَحِيَّة) يە، (وهي ما يُحَيَّ بِهِ من قولٍ أو فعلٍ) جا (تحية) هەر قسەو كردەوەیەكە كە سڵاوی پێ دەكرێ.**

(التحيات لله) **واته:(التعظيم لله) هەموو بە گەورە گرتنێك بۆ خوایە**

**(التحيات) جمع تحية ، والتحية :التعظيم ،و(ال) في التحيات تفيد العموم ،فكل نوع من أنواع التحيات لله .**

(والصلوات والطيبات) **وە هەروەها هەموو نوێژو پاڕانەوەو پاكی.(والصلوات) أي كل الصلوات فرضها ونفلها ، وكل الادعية ، وليست حق لاحد سوى الله .(الطيبات) قال (ابن حجر) في (الفتح) الاعمال الصالحة .**

(السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته)**سەلامت لەسەر ئەی پێغەمبەر وە بەزەیی و بەرەکەتی خوات بڕژێتە سەر.(وبركاته)جمع البركة وهي الخير الكثير الثابت ،خێری زۆرو جێگیرو بەردەوام**

(السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين)

**سەلام لەسەر ئێمەو لەسەر بەندە باشەکانی خوا (السلام علينا) اي على الحاضرين من الامام والماموم والملائكة ، وقيل :المراد السلام على جميع الامة المحمدية (وعلى عباد الله الصالين) وهم كل عبد صالح حيّ او ميَت في السماء والارض من الادميين والملائكة والجن)**

(أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله)

**شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو نێرراوی خوایە.**

**٣- پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر تەحییاتی یەکەمی لەبیر کردبایە سەجدەی سەهوی بۆ دەبرد.**

**٤- وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نوێژەکەی دوو رکاتبا لە تەحییات خوێندن بە شێوەی (إفتراش) دادەنیشت، وە هەر بەم شێوەیەش دادەنیشت لە تەحییاتی یەکەمی نوێژە سێ رکاتی و چوار رکاتیەکان، بەلاّم ئەو نوێژانەی دوو تەحیاتیان تێدایە لە تەحییاتی کۆتایی بەشێوەی (تورك) دادەنیشت، ئەمەش مەزهەبی ئیمام ئەحمەدە.**

## چەند ڕوونکردنەوەیەك

١- جگە لەم دوو تەحییاتەی کە نووسیومانە ئی تریش هەن بە سەحیحی هاتوون بەڵام ئەم دووە زۆر بەناوبانگن وە هەروەها لە رووی سەنەدەوەش زۆر بە هێزن.

٢- (جمهور) لەسەر ئەوەن کە تەحییاتی یەکەم سوننەتە ، وە خوێندنی تەحییاتی کۆتایی روکنە ئەگەر نەخوێندرێ نوێژەکە دروست نییەو بەتاڵە .

## صەلەوات دان لەسەر پێغەمبەر دوای خوێندنی تەحییات

١- عن عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى قَالَ لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ أَلَا أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً سَمِعْتُهَا مِنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ بَلَى فَأَهْدِهَا لِي فَقَالَ سَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ عَلَّمَنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكُمْ قَالَ قُولُوا : (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ).

واتە: (عبدالرحمن بن أبی لیلی) دەڵێ: کەعبی کوڕی عوجرەم پێ گەیشت گوتی: ئایە دیارییەکت پێشەکەش نەکەم کە لە پێغەمبەری خوام بیستووە؟ گوتم بەڵێ پێشکەشم کە، ووتی: پرسیارمان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا چۆن صەلەوات لەسەر تۆ و ئال و بەیت بدەین ، بێ گومان خوا فێری کردووین چۆن سەلامتان لێ بکەین، فەرمووی بڵێن: (أللهم صل علی محمد وعلی آل محمد، کما صلیت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم إنك حمید مجید أللهم

**بارك على محمد وعلى آل محمد كما بارطت على إبراهيم وعلى آل ابراهيم إنك حميد مجيد)**.

## ماناى (صلوات)

قال البخاري: قال أبو العالية: صلاة الله ثنائه عليه عند الملائكة، **واتــه: صــەڵەواتی خـوا لەســەر پێغەمبــەر بـاس کردنیـەتی بەچـاکە لـەلای مەلائیکەتە نزیکەکانی.**

**وە هەنـدێکیش گوتوویانــە:** (صَلِّ) : (أي إرحمه رحمةً مقرونةً بالتعظيم) (إعانة الطالبين)

**واتە: صەڵەواتی لیٚ بدە، یانی رەحمی پیٚ بکە بە رەحمـەتێك کـە بـە گەورە گرتنی لەگەڵدا بێت.**

**کەواتە ئەگەر ئەم دوو پێناسە تێکەڵ بکەین مانـای ئـەم صـەڵەواتەی کە لە فەرموودەکە باس کرا بەم شێوەی لیٚ دێت.**

**ئەی خودایە مەدح و بەزەیی و رێزگرتنت برێـژە بـۆ سـەر موحەمـەدو شوێنکەوتووانی موحەمەد، هەروەکو چۆن مەدح و بـەزەیی و رێزگرتنـت رژاندۆتە سەر ئیبراهیم و شوێن کەوتووانی ئیبراهیم، بێگومان تۆ سوپاس کراوو پایە بەرزی.**

**ئەی خودایە پێت و بەرەکەت برێژە بەسەر موحەممەدو شـوێن کـەوتوانی موحەممەد، هەروەکو چۆن پیت و بەرەکەتت رژاندۆتە سەر ئیبراهیم و شـوێن کەوتوانی ئیبراهیم، بیٚ گومان تۆ سوپاس کراوو پایە بەرزی.**

(أما الصلاة على النبي عند (جمهور العلماء)من الله الرحمة)

**سوود**:

(آل) **هەر جارێك لە قورئاندا هـاتبێ مەبەسـت پێـی شـوێن كەوتووانـە (أتباع) , بەلاّم** (أهل البيت) **دوو جار لـە قورئانـدا هـاتووە لـە سـوورەتی** (هود/٧٣) وە (الأحزاب/٣٣) **كە لە هەردوو شوێن مەبەست پێی هاوسەرو خێزانە، جا جیاوازی زۆر هەیە لـە نێـوان** (آل) و (أهل البيت) (آل) **واتـە: شـوێن كـەوتووان (أتبـاع) وە (أهـل البيـت) واتـە:** (الزوجة والذرية) **یـانی: خێزان و وەچە، جا بۆیە لـە مانـای صـەڵەواتەكە مانـای** (آل) **بـە شـوێن كەوتووان** (أتباع) **لێكدراوەتەوە.**

## ئەمەش چەند جۆرە صەلەواتی ترن کە لە پێغەمبەر (ﷺ) ڕیوایەت کراون

**١- (اللهم صل على محمد وعلى آل محمد، كَمَا صليت على ابراهيم إنك حميد مجيد اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم إنك حميد مجيد)**، صحيح رواه الترمذي (٤٨٣).

**سوود**:

ئەم فەرموودەیە لە سونەنی (ابن ماجه) شدا هاتووە بە ژمارە (٩٠٤) بەڵام لەویٚ لە جیاتی (وبارك على محمد) دەڵێ (اللهم بارك على محمد)

**٢- (اللهم صل على محمد وعلى آل محمد، كما صليت على آل ابراهيم إنك حميد مجيد , اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على آل ابراهيم إنك حميد مجيد)** رواه البخاري (٤٧٩٧) ومسلم (٤٠٦).

**٣- (اللهم صل على محمد وعلى أزواجِه وذُرِّيَّتِه، كَمَا صلَّيتَ على آلِ ابراهيمَ وباركْ على محمد وعلى أزواجه وذريته كَمَا باركْتَ على آل إبراهيم إنكَ حَميدٌ مجيد)** رواه مسلم (٤٧).

**٤- (اللهم صل على محمد وعلى آل محمد، و بارك على محمد وعلى آل محمد كما صليت وباركت على إبراهيم وعلى آل ابراهيم إنك حميد مجيد)**[١].

(١) صفة الصلاة للألباني، ١٦٧.

## چەند روونكردنەوەیەك

١- هەر یەكێك لەم جۆرە سەڵەواتانەی كە باسمان كرد دەتوانی لە ناو نوێژدا یا لە دەرەوەی نوێژ بیڵێ، وە دەشتوانی هەر جارەو یەكێكیان بخوێنی.

٢- لای ئیمامی شافیعی سەڵەوات لە دوای تەحییاتی كۆتایی واجبە، هەر یەكێك نەیخوێنێ نوێژەكەی درووست نیە، بەلاَم سەڵەوات لەدوای تەحییاتی یەكەم جەماوەری زانایان (جمهور) پێیان وایە سوننەت نییە.

(عبدالعظیم بدوی) لە (الوجیز) لە لاپەڕە (١١٧) دا دەڵێ سوننەتە سەلأوات لێ دان لەدوای خوێندنی تەحییاتی یەكەم.

## زیكری پێش سەلام دانەوە

١- عن أَبِي أُمَامَةَ قَالَ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ قَالَ جَوْفَ اللَّيْلِ الْآخِرِ وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ .

حسن: رواه الترمذي (٣٤٩٩)

واتە: لە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار كرا كام پاڕانەوە نزیكترە بۆ قەبول بوون؟ فەرمووی: ناوەندی نیوەی شەوی دووەم، وە هەروەها دوای نوێژە فەرزەكان (واتە پێش سەلام دانەوە).

**سوود**:

١- ناوەندی نیوەی شەوی دووەم: واتە ئەگەر شەو بكەی بە دوو بەش، ناوەندی بەشی كۆتاییەكەی.

٢- ودبر الصلوات المكتوبات: زۆربەی زانایان دەڵێن ئەمە پێش

سەلام دانەوەیە نەك دوای سەلام دانەوە .

٣- کەواتە دوعا لە دوای تەحییات و سەڵەوات پێش سەلام دانەوە سوننەتەو نزیکترە بۆ قەبوڵ بوون.

٤- (ابن التیمیة) دەڵێ: پێغەمبەر و نوێژ خوێنەکانی سەردەمی ئەو لەدوای پێنج نوێژە فەرزەکان دوعایان نەکردووە.

٥- وە موسڵمانان جائزە لەدوای نوێژە فەرزەکان لەبەر خۆیەوە بەتەنیا بپاڕێتەوە بە مەرجێك نەیکاتە عادەتێکی بەردەوام.

٦- (عثیمین) دەڵێ: دوعاکردن بە بەردەوامی لەدوای نوێژە فەرەکان و سوننەتەکان سوننەت نییە بەڵکو بیدعەیە (وأما فعله أحياناً فأرجو أن لا يكون به بأس) بەلاّم ئەگەر هەندێ جار کردی ئومێدم وایە کە هیچی تیادا نەبێت.

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إِذا تَشَهَّدَ أحَدُكُمْ فَلْيَستَعِذْ بالله مِنْ أَرْبَعٍ، يقول: أللهُمَّ إنّي أعوذ بك مِنْ عذابِ جَهَنَّمَ ومن عذابِ القَبرِ ومن فِتنَةِ المحْيا والمماتِ ومِنْ شَرِّ فِتنَةِ الْمَسيحِ الدَّجالِ. رواه البخاري(١٣٧٧) ومسلم(٥٨٨).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە تەحییاتی خوێند با خۆی بپارێزێ بە خوا لە چوار شت بڵێ:( أللهُمَّ إنّي أعوذ بك مِنْ عذاب جَهَنَّمَ ومن عذابِ القَبرِ ومن فِتنَةِ المحْيا والممات ومن شَرِّ فِتنَةِ المسيح الدَّجّالِ) واتە: ئەی خوایە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە عەزابی دۆزەخ وە لە عەزابی قەبر وە لەبەڵای ژیان و مردن وە لە خراپەی بەڵای مەسیحی دەججال.

٢- عن أبي بكرٍ الصِّدّيق(رضي الله عنه) أنَّهُ قالَ لِرَسول اللهِ(ﷺ) عَلِّمني دُعاءً أدعوا بِهِ في صلاتي قال: قل:(أللهم إنّي ظلمتُ نفسي ظلماً كثيراً ولا يَغْفِرُ الذّنوبَ إلاّ أنت فاغْفِر لي مَغفِرةً مِنْ عندك وارْحمني إنَّكَ أنت الغفور الرَّحيم) رواه البخاري(٨٣٤) ومسلم(٢٧٠٥).

**واته: ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێ بێت) بە پێغەمبەری فەرموو (ﷺ) پاڕانەوەیەکم فێر بکە کە لە ناو نوێژکەمدا بیڵێم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڵێ:**(اللهم إنّي ظلمتُ نفسي ظلماً كثيراً ولا يَغْفِرُ الذّنوبَ إلاّ أنت فاغْفِر لي مَغفِرةً مِنْ عندك وارحمني إنَّكَ أنت الغفور الرَّحيم)

**واته: ئەی خودایە من ستەم و زوڵمێکی زۆرم لە خۆم کردووە جگە لە تۆش هیچ کەس نییە لە گوناحان خۆش بێت، جا لێم خۆش بە بە لێخۆشبونێکی تایبەت لەلایەن خۆتەوە وە ڕەحمم پێ بکە بێگومان هەر تۆی لێبوردەی بە بەزەیی.**

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِرَجُلٍ مَا تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ قَالَ أَتَشَهَّدُ ثُمَّ أَسْأَلُ اللَّهَ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِهِ مِنْ النَّارِ أَمَا وَاللَّهِ مَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ وَلَا دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ قَالَ حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ . صحيح :رواه ابن ماجة (٣٨٤٧)

**واته: پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوێکی ووت: چی دەڵێی لەناو نوێژدا، پیاوەکە ووتی: تەحییات دەخوێنم، وە دەڵێم:** (أللهم إني أسألك الجنة وأعوذ بك من النار) **واته: ئەی خودایە من داوای بەهەشتت لێ دەکەم وە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە ئاگر) وە من لەوە تێ ناگەم کە تۆو موعاز دەیڵێن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئێمەش قسەمان هەر لە دەوروبەری ئەمەیە.**

٥-عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي بَعْضِ صَلَاتِهِ ( اللَّهُمَّ حَاسِبْنِي حِسَابًا يَسِيرًا ) فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا الْحِسَابُ الْيَسِيرُ قَالَ أَنْ يَنْظُرَ فِي كِتَابِهِ فَيَتَجَاوَزَ عَنْه إِنَّهُ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ يَوْمَئِذٍ يَا عَائِشَةُ هَلَكَ .رواه الامام احمد (٢٣٦٩٥) قال الالباني في (اصل صفة صلاة النبي)اسناده جيد

**واتـه: عائشـه دهڵـێ: گـوێم لـه پێغهمبـهر بـوو(ﷺ) لـه هەنـدێك لـه نوێژەكانی دەيفەرموو (أللهـمَّ حاسِبْنِي حِساباً يَسيراً) واتـه: ئـهی خودایـه حيسابێكی سووكم لهگەڵدا بكـه ، دهڵـێ كاتێـك تـهواو بـوو گـووتم ئـهی پێغهمبەری خوا حیسابی سووك چییه؟ فـهرمووی تەماشـای كیتابەكـەی دەكات و لێی دەبووری، بـێ گومـان هـەر یـەكێك لێپرسـینەوەی لەگەڵدا بكرێ ئەو رۆژە ئەی عائیشه بەهیلاك چووه.**

٦- عن عليّ(رضي الله عنه) قال: كان رسولُ الله(ﷺ) إذا قامَ الى الصَّلاةِ يكونُ مِن آخِرِ ما يقولُ بين التَّشَهُّدِ والتَّسليمِ:(أَللهمَّ اغفِرْ لي ما قَدَّمتُ وما أَخَّرْتُ وما أسْرَرتُ وما أعْلنتُ وما أسرَفتُ وما أنتَ أعلمُ بِهِ مِنّي أنتَ المقَدِّمُ وأنتَ المؤخِّرُ لا اله الا أنت) رواه مسلم(٧٧١).

**واته: ئیمام علی(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبـەر(ﷺ) ئەگـەر هەستابا بۆ نوێژ كۆتـا شـت كـه لـه نێـوانی تـەحییات و سـەلام دانـەوە دەیگوت ئەوەبوو:** (اللهم اغفِرْ لي ما قَدَّمتُ وما أَخَّرْتُ وما أسْرَرتُ وما أعلنتُ وما أسرَفتُ وما أنتَ أعلمُ بِهِ مِنى أنت المقَدِّمُ وأنتَ المؤخِّرُ لا اله الا أنت ).

# يادى خوا لە دواى نوێژە فەرزەكان

## زيكرى يەكەم:

١-عن ثوبان(رضي الله عنه) قال: كانَ رسول الله(ﷺ) إذا انصرفَ مِنْ صلاتهِ إسْتَغفَرَ ثلاثاً، وقالَ: أللهمَّ أنت السّلامُ ومنكَ السَّلامُ تَباركتَ ذا الجلال والاكرام. رواه مسلم(٥٩١).

واتە: ثەوبان(رەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) كە سلاوى نوێژى دەدايەوە سێ جاران دەيفەرموو(استغفرالله) وە دەيفەرموو:(اللهم أنت السلام ومنك السلام تباركت ذا الجلال والإكرام) لە ريوايەتى تر هاتووە بە(يا ذا الجلال والإكرام)

واتە: ئەى خودايە تۆ سەلامى ، ئاشتى و سەلامەتى لە تۆوەيە ، گەورەى ، ئەى خاوەنى گەورەيى و بەخشش

## زيكرى دووەم :

٢- عن معاذ(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) أَخَذَ بيدهِ وقالَ: يا مُعاذُ واللهِ إنّي لأُحِبُّكَ واللهِ إنّي لأُحِبُّكَ فقالَ: أُصيك يا معاذُ لا تَدَعَنَّ في دُبُرِ كُلِّ صلاةٍ تقولُ: أللهُمَّ أَعنّي على ذِكرِكَ وشُكرِكَ وحُسنِ عِبادتِكَ. صحيح رواه ابوداود(١٥٢٣).

واتە: موعازى كورى جەبەل(رەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەستى گرتم وە فەرمووى ئەى موعاز سوێند بە خوا من تۆم خۆش دەوێ سوێند بەخوا من تۆم خۆش دەوێ، جا گوتى

ئامۆژگاریت دەکەم ئەی موعاز هەرگیز واز مەهێنە کە لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز بڵێی:

( أَللهُمَّ أَعنّي على ذِكرِكَ وشُكرِكَ وحسنِ عبادتِكَ) واتە: ئەی خودایە یارمەتیم بدە لەسەر یادکردنت و شوکرانە بژێری بۆت و باش پەرستنت .

## زیکری سێیەم

٣- عن ابي الزُّبير، قال: كان ابن الزبير يقولُ في دُبُرِ كُلِّ صلاةٍ حينَ يُسلِّمُ

واتە: باوکی زوبەیر دەڵێ:(عبداللە) کوڕی زوبەیر(ڕەزای خوای لێ بێت) لە پاش هەموو نوێژێك کە سەلامی دەدایەوە دەیگوت:( لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ الْمُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، لا حول ولا قوة إلا بالله , لا اله الا الله ولا نَعْبُدُ إلاّ إيّاهُ , لَهُ النِّعْمَةُ ولَهُ الفَضْلُ ولَهُ الثناء الحَسَنُ . لا اله الا اللهُ مخلصين لَهُ الدِّين ولَو كرِهَ الكافرون) وە دەیگوت پێغەمبەر (ﷺ) وای دەگوت لە دوای هەموو نوێژێك. (رواه مسلم(٥٩٤).

## ماناى زیکرەکە:

هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لەخوا، تاکەو شەریکی نییە، هەموو دەسەڵات و سوپاس و ستایشێك بۆ ئەوە، وە ئەوە خاوەن توانایە بەسەر هەموو شتێکا، لادان نییە لە خراپەو توانا نییە بۆ چاکە بە خوا نەبێت، هیچ پەرستراوی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا، وە بێجگە

لەو هیچ شتێکی تر ناپەرستین، چاکە هەر ئی ئەوەو بەخشش هەر ئی ئەوە، وە باس کردنی بە چاکەش شایستەی ئەوە، جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی تر نییە، گەردن کەچیمان بۆ ساغ و یەکلا دەکەینەوە، هەرچەندە کافران پێیان ناخۆش بێت.

## زیکری چوارەم

٢- عن المغيرة بن شعبة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) كان إذا فَرَغَ مِنَ الصلاةِ وسَلَّمَ قال:

واتە کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژ دەبۆوە و سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو:

(لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، أللهُمَّ لا مانِعَ لما اعْطيتَ ولامُعْطِيَ لما مَنَعْتَ، ولا يَنْفَعُ ذا الجَدِّ مِنْكَ الجَدّ). رواه البخاري(٨٤٤) ومسلم(٥٩٣).

## ماناى زيكرەكە:

هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا، هەموو دەستەڵات و ستایشێك بۆ ئەوە، وە ئەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەی خودایە ئەوەی کە تۆ دەیبەخشی هیچ کەس نییە بتوانێ کە مەنعی بکات، وە ئەوەش کە تۆ مەنعی دەکەیت و نایدەیت، هیچ کەس نییە بتوانێ ئەم شتە بدات و ببەخشێ، وە هیچ خاوەن بەش و سامان و دەسەڵاتێك، بەش و سامان و دەسەڵاتەکەی لە بەرامبەر سزاو تۆڵەی تۆدا دادی نادات.

## زیكری پێنجەم:

**ئـەم زیكـرە (١٠) جـاران تـەنها لـە دوای نوێـژی بـەیانی و مـەغریب دەخوێندرێ بەم شێوەی لەم دوو فەرموودەدا هاتووە.**

١-عن عبد الرحمن بن غنم عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال :من قال قبل أن يَنصِرفَ ويَثنِيَ رجْلَيْهِ مِن صلاة المغرب والصبح(لا إله إلا الله وحده لا شريك له ,له الملك ,وله الحمد, يحيي ويميت, وهو على كل شئ قدير) عشر مرات كتب الله بكل واحدة عشر حسنات ومحا عنه عشر سيئات , ورفع له عشر درجات, وكانت له حِرزا مِن كل مكروه, وحِرزا من الشيطان الرجيم, ولم يَحِل لِذنب أن يُدركه إلا الشرك, وكان من أفضل الناس عملا, إلا رجلا يفضله, يقول أفضل مما قال.رواه أحمد وغيره, وقال الالباني حسن لغيره,انظر صحيح الترغيب والترهيب(٤٧٧)

**واتە: هەر یەكێك پێش ئەوەی بڕوا وە پێش ئەوەی پێیـەكانی لەسـەر ئەم حالەتە بگۆڕێ كە تەحییاتی خوێندووە، (١٠) جاران لە دوای نوێـژی مەغریب و بەیانیدا بڵێ (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير) ئەوە خوا بـە گـوتنی هەر یەك جار لەم زیكرە (١٠) چاكەی بۆ دەنووسێ، وە (١٠) خراپەی لێ لا دەبات، وە (١٠) پلەی بـەرز دەكاتـەوە، وە دەبێتـە پـارێزەر بـۆی لـە هەموو ناخۆشییەك، وە دەبنە پارێزەر لە شەیتانی دەركراو لە ڕەحمەتی خـوا، وە هـیچ گوناحێـك زیـانی پـێ ناگەیـەنێ مەگـەر هاوبـەش بـۆ خـوا پەیداكردن نەبێت، وە ئەو لە هەموو خەڵكی كاری باشتری كردووە، مەگەر كەسێك لە ئەو باشترە، كە لە ئەو باشتر بڵێ لەوەی كە گوتویەتی.**

٢- عن عُمارةَ بن شَبيبِ السَّبئيِّ، قالَ: قالَ:رسولُ الله (ﷺ) :(من قالَ: لا إله الا الله وحده لاشريك لَه، لَه الملكُ وله الحمد، يحيي ويُميت، وهو على كُلِّ شيءٍ قدير، عشر مرَّاتٍ على إِثْرِ الْمَغرِبِ بَعثَ اللهُ لهُ مَسلحةً يَحفظونَهُ مِن الشيطانِ حتى يُصبحَ، وكتبَ اللهُ لَهُ بها عشرَ حسناتٍ موجباتٍ، ومَحى عنهُ عشر سيِّئاتٍ مُوبقاتٍ، وكانت لَهُ بِعَدلِ عَشرِ رِقابٍ مؤمنات. حسن:رواه الترمذي (٣٥٣٤) والنسائي (٥٧٧) في (عمل اليوم والليلة)

**واته: هەر یەکێك دە جاران لەدوای نوێژی مەغریب بڵێ (<u>لا إله الا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير</u>) ئەوا خوا کۆمەڵێك فریشتەی بۆ دەنێرێت دەیپارێزن لەشەیتان تابەیانی، وەخوا بەهۆیەوە دە چاکەی رزگارکەری بۆ دەنوسێت , وە دە گوناهی لەناو بەری لێ دەسرێتەوە , وەپاداشتی رزگار کردنی دە بەندەی بڕواداری بۆ دەنوسێت.**

## <u>زیکری شەشەم</u>:

عن ابي أُمامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قرأ آيَةَ الكُرسيِّ دُبُرَ كُلِّ صلاةٍ لم يَمْنَعْهُ من دُخولِ الجنَّةِ إلاّ أنْ يَموت. صحيح الجامع الصغير للالباني(٦٤٦٤).

**واتە: هەر کەسێك(آية الكرسى) لە پاش هەموو نوێژێکی فەرزدا بخوێنی , ئەوە هیچ شتێك بەرگری لێ ناکات لە چوونە بەهەشت تەنها مردن نەبێت.**

**سوود**:

سوننەتە(آية الكُرسيّ) لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز بخوێنرێ، بەڵام لە دوای خوێندنی(آية الكرسی) لە دوای نوێژدا فوو لە دەست کردن و فوو لە جەستە کردن و دەست بە لەش داهێنان و ئەمانە لە شەرع دا نەهاتوون و بیدعەن.

## زیکری حەوتەم :

عن عُقبَةَ بن عامِرٍ(رضي الله عنه) قال: أمرَني رَسولُ الله (ﷺ) أَنْ أَقْرأَ بِالْمُعَوِّذاتِ دُبُرَ كُلِّ صلاةٍ. صحيح رواه أبوداود(١٥٢٣) والنسائي(١٣٣٦).

واتە: عوقبەی کوڕی عامر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردم کە سورەتی(اخلاص) و(فلق) و(ناس) بخوێنم لە دوای هەموو نوێژێك (هەر یەکەو یەك جار).

## زیکری هەشتەم:

ئەم زیکرە چوار جۆری لێرەدا باس کراوە , تۆ دەتوانی لەم چوار جۆرە یەکێکیان ئەنجام بدەی، بەڵام باشتر وایە هەر جارەو یەکێکیان بخوێنی.

### جۆری یەکەم :

(٣٣) جار (سبحان الله) ، (٣٣) جار (الحمد لله)، (٣٣) جار (الله أكبر)، یەك جاریش دەڵێی (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير).

**١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ سَبَّحَ اللهَ في دُبُر(١) كلِّ صلاةٍ ثلاثاً وثلاثين، وحَمِدَ الله ثلاثاً وثلاثين، وكَبَّرَ الله ثلاثاً وثلاثين فتلك تسْعَةٌ وتسعون وقال تمام المائَةِ: لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ الْمُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، غُفِرَت خطاياهُ وإنْ كانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ. رواه مسلم(٥٩٧).**

**واتــه: هــهر يــهكێك لــه دوای هــهموو نوێــژێكی فــهرز(٣٣) جــاران بڵێ(سبحان الله)، وه(٣٣) جاران بڵێ(الحمد لله)، وه(٣٣) جـاران بڵـێ(الله اكبر) ئەوه نۆهەت و نۆ , وه له جاری سەدەمیندا بڵێ:** لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ الملكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، **گوناهــهكانی دەپۆشرێن ئەگەر وەكو كەف دەریاش بن.**

**<u>جۆری دووەم:</u>**

**(٣٣) جــار (ســبحان الله) (٣٣) جــار (الحمــد لله) (٣٤) جــار (الله أكبر).**

**عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مُعَقِّبَاتٌ لَا يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ أَوْ فَاعِلُهُنَّ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ ثَلَاثٌ وَثَلَاثُونَ تَسْبِيحَةً وَثَلَاثٌ وَثَلَاثُونَ تَحْمِيدَةً وَأَرْبَعٌ وَثَلَاثُونَ تَكْبِيرَةً . رواه مسلم (٥٩٦)**

**واتــه: چــهند زیكرێـك هــهن لــه دوای هــهموو نوێـژێكی فــهرز، هــهر**

---

(١) (دُبُر) عقب الانتهاء من صلاة الفريضة.

كەسێك ئەنجاميان بدات رەنجەڕۆ نابێت، (٣٣) جار (سبحان الله) (٣٣) جار (الحمد لله) (٣٤) جار (الله أكبر).

مانای (يخيبُ): (خاب) يخيبُ (خَيْبَة) : اذا لم يَنَلْ ما طلب: واتە: ئەگەر بەوە نەگات كە داوای كردووە (لا يخيبُ) واتە: رەنجەڕۆ نابێت، بەوە دەگات كە داوای دەكات.

جۆری سێيەم:

(١٠) جار دەڵێ (سبحان الله) (١٠) جار دەڵێ (الحمد لله) (١٠) جار دەڵێ (الله أكبر).

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ خَصْلَتَانِ أَوْ خَلَّتَانِ لَا يُحَافِظُ عَلَيْهِمَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ يُسَبِّحُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ عَشْرًا وَيَحْمَدُ عَشْرًا وَيُكَبِّرُ عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ وَخَمْسُ مِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ وَيُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ وَيَحْمَدُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَيُسَبِّحُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ فَذَلِكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْقِدُهَا بِيَدِهِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ قَالَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ يَعْنِي الشَّيْطَانَ فِي مَنَامِهِ فَيُنَوِّمُهُ قَبْلَ أَنْ يَقُولَهُ وَيَأْتِيهِ فِي صَلَاتِهِ فَيُذَكِّرُهُ حَاجَةً قَبْلَ أَنْ يَقُولَهَا . صحيح : رواه ابوداود (٥٠٦٥) والترمذي (٣٤١٠) وغيرهما.

واتە: دوو خەسڵەت هەن نييە بەندەيەكی موسڵمان پارێزگاريان لێ بكات ئيللا دەچێتە بەهەشت، ئەم دوو خەسڵەتە ئاسانن، بەڵام ئەوانەی

کاریان پێ دەکەن کەمن زۆر نین، لەدوای هەموو نوێژێك (١٠) جار (سبحان الله) دەکات، وە (١٠) جار (الحمد لله) دەکات، وە (١٠) جار (الله أكبر) دەڵێ، ئەوە دەکا (١٥٠) بە زمان، وە (١٥٠٠) چاکە لە تەرازوودا، وە کاتێکیش چووە ناو جێگای نووستن (٣٤) جار دەڵێ (الله أكبر) وە (٣٣) جار دەڵێ (الحمد لله) وە (٣٣) جار دەڵێ (سبحان الله) ئەوە دەکا (١٠٠) جار بە زمان وە (١٠٠٠) چاکە لە تەرازوودا، (عبدالله) دەڵێ پێغەمبەرم بینی (ﷺ) بە پەنجەکانی دەیژماردن، ئەسحابەکان ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ، چۆن ئەمە ئاسانەو ئەوانەی ئەنجامیان دەدەن ژمارەیان کەمە، فەرمووی لەکاتی خەودا شەیتان دێتە لای دەیخەوێنێ پێش ئەوەی زیکرەکە بکات، وە شەیتان لە کاتی نوێژەکەی پێداویستیەکانی بیر دەهێنێتەوە پێش ئەوە بیڵێ.

**جۆری چوارەم:**

ووتنی (٣٣) جار (سبحان الله) (٣٣) جار (الحمد لله) (٣٣) جار (الله أكبر).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قال :أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَى وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ فَقَالَ وَمَا ذَاكَ قَالُوا يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ وَيَتَصَدَّقُونَ وَلَا نَتَصَدَّقُ وَيُعْتِقُونَ وَلَا نُعْتِقُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفَلَا أُعَلِّمُكُمْ شَيْئًا تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَكُمْ وَتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَكُمْ وَلَا يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُمْ إِلَّا مَنْ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُمْ قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ تُسَبِّحُونَ وَتُكَبِّرُونَ وَتَحْمَدُونَ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ مَرَّةً ، رواه البخاري (٨٤٣) و مسلم (٥٩٥).

واته: ئەبو هورەیرە دەڵێ: هەژارە کۆچکارەکان هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان: ئەوانەی ماڵیان زۆرە، پلە بەرزەکان و نیعمەتی بەردەوامیان بەدەست هێناوە، فەرمووی: ئەوە چییە؟

گوتیان: نوێژ دەکەن وەکو چۆن ئێمە نوێژ دەکەین، وە بە ڕۆژوو دەبن وەکو چۆن ئێمە بەڕۆژوو دەبین، بەلاّم ئەوان خێر دەکەن ئێمە نایکەین، وە بەندە ئازاد دەکەن ئێمە نایکەین، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایە شتێکتان فێر بکەم بگەنە ئەوانەی کە پێشتان کەوتوون، وە بە پێش ئەوانەش بکەون کە لە دواتانەوەن، وە کەسیش لە ئێوە باشتر نەبێت مەگەر یەکێك وەکو ئێوە بکات، ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی: لەدوای هەموو نوێژێك هەر یەکێك لەم زیکرانە (سبحان الله) (الله أکبر) (الحمد لله) (٣٣) جاران بڵێن.

## زیکری نۆیەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ سَبَّحَ فِي دُبُرِ صَلاَةِ الْغَدَاةِ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ وَهَلَّلَ مِائَةَ تَهْلِيلَةٍ غُفِرَتْ لَهُ ذُنُوبُهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ .صحيح الاسناد رواه النسائي(١٣٥٤)

واتە: هەر یەکێك لەدوای نوێژی نیوەڕۆ (١٠٠) جاران بڵێ (سبحان الله) وە (١٠٠) جاران بڵێ (لا إله إلا الله) خوا لە گوناحەکانی خۆش دەبێت ئەگەر وەکو کەفاوی دەریاش بن.

## زیكری دەیەم:

عن أمَّ سلمةَ، أنَّ النبيَّ (ﷺ) كانَ يقولُ إذا صَلَّى الصُبْحَ حين يُسَلِّمُ، أللهمَّ إني أسألكَ علماً نافعاً، ورزقاً طيباً، وعملاً مُتَقبّلاً) صحيح: رواه ابن ماجة (٩٤٥).

واتە: دایكی سەلەمە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك نوێژی بەیانی بكردبایە لەو كاتەی كە سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (أللهم إني أسألك علماً نافعاً ورزقاً طيباً وعملاً مُتقبلاً ) واتە: ئەی خودایە داوای زانستێكی بە سوودت لێ دەكەم، وە كردەوەیەكی قەبوڵ كراو، وە رسق و رۆزیەكی حەڵاڵ و پاك.

## چەند روونكردنەوەیەك:

١- ئەم زیكرانە هەر یەكەو بۆ خۆی لە دوای نوێژەكان بەتەنیا دەیكات نەك بە جەماعەت.

٢- ئەم زیكرانە دەتوانی لە ریگای ماڵەوەش ئەنجامی بدەی.

٣- ئەم زیكرانە ئەگەر هەموو كران ئەوە نیعمەتێكی گەورەیە، ئەگەر نا دەتوانی هەندێكیان ئەنجام بدەی.

٤- ئاگادار بە هیچ زیكرێك كە لە سوننەتدا نەهاتووە بە كەیفی خۆت زیادی نەكەی لەگەڵ ئەم زیكرانەدا , دەنا گوناهباریش دەبیت لە بری ئەوەی پاداشت بدرێیەوە.

٥- نەوەوی لە (المجموع)ی دەڵێ : (إنّ الذكر والدعاء بعد الصلاة يُستحب ان يُسرَّ بهما ألاّ ان يكون إماماً يُريدُ تعليم الناس فيجهر ليتعلموا، فاذا تعلموا وكانوا عالمين أسرَّه).

واتـە: سـوننەتە کـە بـەدەنگی نـزم دوای نوێـژ زیکـرو دوعـا بکرێـت ، مەگەر ئیمام بێت و بیەوێ خەڵکی شارەزا بکات، دەنگی بەرز دەکاتـەوە بۆ ئەوەی فێر بن، جا کاتێك کـە فێـر بـوون بـە دەنگـی نـزم زیکرەکـانی دەکاتەوە.

## یادی خوا لە دوای نوێژی بەیانی

١-عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ صَلَّى الغداةَ في جماعةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذكرُ الله حتى تَطلعَ الشَّمسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكعتينِ، كانت لَهُ كأجرِ حَجَّةٍ وعُمرةٍ، تامَّةٍ تامَّةٍ تامَّةٍ. حسن: رواه الترمذي(٥٨٦).

واتـە: هـەر یـەکێك نوێـژی بـەیانی بـە جەماعـەت بکـات، لـە پاشـان دابنیشێ(لە شوێنی نوێژەکەی) یادی خوا بکـات تـاوەکو رۆژ هەڵدێ ، لـە پاشان دوو رکات نوێژ بکات، بۆ ئەو کەسە هەیە ئـەجرو پاداشـتی حـەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواو.

**سوود**:

وە فەرموودەیـەکی تـریش کـە(طبراني) ریوایـەتی کردوەو(ألبـاني) بە(حسن)ی داناوە بەم شێوەیە:(مَنْ صَلَّى صلاة الصبح في جماعةٍ، ثُمَّ ثَبتَ حتى يُسَبِّحَ للهِ سُبحةَ الضُّحى كان لهُ كَأجرِ حاجّ ومُعْتَمِرٍ، تامًّا لَهُ حَجَّتُهُ وعمرتُهُ).

سُبحة الضحى: صلاة الضحى، نوێژی چێشتەنگاو.

عُثيمين (رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت) دەڵـێ: نوێـژی چێشـتەنگاو کاتەکەی(١٥ یا ٢٠) دەقیقە لە دوای رۆژهەڵاتن دەست پێ دەکات.

# نوێژه سوننەتەکانی پێش و پاشی نوێژه فەرزەکان(سنن الرواتب):

**ئەم نوێژانە دوو جۆرن(مُؤَكَّد) و(غير مؤكد):**

**(مؤكد): ئەو نوێژانەن کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر گرنگی پێ داوەو داکۆکی لەسەر ئەنجام دانی کردوەو دەوامی لەسەر کردووە کە ئەمانەش(١٠) رکاتن: دوو رکات پێش نوێژی بەیانی، دوو پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو دوای نیوەڕۆ، دوو رکات دوای نوێژی(مغرب) دوو رکات دوای نوێژی(عیشاء).**

**وە(غير مؤكد) ئەو نوێژانەن کە پێغەمبەر(ﷺ) جەخت و دەوامی لەسەر نەکردووە.**

## دوو رکات پێش نوێژی بەیانی:

١-عن عائشة(رضى الله عنها) عن النبيِّ(ﷺ) قال: رَكْعتا الْفَجر خيرٌ من الدُّنيا وما فيها. رواه مسلم(٧٢٥).

**واتە: دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی باشترە لە دونیاو لەوەی کە تیایەتی.**

٢-عن عائشة قالت :أَنَّ النبيَّ (صلى الله عليه وسلم)لَمْ يَكنْ على شيءٍ مِن النّوافِلِ ، أشدَّ مُعاهدةً منهُ ، على رَكْعتينِ قبلَ الصُّبْح) رواه البخاري(١١٩٦)ومسلم(٧٢٤)

**واتە :عائشە دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر هیچ شتێك لە سوننەتەکان**

پابەندتر نەبووە وەکو پابەند بوونی بە دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی .

**خوێندنی سورەتی (کافرون) و (إخلاص) لەسوننەتی بەیانیدا**

١-عن عبد الله بن مسعود قال :ما أُحصي ما سمعت مِن رسولِ الله(صلى الله عليه وسلم)يقرأ في الركْعَتين بعد المغربِ وفي الركْعتين قبل صلاة الْفَجر ب(قل يأيّها الكافرون)و(قل هو الله أحد) حسن صحيح:رواه الترمذي(٤٣١)

واتە : (ابن مسعود)دەڵێ: بۆم نازمێردرێ ئەوەندەم لە پێغەمبەر بیستووە (ﷺ) کە لە دوو رکات سوننەتی دوای مەغریب و دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی سورەتی (کافرون) و (إخلاص) دەخوێند .

٢-عن أبي هريرة(رضى الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قرأ في ركعتَي الفَجْرِ(قل يا أيها الكافرون) و(قل هو الله أحد).. رواه مسلم(٧٢٦).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی سورەتی(کافرون) و(إخلاص)ی خوێند.

## سوود

١- (ابن القيم) لە(زاد المعاد)دا دەڵێ : لە سەفەردا هیچ لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەگێردراوەتەوە کە جگە لە دوو رکات سوننەتی پێشی بەیانی هیچ نوێژێکی تری سوننەتی لە پاش و پێشی نوێژە فەرزەکاندا کردبێت .

وه (عثيمين) له (مجموع فتاوى)دا دهڵێ :من ئهوهم بۆ دهركهوتووه كه له سهفهردا راتبهی نيوهرۆ و مهغريب و عيشا ناكرێ ، جگه لهمانه دهكرێ وهك :دوو ركات نوێژی سوننهتی پێش نوێژی بهيانی(مسلم : ٦٨٠) وه نويژی ويتر(بخاری : ١٠٠٠) وه شهو نوێژ وه (صلاة الضحى) وه (تحية المسجد) تاوهكو نوێژی سوننهتی(مطلق)يش .

٢–له فهرموودهی راستدا هاتووه كه يهكێك بچێت بۆ نوێژی جهماعهتی بهيانی ، فريا نهكهوێ دوو ركات سوننهتی پێش نوێژی بهيانی بكات ، دهتوانێ له دوای تهواو بوونی نوێژهكهدا بيكات ، يا خود له دوای رۆژ ههڵاتن دهتوانی بيكات ، پێغهمبهر(صلى الله عليه وسلم) دهفهرموێ ( منْ لمْ يُصَلِّ رَكْعَتَي الفجرِ فَلْيُصَلِّهما بعد ما تَطلعُ الشّمسُ) صحيح:رواه الترمذي(٤٢٣)

## سوننهتی نيوهرۆ

١–عن ابن عمرَ(رضي الله عنه) قالَ صلَّيتُ مَعَ رسولِ اللهِ(ﷺ) ركعتينِ قبلَ الظُّهرِ وركعتينِ بعدها. رواه البخاري و مسلم(٧٢٩).

واته: ابن عمر(رهزای خوای لێ بێت) دهڵێ: لهگهڵ پێغهمبهری خوا(ﷺ) دوو ركات نوێژی سوننهتم پێش نيوهرۆ كرد وه دوو ركاتيش له دوای نيوهرۆ.

٢– عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: كان النبيُّ(ﷺ) يُصلِّي في بيتي قبلَ الظُّهرِ أربعاً ثُمَّ يَخرُجُ فيُصَلِّي بالنّاس، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي ركعتين، وكان يُصلِّي بالنّاس المغرب، ثُمَّ يَدخُلُ فَيُصَلِّي ركعتين ويُصَلِّي بالناس العشاءَ ويدخُلُ بيتي فيُصَلِّي ركعتين. رواه مسلم(٧٣٠).

واته: عائیشه(ڕەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ پیّغەمبەر(ﷺ) چوار ركات نویّژی سوننەتی دەكرد لە ماڵەكەم پیّش نویّژی نیوەڕۆ , لە پاشان دەچوو پیّش نویّژی بۆ خەڵك دەكرد , لە پاشان دەهاتەوە دوو ركات نویّژی سوننەتی دەكرد , وە هەروەها پیّش نویّژی(مغرب)ی بۆ خەڵك دەكرد لە پاشان دەهاتەوە دوو ركات نویّژی دەكرد ، پیّش نویّژی(عیشاء)ی بۆ خەڵك دەكرد وە دەهاتەوە ماڵەكەم دوو ركات نویّژی دەكرد.

٣- عن ام حبيبةَ(رضى الله عنها) قالت: قال رسولُ الله(ﷺ): مَنْ حافَظَ على أَرْبَعِ ركعاتٍ قَبلَ الظُهرِ وأربعٍ بَعدَها حَرُمَ على النَار. حديث صحيح رواه أبوداود(١٢٦٩) والترمذي(٤٢٧).

واته: هەر یەكیّك پاریّزگاری چوار ركات پیّشی نیوەڕۆو چوار ركات دوای نیوەڕۆ بكات قەدەغە دەكریّ لە ئاگری دۆزەخ.

## سوننەتی(عصر)

١-عن علي بنِ أبي طالب(رضي الله عنه) قالَ: كانَ النبيُّ(ﷺ) يُصلّي قبلَ العَصرِ أَرْبَعُ ركعاتٍ يَفصِلُ بَينَهُنّ بالتَّسليم على الملائكةِ الْمُقَرَّبينَ ومَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ المسلمينَ والمؤمنينَ. حسن رواه الترمذي(٤٢٩).

واته: ئیمام عەلی(ڕەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: پیّغەمبەر(ﷺ) پیّش نویّژی عەسر چوار ركاتی دەكرد ئەم چوار ركاتەشی دوو دوو دەكرد جیای دەكردنەوە بەسەلام دانەوە لەسەر فریشتە نزیكەكانی بارەگاو وە هەموو ئەو موسڵمان و بڕوادارانەی كە پەیرەوی ئاوانیان كردووە.

٢- عن ابن عمر(رضي الله عنه) عن النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) قالَ: رَحِمَ اللهُ امرأً صَلّى قبلَ العصْرِ أربعاً. حسن رواه ابوداود(١٢٧١) والترمذي(٤٣٠).

**واته: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە کە چوار ڕکات پێش نوێژی عەسر دەکات.**

٣- عن عبدالله بن مُغَفَّل(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): بينَ كلِّ أَذانينِ صَلاةٌ، بينَ كلِّ أَذانينِ صَلاةٌ، بينَ كلِّ أَذانينِ صَلاةٌ، قالَ في الثالثةِ(لِمَنْ شاءَ). رواه البخاري(٢/٩١) و مسلم(٨٣٨).

**واته: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژێکی سوننەت هەیە , ئەمەی سێ جار دووبارە کردەوە, لە دوای جاری سێیەم فەرمووی: بۆ ئەوەی کە بیەوێ. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دوو ڕکات نوێژی سوننەت پێش عەسر.**

## سوننەتی(مغرب)

**نوێژی(مغرب)دوو ڕکات سوننەتی (غير مؤكد)ەی لە پێشە ، وە دوو ڕکات سوننەت (مؤكد)ەی لە پاشە .**

١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ قَالَ صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ لِمَنْ شَاءَ ) خَشْيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً .رواه البخارى(١١٨٣)وأبوداود(١٢٨١)

**واتە:پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێ: دوو ڕکات نوێژ پێش نوێژی(مغرب) بکەن ، لە پاشان فەرمووی : دوو ڕکات نوێژ پێش نوێژی(مغرب) بکەن بۆ کەسێ کە بیەوێ ، لە ترسی ئەوەی نەوەك خەڵکی وەکو سوننەتێکی(مؤكد)ە وەری بگرن .**

٢-عن أنس(رضي الله عنه) قال: كُنا بالمدينةِ فإذا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِصلاةِ المَغْرِبِ ابْتَدَرُوا السَّوارِيَ فَرَكَعُوا ركعتينِ حتَى إنَّ الرَّجُلَ الغَريبَ لَيَدْخُلُ المسجدَ فَيحسَبُ أَنَّ الصلاةَ قَدْ صُلِّيَتْ مِنْ كَثرةِ مَنْ يُصلِّهما. رواه مسلم(٨٣٧).

**واته: ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمە لە مەدینە کاتێك کە بانگ دەر بانگی دەدا بۆ نوێژی(مغرب) خەڵك پەلەیان دەکرد بۆ پشت کۆڵگەکانی مزگەوت و دوو رکات نوێژیان دەکرد تاوەکو ئەگەر پیاوێکی غەریبە بهاتبایە ناو مزگەوت وا تێدەگەیشت کە نوێژ کراوە لەبەر زۆری ئەو کەسانەی کە ئەم دوو رکاتەیان دەکرد.**

**٣-** عن ابن عمرَ(رضي الله عنه) قالَ: صَلَّيتُ مَعَ رسولِ الله(صلى الله عليه وسلم) ركعتين قبلَ الظهرِ وركعتينِ بعدها وركعتين بعد الجمعة وركعتين بعدَ المغرب وركعتين بَعدَ العِشاء. رواه البخاري(٣/٤١) ومسلم(٧٢٩).

**واتە: ابن عومەر(رەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ ئەم نوێژانەم لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە(صلى الله عليه وسلم): دوو رکات پێش نوێژی نیوەڕۆ دوو رکات لە دوای نوێژی نیوەڕۆ دوو رکات لە دوای جومعە وە دوو رکات لە دوای مغرب وە دوو رکاتیش لە دوای نوێژی** عشاء.

## سوننەتی(عشاء)

بەپێ ی فەرموودەی(بينَ كلِّ أَذانينِ صَلاةٌ) دوو ركات سوننەت هەیە پێش نوێژی(عشاء) وە فەرموودەی پێشوش بەڵگەیە لەسەر بوونی دوو ركات دوای نوێژی(عشاء) كە سوننەتێكی(مُؤَكَّدة)یە.

## سوننەتی جومعة

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): اذا صَلَّى احدُكُمُ الجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بعدها أربعاً. رواه مسلم(٨٨١).

واتە: ئەگەر یەكێك لە ئێوە نوێژی جومعەی كرد با چوار ركات سوننەت لە دوایدا بكات.

٢- عن ابن عمر(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(صلى الله عليه وسلم): كان لا يُصلِّي بَعدَ الجمعةِ حَتَّى يَنصَرِفَ فَيُصَلِّي ركعتينِ في بيتهِ. رواه مسلم(٨٨٢).

واتە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە دوای نوێژی جومعە نوێژی نەدەكرد تا نەچوبایە ماڵەوە , جا دوو ركات نوێژی لە ماڵەوە دەكرد.

## زانیاری زیاتر دەربارەی (سنن الرواتب)

١- باشتر وایە (سنن الرواتب) لەماڵەوە بکرێت ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ فَإِنَّ أَفْضَلَ الصَّلَاةِ صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ ) رواه البخاري(٧٢٩٠)ومسلم(٧٨١)

واتە:ئەی خەڵکینە لە ماڵەوەتان نوێژ بکەن ، چونکە بێ گومان باشترین نوێژی پیاو لە ماڵەوەیتی ، تەنها نوێژە فەرزەکان نەبێت .

٢- دەتوانی (سنن الرواتب) بگێریەوە(قضاء) بکەیتەوە ،ئەمە هەڵبژاردەی(ابن تیمیە)شە .

## گەورەیی کردنی دوازدە رکات نوێژی سوننەت ڕۆژانە

١-عن أُمِّ الْمُؤْمنينَ أمِّ حبيبةَ رَمْلَةَ بنتِ أبي سُفيان(رضی الله عنها) قالت: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقول: ما منْ مسلمٍ يُصَلِّي لله تعالى كُلَّ يومٍ ثِنْتَيْ عَشَرَةَ ركعةً تطوعاً غيرَ الفَريضةِ إلاّ بَنى اللهُ له بيتاً في الجنّة أو: إلاّ بُنيَ لَهُ بيتٌ في الجنةِ. رواه مسلم(٧٢٨).

واتە: هەر بەندەیەکی موسڵمان ڕۆژانە دوازدە رکات نوێژی سوننەت غەیری فەرزەکان بکات بۆ خوای بەرز ئیللا خوا خانوەکی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات، یا ئیللا خانووەکی لە بەهەشت بۆ دورست دەکرێ.

# زۆر نوێژی سوننەت کردن

عن ابي فراس ربيعةَ بن كعبٍ الأسلميِّ خادم رسول الله(ﷺ) ومن اهل الصُفَّةِ[1](رضي الله عنه) قال: كنت أَبِيْتُ مَعَ رسولِ اللهِ(ﷺ) فآتيهِ بِوَضُوئِهِ و حاجَتِهِ فقال لي سَلْ فقلْتُ أسألُكَ مُرافَقَتَكَ في الجنة، فقال: أوَ غيرَ ذلك؟ قلتُ: هوَ ذاكَ، قالَ: فأَعِنّي على نَفْسِكَ بكثرةِ السُّجُود. **رواه مسلم.**

وَضُوء: **ئاوی دەست نوێژ (وضُوء) دەست نوێژ**

**واتە: رەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی(رەزای خوای لێ بێت) خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ) وە لە خەڵکی سوففە بوو دەڵێ: شەوم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکردەوە ئاوی دەست نوێژو پێداویستیەکانم بۆ دەهێنا , جارێکیان پێی فەرمووم: داوا بکە گوتم: داوای ئەوەت لێ دەکەم کە لە بەهەشتا ببم بە هاوڕێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووەی ئەو داوایە ناگۆڕی شتێکی تر داوا بکەی ؟ گوتم : نەخێر داوام هەر ئەوەیە، فەرمووی: کەواتە یارمەتیم بدە بەسەر نەفست بە سەجدە زۆر بردن.**

---

(١) الصفة: محل مسقف اخر المسجد النبوي يأوي اليه الفقراء.

# شەو نوێژ

## پێشەکیەك:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (وما أمَرْتُكُمْ به فأْتُوا منه ما اسْتَطَعْتُم)[1]، واتە: وە ئەوەش کە فەرمانم پێ کردوون ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە بیکەن.

کەواتە تۆش ئەی موسڵمان هەوڵ بدە پشکت هەبێت لە شەونوێژ هەوڵ بدە ناوی خۆت لە لیستی شەو نوێژکاران بنووسی، ئەگەر یازدە رکات شەو نوێژ ناکەی لەمە کەمتر بکە ئەگەر نا تەنها دوو رکات شەو نوێژ بکە، ئەگەر نا تەنها یەك رکات نوێژی وتر بکە , ناوت دەکەوێتە لیستی شەو نوێژ کاران، ئەگەر دەڵێی من ناتوانم لەخەو هەستم شەو نوێژ بکەم ئەوە دەتوانی لە دوای نوێژی عیشا دوو رکات یا یەك رکات نوێژی ویتر بکەی یا زیاتر بە نیەتی شەو نوێژ بۆت بەر دەکەوێ، چونکە مەرج نییە بۆ شەو نوێژ بخەوی ئەوجا هەڵبستی نوێژەکە بکەی , بەڵکو پێش خەوتنیش دەبێت، جا ئەی موسڵمان هەوڵ بدە ئەگەر بە یەك رکاتیش بێت بەشدار بە لەم عیبادەتە، پێغەمبەر (ﷺ)، دەفەرمووێ: (.... وأَنَّ أحبَّ الأعمال إلى الله أدْوَمُها وإن قَلَّ)[2]، واتە: وە بێ گومان خۆشەویسترین کردەوە لای خوا ئەوەیانە کە بە بەردەوامی بکرێ ئەگەر کەمیش بێت.

---

(١) رواه البخاري (٧٢٨٨)، ومسلم (١٣٣٧).

(٢) رواه البخاري (٦٤٦٤) و مسلم (٧٨٣).

## گەورەیی شەونوێژ:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ ﴾ (الفرقان: ٦٤).

واتە: وە کەسانێکن کە شەوگار بە نوێژکردن و سەجدە بردن و بەپێوە وەستان دەبەنە سەر.

وە دەفەرمووێ: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (السجدة: ١٦).

واتە: تەنیشتیان دوور دەکەوێتەوە لە جێگای نووستنیان (لەخەو هەڵدەستن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بە ترس و هیواوە وە لەو رۆزی و سامانەی پێمان داون دەیبەخشن.

١- عن عبدِالله بنِ سلام(رضي الله عنه) قال: لَمَّا قَدِمَ رسولُ اللهِ(ﷺ) المدينةَ انْجفَلَ الناسُ اليهِ وقيل قَدِمَ رسولُ الله(ﷺ)، قَدِمَ رسولُ الله (ﷺ)، قدم رسول الله (ﷺ)، فَجئتُ في الناسِ لِأَنْظُرَ اليهِ فلمَّا اسْتَثْبَتُّ وجهَ رسولُ الله(ﷺ) عَرفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ ليس بوجهِ كَذَّابٍ وكان أوَّلُ شيءٍ تَكَلَّمَ بِهِ أنْ قال: أيَّها الناسُ أَفْشُوا السَّلامَ وأَطْعِمُوا الطَّعامَ وَصَلّوا والناسُ نيامٌ تَدْخُلُوا الجَنَّةَ بِسلام. صحيح رواه الترمذي(٢٤٨٧) وابن ماجه(٣٢٥١).

واته:عبـدالله كـوڕی سـەلام(ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەڵـێ: کاتێـک پێغەمبەر(ﷺ) هاتە شاری مەدینە خەڵکان بە پەلـە بـەرەو ڕووی چـوون هاوار کرا پێغەمبەری خوا هات(ﷺ)، پێغەمبەری خـوا هـات پێغەمبـەری خوا هات(ﷺ) , پێغەمبەری خوا هات پێغەمبەری خـوا هـات(ﷺ) , جـا منیش لەگەڵ خەڵکی چووم بۆ ئەوەی تەماشـا بکـەم , جـا کـە لـە ڕووی پێغەمبـەری (ﷺ) وورد بوومـەوە زانـیم ڕووی پێغەمبـەر(ﷺ) بـە ڕووی درۆزن ناچێ , ئەوجا پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم قسـەی ئـەوەبوو فـەرمووی: ئەی خەڵکینە سەلام بلاوبکەنەوە , خواردن بـدەن , وە نوێـژ بکـەن لـەو کاتەی کە خەڵکان نوستوون , دەچنە بەهەشت بە سەلامەتی.

٢- عن سالمِ بنِ عبدالله(رضي الله عنه) عن أَبيهِ: أنَّ رسولَ اللهِ(ﷺ) قالَ: نِعْمَ الرَّجل عبداللهِ لو(١)كانَ يُصلي منَ الليلِ فقال سالم، فكان عبدالله بعدَ ذلك لا ينامُ مِنَ الليل إلاّ قليلاً. رواه البخاري(١١٢١) ومسلم(٢٤٧٩).

واتە: سالمی کوڕی عبدالله کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لـێ بێـت) دەڵـێ باوکم گوتویەتی(واتە عبدالله) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی: عبـدالله پیـاوی چاکە خۆزیا شەو نوێـژی دەکـرد، جـا سـالم دەڵـێ: عبـدالله لـە پـاش ئـەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) لە شەودا نەدەخەوت تەنها کەمێکی نەبێت.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قالَ رسولَ اللهِ(ﷺ): أفْضَلُ الصِّيامِ بَعدَ رَمضانَ شَهرُ اللهِ الْمُحَرَّم، وأفضَلُ الصلاةِ بَعدَ الفَريضةِ صلاةُ الليلِ. رواه مسلم(١١٦٣).

---

(١) لو: للتمني، لا للشرط.

واتــه: باشــترین ڕۆژی لــه دوای مــانگی ڕەمــەزان مــانگی موحــەڕڕەمی خودایه، وه باشترین نوێژ له دوای نوێژی فەرز شەو نوێژه.

## لەکاتی خەوتن شەیتان گرێ لە سەران دەدات

عـن أبـي هريـرة(رضي الله عنه) أنَّ رسـولَ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قال:يَعقِـدُ الشـيطانُ علـى قافِيَةِ رأس أحَدِكُمْ إذا هوَ نامَ ثَلاثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ على مكانِ كُلِّ عُقدَةٍ: عليك ليلٌ طويلٌ فارْقُد فإن اسْتَيقَظَ فَذَكَرَ اللهَ انْحَلَّتْ عُقدةٌ، فإنْ توَضَّأ انحَلّتْ عقدةٌ، فإنْ صلّى انْحَلَّتْ عُقدةٌ، فَأصْبَحَ نَشيطاً طَيِّبَ النَّفْسِ وإلاّ أصْبَحَ خَبيثَ النَّفسِ كَسلان. رواه البخاري(١١٢٤) و مسلم(٧٧٦).

١– قافية الرأس : آخِرُهُ، واته: کۆتایی سەر.

٢–عقدة : گرێ.

<u>**مانای فەرموودەکە:**</u> کاتێ دەخەون شـەیتان سـێ گـرێ لـه ئـاخیری سـەرتان دەدات ، لـه شـوێنی هـەموو گرێیـەك دەدات و دەڵـێ: بخـەوه شەوێکی درێژت له پێش ماوه , جا ئەگەر بەخەبەر هـات و یـادی خـوای کرد گرێیەك دەبێتەوه , وه ئەگەر دەستنوێژیشـی گـرت ئـەوه گرێیـەکی تریش دەبێتەوه، وه ئەگـەر نوێژیشـی کـرد گرێیـەك دەبێتـەوه جـا ئـەو کەسـه بـەیانی دەکاتـەوه بـه گـورج و گـۆڵی و دڵ خۆشـیەوه ئەگـەر نـا بەیانی دەکاتەوه به نەفس پیسی و تەمبەڵی.

## کاتی شەو نوێژو باشترین کاتی

شەو نوێژو کاتەکەی دەست پێ دەکات لە دوای نوێژی عیشا تا بانگی بەیانی، کەواتە تۆ دەتوانی لە دوای نوێژی عیشا شەو نوێژ بکەی پێش ئەوەش کە بخەوی، وە باشترین کاتیش بۆ شەو نوێژ ئەوەیە کە ئەگەر شەوت دابەش کرد بۆ شەش بەش بەشی چوارەم و پێنجەمی باشترین کاتە بۆ شەو نوێژ، بۆ نموونە ئەگەر شەو لە بانگی مەغریبەوە تا بانگی بەیانی نۆ سعات بوو دابەشی شەش بەشی بکەی هەر بەشەو یەك کاتژمێرو نیوی بەردەکەوێ، کەواتە ئەگەر رۆژ ئاوا بوون لە کات ژمێر حەوت دەست پێ بکات، باشترین کاتی شەو نوێژ لەم کاتەدا لە کاتژمێر یازدەو نیو دەست پێ دەکات تا دوو و نیو بەم بەڵگەی لای خوارەوە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ أَحَبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ وَأَحَبَّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ وَكَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا) رواه البخاري(١١٣١)ومسلم(١١٥٩)

واتە: بێگومان خۆشەویسترین رۆژوو لای خوا رۆژووی داوودە، وە خۆشەویسترین نوێژیش لای خوا نوێژی داوودە سەلامی خوای لەسەر بێت، تا نیوەی شەو دەخەوت، لەبەشی چوارەم و پێنجەمی شەو هەڵدەستا، وە لەبەشی شەشەمی دەخەوت، وە رۆژێك نا رۆژێك بە رۆژوو دەبوو.

## ژمارەی رکاتەکانی شەونوێژ:

١- عـن ابـي سَلَمَةَ(رضـي الله عنـه) قـال : أتيـتُ عائِشَةَ(رضـي الله عنهـا) فَقُلـتُ: أيْ أُمَّـهْ: أَخبِرينـي عَـنْ صـلاةِ رسـولِ الله(ﷺ) فقالـت: كانـتْ صَـلاتُهُ في شَهْرِ رمضـانَ وغيـرِهِ ثـلاثَ عَشْـرَةَ ركعةً بالليـلِ منهـا رَكعَتا الفَجْرِ. رواه مسلم(٧٣٨).

واتــە: ئــەبو ســەلەمە(رەزای خــوای لــیٚ بیٚــت) دەڵــیٚ: چــوومە لای عائیشە(رەزای خوای لیٚ بیٚت) گوتم: ئەی دایە پـیٚم بڵـیٚ پیٚغەمبـەر(ﷺ) چۆن شەو نوێژ دەکات؟ فەرمووی: نوێژەکانی پیٚغەمبەر(ﷺ) لە مـانگی رەمەزان و لە غەیری رەمەزانیش سێزدە رکـات بـووە لـە شـەودا بـە دوو رکاتی سوننەتی پیٚش نوێژی بەیانیشەوە.

عن عائشة قالت: (ماكان رسول الله (ﷺ) يزيدُ في رمضانَ ولا في غيرِهِ على إحدى عشرَ رَكعَةً) رواه البخاري (١١٤٧) و مسلم (٧٣٨).

واتە: عائیشـە (خـوا لیٚـی رازی بیٚـت) دەڵـیٚ: پیٚغەمبـەر (ﷺ) نـە لـە رەمەزان و نـە لـە غـەیری رەمـەزان لـە یـازدە رکـات شـەو نویـێژ زیـاتری نەکردووە.

جا پیٚغەمبەر (ﷺ) یازدە رکـات شـەو نوێـژی کـردووە، وە هـەروەها سابتیش بووە کە پیٚغەمبەر (ﷺ) لـەم ژمارەیەشـی کـەمتر کـردووە، وە هەندیٚ جاریش زیـاتری کـردووە، وە لـە هـەموویان لـە پیٚشـترو تـەواوتر کردنی یازدە رکات شەو نوێژە، وە لە مەزهەبی شافعیدا دەڵیٚ: (لا حصر لعدد رکعاتها) شەو نوێژ ژمارەی رکاتەکانی دیاریکراو نین، واتـە چـەندت

پـێ دەكـرێ دەتـوانی بیکـەی، وە ئـەم قسـەیەش لـە فـەتوای زانایـانی حیجازیشدا هاتووە بـەم شـێوەیە: (ومن زاد على هذا المقدار إلى ما شاء من الركعات فلا حرج عليه).

## دەست پێكردنی شەو نوێژ بە دوو ركاتی خەفیف

عـن أبي هريـرة(رضي الله عنه) أنَّ النـبيَّ(صلى الله عليه وسلم) قـال: اذا قـامَ أحَـدُكُم مِـنَ اللّيـل فَلْيَفْتَتِحْ صَلاتَهُ بِرَكعَتينِ خَفيفَتَينِ. **رواه مسلم(٧٦٨).**

**واتە: كاتێك یەكێك لە ئێوە هەستا لە شەودا با نوێژەكانی دەست پـێ بكات بە دوو ركاتی سووكەڵە(خفیف).**

## یەكێك لە دوعاكانی (استفتاح)ی شەونوێژ

**عن أَبي سَلَمَةَ قَالَ سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا بِم كَانَ يستفتح النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاتَهُ إِذَا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ ؟ قَالَتْ كَان يَقُولَ: اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنْ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ***

**بۆ تەندروست و مانای ئەم فەرموودەیە سەر لە (دعاء الاستفتاح) بدە .**

## سوننەتە شەو نوێژ دوو ركات دوو ركات بكرێ

عن ابن عمر(رضي الله عنه) أنَّ رجلاً سألَ رسولَ الله(ﷺ) عن صَلاة الليلِ؟ فقالَ رسول الله(ﷺ): صلاةُ الليلِ مثنى مثنى فإذا خَشِيَ أحَدُكُمُ الصُّبحَ صَلّى رَكْعَةً واحدةً توتِرُ لَهُ ما قَد صَلّى. رواه مسلم(٧٤٩).

واتە: پیاوێك لەپێغەمبەری پرسیار كرد(ﷺ) دەربارەی شەو نوێژ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: شەو نوێژ دوو ركات دوو ركاتە جا ئەگەر یەكێك لە ئێوە ترسا لە هاتنی بەیانی با یەك ركات نوێژ بكات دەبێ بە ویتری ئەو نوێژانەی كە كردوونی.

## فەرمان كردن بە كەس و كار و خەڵك بەشەو نوێژ كردن

١- عن عليّ (رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) طَرَقَهُ وفاطِمةَ ليلةً فقالَ ألا تُصَلّيان؟ رواه البخاري(١١٢٧) ومسلم(٧٧٥).

١-طَرَقَهُ: اتاهُ ليلاً، واتە: بەشەو هاتە لای.

**مانای فەرموودەكە:** علی كوڕی ابوطالب(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: شەوێكیان پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لای خۆی و فاطمة فەرمووی ئایا نوێژ دەكەن؟

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قالَ رسولَ اللهِ(ﷺ): رَحِمَ اللهُ رجلاً قامَ مِنَ الليل فَصَلّى وأَيْقَظَ امرأَتَهُ فإن أَبَتْ نَضَحَ في وَجْهِها الماءَ، رَحِمَ اللهُ امرأةً قامَتْ من الليلِ فَصَلَّتْ وأَيقَظَتْ زَوْجَها فَإنْ أَبَى نَضَحَتْ في وَجْهِهِ الماءَ. حسن صحيح رواه أبوداود(١٣٠٨).

واتـە: ڕەحمـەتی خـوا لـە پیاوێـك بێـت کـە لـە شـەو هەڵدەسـتێ و نوێژدەکا وە خێزانەکەشی هەڵدەستێنێ جا ئەگەر هەڵنەستا ئاو بپرژێنێ بە دەم چاویا، ڕەحمەتی خوا لەو ئافرەتە بێ کە بەشەو هەڵدەستێ نوێژ دەکا وە مێردەکەشی بەخەبەر دێنێ جا ئەگەر مێردەکەی هەڵنەستا ئـاو بپرژێنێ بە دەم و چاویا.

٣-عـن عبـدالله بـن عَمـرو بـن العـاص(ﷺ) قـال: قـال لـي رسـول اللهِ(ﷺ) يا عبـداللهِ لا تَكُـن مِثـلَ فـلانٍ كـانَ يَقـومُ مِـنَ اللَّيـلِ فتـركَ قيـامَ الليل. رواه البخاري(١١٥٢) ومسلم(١١٥٩).

واتە: عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرمووم : ئـەی عبـدالله وەکـو فلانـە کـەس مەبـە جاران شەو نوێژی دەکرد لە پاشان وازی لێ هێنا.

## نوێژی ویتر

نوێژی ویتر کاتەکـەی دەسـت پـێ دەکـات لـە دوای نوێـژی عیشـا تـا بانگی بەیانی، نوێژی ویـتر سـوننەتێکی (مؤکدة)یـە، بـۆ هـەر یـەکێك کـە بیەوێ شەو هەڵستێتەوە سوننەتە کۆتا نوێژی نوێژی ویـتر بێـت، ئەگـەر متمانەی بەخۆی هەبوو لە کۆتایی شەو هەڵبستێتەوە ئەوە سوننەتە کـە نوێژە ویترەکەی دوا بخـات بـۆ ئـەوەی کۆتـا نوێـژی نوێـژی ویـتر بێـت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (اجعلوا آخر صلاتكم بالليل وترا).

واتە: با کۆتا نوێژتان لە شەودا ویتر بێت.

## ژمارەی ركاتەكانی نوێژی ویتر

نوێژی ویتر بەچەند جۆرێك هاتووە لەوانە:

١- دەتوانی ئەگەر چەند شەو نوێژت كرد دوو ركات چوار ركات دە ركات لە كۆتاییدا یەك ركات نوێژی ویتر بكەی.

٢- دەتوانی هەموو شەو نوێژ تەنها یەك ركات نوێژی ویتر بكەی.

٣- وە دەتوانی سێ ركات بكەی لە دووەم سەلام بدەیەوە لە پاشان ركاتێكی تریش بكەی.

٤- وەدروستە نوێژی ویتر سێ یا پێنج یاحەوت یا نۆ ركات بكرێت .

عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلَاثٍ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ)

صحيح:رواه ابوداود(١٤٢٢)

واتە: نوێژی ویتر هەقە لەسەر هەموو موسڵمانێك، جا هەر یەكێك پێی خۆشە بە پێنج ركات ویتر بكات با بیكات ، وە هەر یەكێكیش پێی خۆشە بە سێ ركات ویتر بكات با بیكات، وە هەر یەكێش پێی خۆشە بە یەك ركات ویتر بكات با بیكات.

عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ( أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُوتِرُ بِثَلَاثِ رَكَعَاتٍ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْأُولَى بِ (سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) وَفِي الثَّانِيَةِ بِ (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ) وَفِي الثَّالِثَةِ بِ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَيَقْنُتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ فَإِذَا فَرَغَ قَالَ عِنْدَ فَرَاغِهِ سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ يُطِيلُ فِي آخِرِهِنَّ) صحيح:رواه النسائي(١٦٩٩)

واته: پێغەمبەر (ﷺ) بە سێ رکات نوێـژی ویـتری دەکـرد لـە رکـاتی یەکــەم ســورەتی (الأعلى) ی دەخوێنــد، لــە رکــاتی دووەم ســورەتی (الكــافرون)ی دەخوێنــد، لــە رکــاتی ســێیەم ســورەتی (الإخلاص) ی دەخوێند، وە لە رکاتی سێیەم پێش ئەوەی بچوبایە بـۆ روکـوع دوعـای قنـووتی دەخوێنـد، وە کاتێـك کـە تـەواو بوایـە سـێ جـاران دەیفـەرموو (سبحان الملك القدوس) لە سێیەم جاردا درێژی دەکردەوە.

**سوود**:

١- لـەم فەرموودەیـە دەردەکـەوێ کـە پێغەمبـەر (ﷺ) زۆر جـاران نوێژی ویتری بەسێ رکات کردووە.

٢- لەم فەرموودەیە دەردەکەوێ کە پێغەمبـەر (ﷺ) دوعـای قنـوتی کردووە لە نوێژی ویتر پێش ئەوەی بچێتە روکوع.

٣- وە سوننەتیشە کە نوێژی ویترت کرد سـێ جـاران بڵێـی (سـبحان الملك القدوس) جاری سێیەم درێژی بکەیتەوە.

# دوعای قنوت له نوێژی ویتردا

له فەرموودەی پێشتر ئەوەمان خوێندەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دوعای قنوتی کردووە لە نوێژی ویتردا پێش ئەوەی بچێتە روکوع.

جا دوعای قنوت له رکاتی کۆتایی نوێژی ویتر دەکرێ دەتوانی پێشی چوونە روکوع بیکەی ، وە دەتوانی لە دوای روکوع بیکەی چونکە هەردووکیان بەڵگەی راستی لەسەرە بەڵام لە دوای روکوع باشترە ، وە دەتوانی دەستەکانیشت بەرز بکەیەوە، وە باشتریش وایە کە بەردەوام نەبیت لەسەر دوعای قنوت لە نوێژی ویتردا، ئەوە سابت نەبووە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو رۆژێ دوعای قنوتی خوێندبێت.

حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دوعایەکی فێر کردم کە لە نوێژی ویتردا بیخوێنم.

عن الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ قَالَ ابْنُ جَوَّاسٍ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ (**اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ وَلَا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ** )صحيح:رواه ابوداود(١٤٢٥)والترمذي(٤٦٤)

## لەدوای نوێژی ویتر دەتوانی شەو نوێژ بکەی

قالت عائشة: (كان (ﷺ) يُصلي ثلاثَ عشرةَ ركعةً ، يُصلي ثمانَ رَكعات، ثم يُوتِرُ، ثُمَّ يُصلّي رَكعتين، وهو جالسٌ) **رواه مسلم(٧٣٨).**

**واتە: عائشە -خوا لێی رازی بێت- دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) سێزدە ركات شەو نوێژی دەكرد، هەشت ركاتی دەكرد، لە پاشان نوێژی ویتری دەكرد، لە پاشان دوو ركات نوێژی دەكرد بە دانیشتنەوە.**

**سوود**:

**١- ئەوەوی دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دوو ركاتەی كردووە بۆ ئەوەی روونی بكاتەوە كە نوێژ كردن لە دوای ویتر جائیزە , وە هەروەها نوێژی سوننەتیش بە دانیشتنەوە جائیزە، وە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەمەش بەردەوام نەبووە بەڵكو یەك جار یان چەند جارێكی كەم ئەمەی ئەنجام داوە.**

**٢- لە پێشترە كە موسڵمان نوێژی ویتر كۆتا نوێژی بێت لە شەودا، وە ئەگەر لە دوای ویتر نوێژی كرد جائیزە بۆی.**

**٣- كەواتە كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ:** (اجعلوا آخر صلاتكم بالليل وترا) **ئەمە بۆ سوننەتە نەك بۆ واجبێتی.**

**٤- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ:** (لا وِتران في ليلة)، **صحيح رواه أبو داود(١٤٣٩) والترمذي (٤٧٠).**

**واتە: دوو نوێژی ویتر لە یەك شەودا نییە . كەواتە ئەگەر نوێژی ویترت كرد لە پاشان لە هەمان شەو ویستت شەو نوێژ بكەی نوێژی ویتر دووبارە مەكەوە چونكە دەبێتە دوو نوێژی ویتر.**

# قەزاكردنەوەی شەو نوێژ و ویردەكانی

١-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: كان رسول الله(ﷺ) إذا عَمِلَ عملاً أثْبَتَهُ وكان إذا نامَ مِنَ الليلِ أو مَرِضَ صَلّى من النهار ثِنتي عَشْرَةَ رَكْعَةً، قالت: وما رأيتُ رسول اللهِ(ﷺ) قامَ ليلةً حتى الصَّباحِ وما صامَ شهراً مُتتابِعاً إلاّ رَمضانَ. رواه مسلم(٧٤٦).

١-أَثبَتَهُ: أي جعله ثابتاً غير متروك. واتە: جێگیری دەكردو بەبەردەوامی دەیكردو وازی لێ نەدەهێنا.

**مانـــای فەرموودەكـــە:** عائیشـــە(رەزای خـــوای لـــێ بێـــت) دەڵـــێ: پێغەمبەر(ﷺ) كاتێ كە كارێكی بكردبایـە بـە بـەردەوامی دەیكـرد , وە ئەگەر لە شەودا بخەوتبایە یا نەخۆش بایە لە ڕۆژدا دوزادە ركات نوێـژی دەكـــرد، وە عائیشـــە دەڵـــێ: پێغەمبـــەرم نـــەبینیوە(ﷺ) شـــەوێك هەستابێتەوە تا بەیانی , وە قەت هیچ مانگێكیش بە تـەواوی و یـەك لـە دوای یەك تیایدا بەرۆژوو نەبووە تەنها رەمەزان نەبێت.

٢ عن عمر ابن الخطاب(رضي الله عنه) يقول: قالَ رسولُ اللهِ(ﷺ) مَنْ نامَ عن حِزبِهِ أو عَنْ شيءٍ مِنهُ فَقَرَأَهُ فيما بينَ صلاة الفَجر وصلاة الظّهرِ كُتِبَ لَهُ كَأَنَّما قَرأَهُ مِنَ الليل. رواه مسلم(٧٤٧) وأبوداود(١٣١٣).

١- حِزبِهِ: وردە، ئەوەی كە بەردەوامی دەیكا لە خوێندنی قورئـان و ئەزكارو نوێژ.

مانای فەرموودەکە: هەر یەکێك خەوی لێ کەوت و ئەو شەوە ئەوەی کە هەموو شەوان لە قورئان خوێندن و ئەزکارو نوێژ کە دەیکردن نەیکرد یا هەندێکی نەکرد، جا لە پاشان لە نێوانی نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەرۆدا قەزای بکاتەوە بۆی دەنوسرێ وەکو ئەوە کە لە شەودا کردبێتی.

## زیکری بەشەو هەستان بۆ شەو نوێژ

عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ خَالَتُهُ فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ أَوْتَرَ ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ[1]،

---

(١) رواه البخاري (٤٥٧٢) و مسلم (١٧٨٧).

واته: کورەیب مەولای ابن عباس دەڵێ*

ابن عباس دەڵێ: شەو مامەوە لەلای (خوشکی دایکم) پلکم مەیمونـە، کە خێزانی پێغەمبـەرە (ﷺ) گـوتم تەماشـای نوێـژی پێغەمبـەر دەکـەم (ﷺ) (بۆ ئەوەی بزانم چۆن نوێژ دەکات) ئەو رایەخەی کە رایانخستبوو من لە باری پانییەکـەی پـاڵم دایـەوە، پێغەمبـەر و خێزانەکـەی لـە بـاری درێژیەکەی پاڵیان دایەوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) خەوت تـا نیـوە شـەو یـا کـــەمێك دوای نیوەشـــەو، جـــا پێغەمبـــەر (ﷺ) بەخەبـــەر هـــات و بەدەسـتەکانی خـەوی لـە دەم و چـاوی لادەدا , لـە پاشـان دە ئایـەتی کۆتایی سورەتی (آل عمران) ی خوێندەوە (کە خـۆی یـازدە ئایەتـە) لـە پاشان هەستا بۆ لای مەشکەیەکی هەڵواسراو دەست نوێژێکی جوانی لـێ شوشت، لە پاشان هەستا بۆ نوێژکردن (ابـن عبـاس) دەڵـێ: لـە پاشـان منیش وەکو ئـەوم کـرد ئـەوجا چـووم لـە تەنیشـت ئـەو راوەسـتام، جا پێغەمبەر (ﷺ) دەستی راستی لەسەری دانام وە هەروەها گوێی راسـتی گرتم (وەك لاواندنەوە) جا پێغەمبـەر (ﷺ) دوو رکـاتی کـرد، لـە پاشـان دوو رکاتی دیکەی کرد، پاشان دوو رکاتی تر، پاشـان دووی تـر، پاشـان دوو رکاتی دیکە، پاشان دوو رکاتی تریشی کرد، لە پاشان پـاڵی دایـەوە تا بانگدەر هات ئاگاداری کردەوە، جا هەستا دوو رکـاتی سـووکی کـرد، (واتە دوو رکاتی پێش نوێژی بەیانی) لە پاشان لە ماڵ چـووە دەرەوە و نوێژی بەیانی کرد.

# نوێژی بە کۆمەڵ - ( صَلاةُ الجماعَة)

## ئەوەی گوێی لەبانگ دەبێتو ناچێت بۆ مزگەوت

١-عن ابن عباس(رضي الله عنه) أن النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ سَمِعَ النداءَ فَلَمْ يُجبْ فَلا صَلاة لَهُ إلاّ مِنْ عُذرٍ[1].

**واتە: هەر کەسێك گوێی لە بانگ بوو وەڵامی نەداوەو نەچوو بۆ نوێژ ئەوە نوێژی بۆ نییە مەگەر(عذر)ی هەبێت.**

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قالَ:أتى النبيَّ(ﷺ) رجلٌ أعمى فقالَ: يا رسول الله إنَّهُ ليسَ لي قائِدٌ يَقودُني الى المسجدِ فَسألَ رسول الله(ﷺ) أنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلّي في بيته فَرَخَص لَهُ فَلَما ولّى دعاهُ فقالَ: هَلْ تسمَعُ النِّداءَ بالصلاة؟ فقال: نَعمْ، قال: فأجب. رواه مسلم(٦٥٣).

**واتە: پیاوێکی نابینا هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسم نییە دەستم بگرێ بۆ مزگەوتم ببات ، جا داوای لە پێغەمبەری خوا کرد کە مۆڵەتی بدات لە ماڵی خۆی نوێژ بکات ، ئەویش مۆڵەتیدا ، بەڵام کە ڕۆیشت بانگی کرد فەرمووی: ئایا گوێت لە بانگ دەبێت بۆ نوێژ؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دە وەڵام بدەرەوە.**

**سوود:**

**١- ئەم فەرموودەیەی لای سەرەوە(مسلم) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت**

---

(١) الحديث أخرجه أبوداود و ابن ماجه (٩٣٧) والدار قطني والحاكم والبغوي والبيهقي وصححه من العلماء: الذهبي والنووي وابن حجر العسقلاني وابن تيميه وابن القيم والالباني.

له صەحیحەکەیدا لە ژێر ناوو نیشانی :(باب یجب اتیان المسجد علی من سمع النداء) دێنیّ واتە: پێویستە هاتن بۆ مزگەوت لەسەر ئەو کەسەی کە گوێ ی لە بانگ دەبێت .

٢- ئەوانەی کە گوێیان لە بانگ دەبێت بەڵام ناچنە مزگەوت نوێژەکە بە جەماعەت بکەن ، بەڵکو نوێژەکە لەماڵەوە دەکەن ، ئەوانە نوێژەکەیان قەبووڵە بەڵام گوناحی ئەوەشیان بۆ دەنووسریّ کە بە جەماعەت نەیان کردووە لە مزگەوت.

## گەورەیی نوێژی جەماعەت

١-عن ابن عمر(رضي الله عنه) أن رسول الله(صلى الله عليه وسلم) قال: صلاةُ الجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاةِ الفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشرِينَ دَرَجَةً. رواه البخاري(٦٤٥) ومسلم(٦٥٠).

(١)الفذّ: الواحد، واتە تاك.

واتە: نوێژی بە کۆمەڵ(جماعە) باشترە لە نوێژی بە تەنیایی بە بیست و حەوت پلە.

٢- عن عثمان بن عفان(رضي الله عنه) قال: سَمعتُ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يقول: مَنْ صَلّى العِشاءَ في جَمَاعَةٍ فَكأَنّما قامَ نِصْفَ اللّيلِ ومَنْ صَلّى الصُّبْحَ في جَماعَةٍ فكأَنّما صَلّى الليلَ كُلَّهُ. رواه مسلم(٦٥٦).

واتە: هەر کەسیّ نوێژی خەوتنان(عشاء) بە کۆمەڵ(جماعة) بکات ئەوە وەکو ئەوە وایە تا نیوە شەو هەستابێتەوە(بۆ خوا) ، وە هەر یەکێکیش نوێژی بەیانیش بە جەماعەت بکات ئەوە وەکو ئەوە وایە کە ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر شەو نوێژی کردبێت .

٣- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول(صلى الله عليه وسلم): من صَلّى لِلهِ أَربعين يوماً في جماعةٍ يُدركُ التكبيرةَ الأُولى كُتِبَ لَهُ براءَتان: براءةٌ مِنَ النّارِ وبراءةٌ مِنَ النِّفاق. حسن رواه الترمذي(٢٤١).

**واته: هەر کەسێك چل ڕۆژان نوێژ بکات بۆ خودا بە جەماعەت بە(الله اكبر)ی یەکەم رابگات ئەوە دوو رزگار بوونی بۆ دەنوسرێ: رزگار بوونێك لە ئاگری جەهەننەم وە رزگار بوونێك لە دووڕوویی(نفاق).**

# گەورەیی ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەماعەت

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول(صلى الله عليه وسلم): مَنْ تَطَهَّرَ في بَيتِهِ ثُمَّ مَشى الى بيتٍ مِنْ بيوتِ الله تعالى لِيقضِيَ فريضةً مِنْ فرائِضِ اللهِ كانت خَطوَتاهُ احداهُما تحط خطيئةً والأخرى تَرْفَعُ دَرَجةً. رواه مسلم(٦٦٦).

١- مَنْ تَطَهَّرَ في بَيتِهِ: أي توضأ، **واتە: هەر یەکێك دەست نوێژ بشوا لە ماڵەوە.**

٢- خَطوَتاهُ: **دوو هەنگاوەکانی،** (خَطوَتا) **لە بنەرەتدا**(خَطوتان) **بووە بەڵام ئەگەر**(مثنى) **یا**(جمع مذكر سالم) اضافه **کران نونەکانیان لادەبرێن، جا**(خطوتان)(مثنى)**یە** اضافه **کرایە بۆ**(هـ)**یەکە تاکەکەشی**(خطوة)**یە واتە: هەنگاو، شەقاو.**

**مانای فەرموودەکە: هەر کەسێك لە ماڵەوە دەست نوێژ بشوات لە پاشان بڕوا بۆ ماڵێك لە ماڵەکانی خوای بەرز بۆ ئەوەی فەرزێك لە فەرزەکانی خوا جێ بەجێ بکات دوو هەنگاوەکانی یەکێکیان گوناهێك لادەبات وە ئەوەی تریان پلەیەکی پێ بەرز دەکاتەوە.**

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: ألا أَدُلُّكُم على ما يَمحُو اللهُ بِهِ الخطايا ويرفعُ بِهِ الدَّرجات؟ قالوا: بلى يا رسول الله، قال: إسباغُ الوضوءِ على الْمَكارِهِ، وكَثرةُ الخُطا الى الْمَساجِد , وانتظارُ الصلاةِ بعدَ الصلاةِ , فَذلكُمُ الرِّباطُ. رواه مسلم(٢٥١).

١- دَلَّ: نیشانی دا، (یَدُلُّ) نیشان دەدا (أَدُلُّكُم) نیشانتان دەدەم.

٢- الخطایا: کۆیە ، تاکەکەی(خطیئة)یە واتە: گوناح.

٣-الرِّباط: واتە: ئێشك گرتن چاو لە سنوور بوون سەنگەرنشینی کە بریتی یە لەمانەوەو ئارام گرتن لە سنووری دوژمندا بۆ پاراستنی موسڵمانان.

واتە: ئایا پێتان بڵێم بەو شتەی کە خوا بە هۆیەوە گوناهانی پێ لا دەبات و پلانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ گوتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: دەست نوێژ شوشتن بە تەواوی لە کاتی ناخۆشیدا , زۆر شەقاو هاوێشتن بۆ مزگەوتەکان , چاوەڕوان کردنی نوێژ لە دوای نوێژ , ئەمانەن سەنگەر نشینی یە بۆتان.

٣- عن أُبيِّ بن كَعبٍ(رضي الله عنه) قال: كانَ رجُلٌ لا أَعْلَمُ أَبْعَدَ مِنَ المسجد مِنهُ و كان لا تُخطئُهُ صلاةٌ قال: فَقيل لَهُ أو قلتُ لهُ لَو اشْتَريتُ حِماراً تَرْكَبُهُ في الظَّلْماءِ وفي الرَّمْضاءِ قال: مايَسُرُّني أنَّ مَنْزِلي الى جَنْبِ المسجِدِ إني أُريدُ أنْ يُكْتَبَ لي مَمْشايَ الى المسجِدِ وَرجُوعي اذا رَجَعْتُ الى أهلي، فقال رسول اللهِ(ﷺ): قدْ جَمَعَ اللهُ لكَ ذلك كُلَّه. رواه مسلم(٦٦٣).

واتە: (أُبيٌّ) کوڕی کەعب(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوێك نازانم هیچ پیاوێك لە ئەو ماڵی دوورتر بێت لە مزگەوت هیچ نوێژێکی بە بێ

جەماعەت نەدەچوو پێی گوترا یا پێم گوت ئەگەر گوێدرێژێکت بکڕیبایە سواری ببای لە شەوی تاریك و وە لە کاتی گەرمای بەتین؟ پیاوە ئەنصاریەکە گوتی: پێم خۆش نییە ماڵم لە تەنیشت مزگەوت بێت من دەمەوێ کە بۆم بنوسرێ کاتێك لەم سەرەوە دەچم بۆ مزگەوت، وە لەو سەرەوەش کە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خودا ئەوانەی هەموو بۆ کۆکردویەوە.

٤- عن أبي أمامة قال:قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) :(من مشى الى صلاةٍ مكتوبةٍ في الْجَماعةِ فهي كحَجَّةٍ ، ومَن مشى الى صلاةٍ تَطَوُّعٍ فهي كعُمرة تامَّةٍ )رواه الطبراني في معجم الكبير(٧٥٧٨) وحسنه الالباني في صحيح الجامع(٦٥٥٦) .

واتە :هەر کەسێك بڕوات بۆ کردنی نوێژێکی فەرز بە جەماعەت لە مزگەوت خێرو پاداشتی حەجێکی هەیە ، وە هەر کەسێك بڕوا بۆ مزگەوت بۆ کردنی نوێژێکی سوننەت ئەوە پاداشتی عومرەیەکی تەواوی هەیە .

٥- عن عبد الله بن عمْرٍو - رضي الله عنهما - قال: قال رسول الله - صلى الله عليه وسلم: ( منْ راحَ إلى مسجدِ الجماعةِ، فَخطْوةٌ تمْحو سَيِّئة , وخطْوةٌ تُكْتب له حسنةً، ذاهباً وراجعاً ) انظر صحيح الجامع: (٥٩١٢) وقال الهيثمي في (المجمع)رواه الطبراني ورجاله الصحيح

واتە :هەر یەکێك بچێتە ئەو مزگەوتەی کە نوێژی جەماعەتی تیادا دەکرێ ، هەنگاوێکی گوناحێکی دەسڕێتەوە ، وە بە هەنگاوێکیشی چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ بە چوون و گەڕانەوەی .

٦- عن بريدة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) قال: بَشِّرِ المَشَّائِينَ في الظُّلَمِ الـى المسـاجدِ بـالنُّور التَّـامِّ يَـومَ القيامـةِ. صـحيح أبـوداود(٥٦١) والترمذي(٢٢٣).

ظُلَم: کۆیە، تاکەکەی(الظُّلْمَةُ)یە واتە: تاریکی. وە(ظُلَم) تاریکیەکان.

واتـە: مـژدە بـدە بەوانـەی کـە لـە تاریکاییەکانـدا دەچـن بـۆ مزگەوتەکان(واتە بۆ نوێژی عیشاو بەیانی) بە ڕۆناکیەکی تەواو لـە ڕۆژی قیامەت دا .

## چۆنیەتی وەستانی ئیمامو مەئموم:

١- عن ابن عباس(رضي الله عنه) بعثني العباسُ الى النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) وهو في بيت خالتي مَيمونَةَ فَبِتُّ مَعَهُ تلك الليلَةَ فَقامَ يُصَلّي مِنَ الليلِ فَقُمْتُ عن يَسارِهِ فَتَناولَني مِنْ خَلفِ ظهرِهِ فَجَعَلني على يَمينِهِ. رواه البخاري(٦٩٧) ومسلم(٧٦٣).

واتە: ابن عباس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ(عباس) کە دەکا بـاوکی منی نارد بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە لە ماڵی پلکم(میمونە) بوو، ئەو شـەو لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مامەوە، جا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا نوێژی کرد لـە شەودا , منیش چووم لە لای چەپی وەستام جا لە پشتیەوە منی گرت و هێنامیە لای ڕاستی.

**سوود:**

١-یەك پیاو ئەگەر لەگەڵ ئیمامدا نوێژیان کرد بە جەماعـەت ئـەوە ڕاسـت لە تەنیشت ئیمام ڕادەوەستی لە لای ڕاستی بەبێ پاش و پێش.

٢- (میمونـە) ڕەزای خـوای لـێ بێـت دایکـی ئیماندارانـە خێزانـی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم).

٢- عن أنس(رضي الله عنه) أنَّ رسول اللهِ(صلى الله عليه وسلم) صلَّى بهِ وبأُمِّهِ أوْ خالَتِهِ قالَ: فأَقامَني عن يمينِهِ وأقامَ المرأةَ خلْفَنا. رواه البخاري(٧٠٠) و مسلم(٦٦٠).

واته: ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێشنوێژی بۆ من و دایكم یان پلكم كرد منی لە لای ڕاستی دانا وە ئافرەتەكەش لە دوامانەوە .

## هەندێ بابەتی فیقهی دەربارەی نوێژی جەماعەت:

(أ)نوێژی جەماعەت جێ بەجێ دەبێت بە دوو كەس یەكێكیان پێش نوێژو ئەوی تریان شوێن كەوتوو.

(ب) ئەگەر یەك نوێژ خوێن لەگەڵ ئیمامدا نوێژی كرد ئەوە لە تەنیشت ئیمامەكە ڕادەوەستێ بەبێ پاش و پێش , بەڵام ئەگەر ئافرەتێك بوو نوێژی لە دوای پیاوێك دەكرد ئەوە لە پشتیەوە ڕادەوەستێ.

(ج) دورستە پیاو ئیمامەتی بۆ ژنان بكەن.

(د) دورستە ئافرەتان خۆیان یەكێكیان بكەن بە پێش نوێژ.

(ح) دورستە منداڵ یان كوێر پێش نوێژی بۆ پیاوان بكەن.

(خ) یەكێك نوێژی فەرز بكات دەتوانێت لە پشتی پێشەوایەكەوە(إمام) نوێژ بكات كە نوێژی سوننەت بكات هەروەها بە پێچەوانەش.

(هـ) پێش نوێژی ئافرەت هەر لە ناوەڕاستی ڕیزەكەدا ڕادەوەستێت.

# گەورەیی ریزەکانی پێشەوە

**١-عن ابي هريرة(ﷺ) أنَّ رسولَ الله(ﷺ): قال: لَو يَعلمُ الناسُ ما في النِّداءِ والصَفِّ الأَوَّلِ , ثُمَّ لم يَجِدوا إلاّ أنْ يَستَهموا عليهِ لآسْتَهمُوا ولو يعلمون ما في التَّهجيرِ لاسْتبقوا إليهِ ولو يعلمون ما في العَتمةِ والصُبحِ لأَتوهما ولو حَبْواً. رواه البخاري(٢٦٨٩) و مسلم(٤٧٣).**

١-يستهموا :(الاستهام) يانى(الاقتراح) **واتە: قورعەکردن.**

٢- التهجير :( هو التبكير الى الصلاة أي صلاة كانت) **واتـە: زوو چـوون بـۆ نوێژ جا هەر نوێژێك بێت.**

٣- العتمة : **مەبەست پێ ی نوێژی عیشایە.**

٤- الحبو : أن يمشي على يَديه و ركبتيه، أو أسته. **واتـە: لەسـەر دەسـت و چۆکەکانی بڕوا یا بە قونە خشکی.**

**واتە: ئەگەر خەڵك دەیـانزانی خێـری بانگـدان و ریـزی یەکـەمی نوێـژی جەماعەت چەندە , لە پاشان دەستیان نەکەوتبایە جگە لەوەی قورعەیان لەسەر بکەن , ئەوە قورعـەیان لەسـەر دەکـردن , وە ئەگـەر دەیـان زانـی خێری زوو چوون بۆ نوێـژ چـەندە ئـەوە پێشـبرکێیان بـۆلای دەکـرد , وە ئەگەر دەیانزانی نوێژی عیشاو بەیانیان بە جەماعەت خێری چەندە بۆیان دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکە و قونەخشکەش بوایە.**

٢- عن أبي أُمامة(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ اللهَ وملائكتَهُ يُصَلّون على الصَّفِّ الأوَّلِ، قالوا يا رسولَ الله وعلى الثاني، قال: إنَّ اللهَ وملائكتَهُ يُصَلّون على الصَّفِّ الأوَّلِ، قالوا يا رسولَ اللهِ وعلى الثاني؟ قالَ وعلى الثاني. **رواه أحمد والطبراني بسند صحيح.**

واته: بێ گومان خواو مەلائیکەتەکانی خوا صەلەوات دەدەن لەسەر ڕێزی یەکەم گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی ئی دووەم؟ فەرمووی خواو مەلائیکەتەکانی خوا سەڵەوات دەدەن لەسەر ڕێزی یەکەم گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی دووەم فەرمووی: دووەمیش.

٣- عن البراء بن عازب(ﷺ) قال: كان رسول الله(ﷺ) يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِن ناحيةٍ الى ناحيةٍ، يَمْسَحُ صُدرنا ومَناكبنا ويقولُ: لا تَختلفوا فَتَختَلِفَ قلوبكم وكانَ يقولُ: إنَّ اللهَ وملائكتَهُ يُصلُّونَ على الصفوف الأُوَلِ. صحيح رواه أبوداود(٦٦٤).

واتە: بەڕائی کوڕی عازب(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتە نێوان ریزەکانەوە لە لایەك بۆ لایەکی تر دەستی بە سینگ و شانمان دادەهێنا وە دەیفەرموو: نارێك مەوەستن ئەگینا نارێکی و ناکۆکیتان تێ دەکەوێ وە دەیفەرموو: بێ گومان خواو مەلائیکەتەکانی صەڵەوات دەدەن لەسەر ریزەکانی پێشەوە.

**سوود** : لێرەدا سەڵەواتەکە بۆ سەر (الصفوف) هاتووە کە کۆیە , کۆش بە لای کەمی سێ دەگرێتەوە کەواتە بە لای کەمی لێرەدا ریزی یەکەم و دووەم و سێیەم دەگرێتەوە .

## ڕێکخستنی ریزەکانی نوێژ:

١-عن جابر بن سمرة(رضي الله عنه) قال: خرَجَ علينا رسولُ الله(ﷺ) **فقال: ألا تَصُفُّونَ كما تَصُفُّ الملائكةُ عند رَبِّها؟ فَقُلْنا: يا رسولَ اللهِ وكيفَ تَصفُّ الملائكَةُ عند رَبِّها؟ قالَ: يُتِمُّونَ الصُّفوفَ الأُولَ ويتراصونَ في الصَّفّ. رواه مسلم(٤٣٠) .**

**واتــە: جــابری کــوڕی ســەمورە(رەزای خــوای لــێ بێــت) دەڵــێ: پێغەمبــەر(ﷺ) هاتــە لامــان فــەرمووی: ئایــا بــۆ ریــز نــابن وەکــو چــۆن فریشتەکان ریز دەبەستن لای پــەروەردگاریان؟ گوتمــان ئــەی پێغەمبــەری خوا فریشتە چۆن ریــز دەبــن لای پــەروەردگاریان ؟ فــەرمووی: ریزەکــانی یەکەم پردەکەنەوە وە لە ریزدا پاڵ دەدەن بەیەکەوە.**

٢- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: رُصُّوا صُفُوفَكُمْ، وقارِبُوا بينها، وحَاذُوا بالأعناق، فَوالذي نفسي بيدهِ إنّي لأَرى الشَّيطانَ يَدخُلُ من خَلَلِ الصَّفِّ كأَنَّهُ الحَذَفُ. صحيح رواه ابوداود(٦٦٧) والنسائي(٨١٤).

١- مُحاذاة : **بارامبەر.**

٢- الحَذَفُ : غنَمٌ سود صغار تكون باليمن، **مــەڕی رەشــی گچــکەن لــە یەمەن(الحذف) کۆیە، تاکەکەی(حَذَفة)یە.**

**واتە: ریزەکانتان ریك بخەن و پــاڵ بــدەن بــە یــەکتری , وە نێــوانی ریزەکــان لەیەکەوە نزیك بکەنەوە(واتە ریزی یەکەم لەگەڵ دووەم، دووەم لەگــەڵ ســێ یەم، وە هــەروەها) وە شــان و ملتــان لــە راستــی یــەك رابگــرن، جــا ســوێندم بەوەی کە گیانی منی بە دەستە شەیتان دەبینم لە کــەلێنی ریزەکــان دێتــە ژوورەوە دەڵێی مەڕە ڕەشە گچکەکانی یەمەنن.**

## شوێن کەوتنی ئیمام لە نوێژی جەماعەتدا:

١-عن أبي هريرة(ﷺ) قال: كان رسول الله(ﷺ) يُعلِّمُنا، يقولُ: لاتُبادروا الإمامَ إذا كبَّر فَكَبِّروا واذا قال(ولا الضالين) فقولوا: آمين، واذا ركَعَ فاركعوا وإذا قالَ: سمعَ اللهُ لِمن حَمِدهُ فقولوا: اللهمَّ ربّنا لك الحمدُ. رواه مسلم(٤١٥).

**واته: پێش ئیمام مەکەون ئەگەر گوتی(الله اکبر) ئینجا ئێوە بڵێن(الله اکبر) وە ئەگەر گوتی(ولا الضالين) ئینجا ئێوە بڵێن(آمین) وە ئەگەر روکوعی برد ئینجا ئێوەش برۆنە روکوع وە ئەگەر گوتی(سمع الله لمن حمده) ئینجا ئێوە بڵێن(اللهم ربنا لك الحمد).**

٢- عن أبي هريرة(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): أَمَا يَخشَى الذي يَرفَعُ رَأسَهُ قَبلَ الإمامِ أنْ يُحَوِّلَ اللهُ رَأسَهُ رَأسَ حمارٍ؟ رواه البخاري(٦٩١) ومسلم(٤٢٧).

**واته: ئایا ئەو کەسەی سەری پێش ئیمام بەرز دەکاتەوە ناترسێ کە خودا سەری بگۆڕێ بەسەری گوێ درێژ.**

**سوود**:

١-(اتفق العلماء على أَنَّ السَّبقَ في تكبيرةِ الإحرامِ أو السَّلام يَبطلُ الصَّلاة واختلوا في السبقِ في غيرهما فعندَ احمد يبطلها، قال: ليس لمن يسبق الإمام صَلاةٌ أما المساواةُ فمكروهةٌ[١].

---

(١) فقه السنة.

واتە: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە پـێش کـەوتنی ئیمـام لـە(الله اکبر)ی نوێژدابەسـتن و سـەلام دانـەوە نوێـژ بـەتاڵ دەکاتـەوە , بـەلآم بێجگـە لـەم دووە جیاوازیـان هەیـە، لای ئیمـام ئەحمـەد پـێش کـەوتنی ئیمام بێجگە لەم دوو شوێنەش هەر نوێژ بـەتاڵ دەکاتـەوە , گوتویـەتی ئەوەی پێش ئیمام دەکەوێ نوێژی بـۆ نییـە بـەلآم بـە یەکسـانی لەگـەڵ ئیمام دا بڕۆی ئەوە مەکروهە.

## ٢- مەئموم لەگەڵ ئیمام چوار حاڵەتی هەیە:

أ-(مسـابقتهُ) واتـە: پـێش کـەوتنی ئیمـام ئەمـە حەرامـەو هەنـدێکیش دەڵێن نوێژی پێ بە تاڵ دەبێتەوە ، بـەلآم ئەگـەر لـە(تکبیرە الاحـرام)ی یەکـەم و سـەلام دانـەوە پێشـی ئیمـام کـەوت ئـەوە نوێژەکـەی بـەتاڵ دەبێت.

ب- (موافقتـهُ) واتـە: لەگـەڵ ئیمـام بـڕۆی بـێ پـاش و پـێش ئەمـە مەکروهە.

ج- (مُتابعتـهُ) واتـە: دوای ئیمـام بکـەوی بـەبێ دوا کـەوتن ئەمـە شەرعییە.

د- (التخلف) واتە: ئەوەندە دوا بکەوی لـە ئیمامەکـەی کـە لـە شـوێن کەوتن(متابعە) دەربچی ئەوە شەرعی نییە[1]

٣-سوننەتە تـا ئیمـام هـەردوو سـەلامی نویـژ بـە تـەواوی نەداتـەوە تـۆ دەست بە سەلام دانەوە نەکەی .

---

(١) الفتاوى المهمة- عثيمين

٣- عن البراء(رضي الله عنه) قال: كان رسول الله(ﷺ) إذا قال: سمع اللهُ لِمَن حَمِدَهُ، لم يَحْنِ أحدٌ مِنّا ظَهرهُ حتّى يَقعَ النبيُّ ساجداً ثُمَّ نَقعُ سُجوداً بَعدَهُ. رواه البخاري(٦٩٠).

واتە: (براء) رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بیفەرمووبایە(سمع اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) هیچ کەسێك لە ئێمە پشتی نەدەچەماندەوە تاوەکو پێغەمبەر(ﷺ) سەجدەی دەبرد ، ئەوجا لە پاشان ئێمە سەجدەمان دەبرد.

## ئەوەی دەچێ بۆ جەماعەت دەبینی نوێژکراوە

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبيُّ(ﷺ): مَن توضَّأ فَأَحسنَ وُضوءَهُ ثُمَّ راحَ فَوَجَدَ الناسَ قَدْ صَلُّوا أعطاهُ اللهُ جَلَّ وعَزَّ مثل أجرِ مَن صلاّها وحضرها لا ينقصُ ذلك مِنْ أجْرِهم شيئاً. صحيح رواه أبوداود(٥٦٤).

واتە: هەر کەسێك دەست نوێژێکی جوان بشوات لە پاشان بچێ بۆ نوێژی جەماعەت بینی خەڵك نوێژیان کردووە , خوا(جل وعز) پاداشتی وەکو ئەوانە پێ دەدات کە نوێژیان بە کۆمەڵ کردوەو ئامادەی بوینە , ئەوەش هیچ لە پاداشتی نوێژ کارەکان کەم ناکاتەوە .

**کۆتا قسەم** : سلێمانی دارانی(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: هەر کەسێك نوێژێکی بە جەماعەتی بچێت ئەوە گوناحێکی کردووە.

# زیکری پەیوەندیدار بە مزگەوت

## پاڕانەوەی لە ماڵ دەرچوون بۆ مزگەوت

١- عن ابن عباس قال: ..... فخرج الى الصلاة (يعني النبي (ﷺ) إلى صلاة الصبح، وهو يقول: (أللهم اجْعَل في قلبي نوراً، وفي لساني نوراً، واجْعَلْ في سمعي نوراً، وأجعل في بصري نوراً، واجعل مِن خَلفي نوراً، واجْعل مِن أمامي نوراً، واجْعل مِن فَوقي نوراً، ومِن تَحتي نوراً، أللهم اعْطني نوراً) [1]، **رواه البخاري (٦٣١٦) ومسلم (٧٦٣) وهذا لفظه.**

**واتە: ابن عباس خوا لێی رازی بێت.. دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی فەرمووی: ئەی خودایە نورو روناکی بخە دڵمەوە، وە نور بخە زمانمەوە، وە نور بخە بیستنمەوە، وە رۆناکی بخە بینینمەوە، وە روناکی بخە دوامەوە، وە روناکی بخە پێشمەوە، وە روناکی بخە سەرەوەم، وە روناکی بخە ژێرەوەم، ئەی خودایە روناکیم پێ بدە.**

## زیکری چوونە ناو مزگەوت:

**١- ئەنەس رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: سوننەتە کە چویتە ناو مزگەوت بەپێی راست بچیت، وە کە دەرچووی بەپێی چەپ دەربچی** .(الحديث اسناده حسن , رواه الحاكم وقال صحيح الاسناد)

٢- عن فاطمة بنت رسول الله (ﷺ) قالت: كان رسول الله (ﷺ) إذا دخل المسجد يقول : بسم الله، والسلام على رسول الله، أللهم اغْفر لي ذُنوبي وافْتَحْ لي أبوابَ رَحْمتكَ) صحيح رواه ابن ماجة (٧٧١).

---

(١) الحديث اسناده حسن، رواه الحاكم وقال صحيح الاسناد.

**واتـه: فاتیمـەی کیـژی پێغەمبـەر (ﷺ) دەڵـێ: کاتێـك کـە پێغەمبـەر (ﷺ) بچووبا ناو مزگەوت دەیفـەرموو:** (بسم الله، والسلام على رسول الله، أللهم اغفر لي ذنوبي وافْتح لي أبواب رحمتك).

**واتە: بەناوی خوا، سەلام لەسـەر پێغەمبـەری خـوا، ئـەی خودایـە لـە گوناحم خۆش بە، وە دەرگاکانی رەحمەتی خۆتم لێ بکەوە.**

٣-عن عبدالله بن عمرو بن عاص(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) أنَّهُ اذا دَخَلَ المسجِدَ قالَ: (أعوذ باللهِ العظيم وبوَجهِهِ الكريم وسُلْطانهِ القديم من الشيطان الرجيم)، فإذا قال ذلك، قال الشيطان: حُفِظ مِنّى سائرَ اليوم. **صحيح: رواة أبو داود (٤٦٦).**

**واتە: (عبدالله) کوڕی عەمر دەڵێ: کاتێك کـە پێغەمبـەر(ﷺ) بچـوبایە ناو مزگەوت دەیفەرموو (أعوذ باللهِ العظيم وبوَجهِهِ الكريم وسُلْطانهِ القديم من الشيطان الرجيم)، خۆم دەپـارێزم بـەخوای گـەورە وە بـە ڕووی بـەرێزی، وە بـە دەسـەڵاتی دێرینـی لـە شـەیتانی دەرکراو(لـە رەحمەتی خوا) جا ئەگەر ئەمەی گوت شەیتان دەڵێ: پـارێزراوی لـە مـن بەدرێژایی ئەم ڕۆژە.**

**ڕوونکردنـەوە**:ئایـە زیکـری چـوونە نـاو مزگـەوت لـە دەرگـەی حەوشەی مزگەوت دەیلێیی یا لە دەرگەی ژوورەوە قسەی زانایان لەسەر هەردووکیان هەیە.

## سلاوی مزگەوت(تحيَّة المسجد):

١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا دَخَلَ أحَدُكُمُ المسـجدَ فـلا يَجْلِـسْ حَتَّـى يُصَـلِّيَ ركعتَـينِ. رواه البخـاري(١١٦٣) ومسلم(٧١٤).

**واتە: ئەگەر یەكێتان چووە مزگەوت با دانەنیشی تا وەكو دوو ركات نوێژ دەكات.**

٢- عـن جـابر بـن عبـدالله قـالَ: كـانَ لـي علـى النبـيِّ(ﷺ) دَيـن فَقَضـانِي وزادنِـي وَدَخلْـتُ عليـه المسـجدَ فقـالَ لي(صَـلِّ ركعَتـين) رواه مسلم(٧١٥).

**واتە: جابر(رەزای خوای لێ بێـت) دەڵـێ: قـەردێكم لەسـەر پێغەمبـەر بوو(ﷺ) قەردەكەی دامەوەو زیاتریشی دامێ وە چومە لای لـە مزگـەوت پێی فەرمووم: دوو ركات نوێژ بكە.**

**سوود** : (عثيمين) **دەڵێ : بۆ نموونە ئەگەر چوویتە مزگەوت یەكسەر دوو ركـات سـوونەتی پـێش نوێـژی بـەیانیت كـرد ئـەو كاتـە ئـەم فەرموودەیەشت جێ بە جێ كردووە .**

## زیكری دەرچوون لە مزگەوت

١- عن فاطمةَ بنتِ رسولِ الله (ﷺ) قالتْ: كان رسولُ الله (ﷺ) اذا خرجَ (يعني من المسجد) قال: (بسم الله والسلام على رسول الله، اللهم اغفر لي ذُنوبي وافْتح لي أبواب فَضْلكَ) صحيح رواه ابن ماجة (٧٧١).

**واته: فاتیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە لە مزگەوت دەردەچوو دەیفەرموو: (بسم الله والسلام علی رسول الله، اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب فضلك) .**

**واته: بەناوی خوا، سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا، ئەی خوایە لە گوناحەکانم خۆش بە، دەرگاکانی بەخششی خۆتم لێ بکەوە.**

٢- عن أبي هريرة أن رسول الله (ﷺ) قال: (إذا دخل أحَدُكم المسجدَ فَلْيُسَلِّمْ على النبي صلى الله عليه وسلم وَلْيَقُلْ اللهم افْتح لي أبواب رحمتك وإذا خرجَ فلْيُسلم على النبي صلى الله عليه وسلم ولْيَقلْ اللهم اعْصِمْني من الشيطان الرجيم) صحيح رواه ابن ماجة (٧٧٣).

**واته: کاتێك یەکێك لە ئێوە چووە مزگەوت، با سەلام لە پێغەمبەر بکات (ﷺ) وە بڵێ: (اللهم افتح لي أبواب رحمتك) واتە: ئەی خودایە دەرگاکانی رەحمەتی خۆتم لێ بکەیتەوە، وە کاتێکیش دەرچوو لە مزگەوت با سەلام لە پێغەمبەر (ﷺ) بکات وە بڵێ (اللهم اعْصِمْني من الشيطان الرجيم) واتە: ئەی خودایە بمپارێزە لە شەیتانی دوورخراوە لە رەحمەتت.**

## بانگەواز کردن بۆ شتی وون بوو لە مزگەوت

١- عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) (مَن سَمِع رَجلاً يَنشدَ ضالّةً في المسجد فلْيقلْ : لا رَدَّ ها الله عليك، فإنَّ المساجدَ لم تُبنَ لهذا) رواه مسلم (٥٦٨).

واتە: هەر یەکێك گوێی لە پیاوێك بوو بانگەوازی دەکرد بۆ شتێکی ونبوو لە مزگەوت با بڵێ: خوا بۆت نەگێڕێتەوە، چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون.

٢- عن أبي هريرة أن رسول الله (ﷺ) قال: (اذا رأيتم من يبيعُ ويَبتاعُ في المسجد فقُولوا: لا أربحَ اللهُ تِجارتكَ) صحيح: رواه الترمذي (١٣٢١).

واتە: هەر کاتێك یەکێکیتان بینی لە مزگەوت شتی دەفرۆشت یا دەیکڕی بڵێن: خوا قازانج نەخاتە بازرگانیەکەت.

## کەفارەتی تف روو کردن لە مزگەوت

عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله (ﷺ) : (البُزاقُ في المسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وكَفَّارَتُها دَفْنُها) رواه البخاري (٤١٥) ومسلم (٥٥٢).

واتە: تف رووکردن لە مزگەوت گوناحێکەو کەفارەتەکەشی شاردنەوەیەتی.

## چەند روونکردنەوەیەك

١- کڕین و فرۆشتن لە مزگەوت جائیز نییە.

٢- قسەیەك کە تەنیا پەیوەندی بە دونیاوە هەبێت جائیز نییە لەناو مزگەوتدا بکرێت.

٣- ئەگەر یەکێك لەناو مزگەوت دەرۆزەی کرد جائیز نییە ماڵی بدەیتێ.

# زیکرەکانی رۆژی هەینی

## کارێکی کەم و پاداشتێکی زۆر لە جومعەدا

عن أوسِ بن أوس(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ) مَنْ اغْتَسَلَ يومَ الجُمُعَةِ وغَسَّلَ وَبَكَّرَ وابْتَكَرَ، ودَنا واسْتَمَعَ وأنْصَتَ كانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوةٍ يَخْطوها أجرُ سَنةٍ صِيامُها وقيامُها. صحيح رواه ابوداود(٣٤٥) والترمذي(٤٩٦).

**مانای ووشە:**

١-اغتسلَ : غَسَلَ بدَنَهُ، لەشی ششت.

٢- غَسَّلَ : أي بالغَ في غسل رأسه وغسل باقي بدنه. موبالغەی کرد لە شوشتنی سەری و باقی لەشی.

٣- بَكَّرَ : قالوا بكرَ فلان أسرع، پەلەی کرد.

٤- ابتكر : أَدرك الخطبة من أولها وهو من الباكورة، بە ووتار گەیشت لەسەرەتاکەیەوە. ٥- دنا : نزیك بۆوە. ٦- استمع: گوێ ی گرت.

٧- أَنصَتَ: بێ دەنگ بوو.

٨- خطوة : شەقاو، هەنگاو، کۆیەکەی(خطوات)ە واتە: هەنگاوەکان.

**مانای فەرموودەکە:** هەر یەکێك رۆژی هەینی خۆی بشوا، جوان خۆی بشوا، پەلە بکاو بە(خطبة) بگات لەسەرەتاکەیەوە , وە نزیك ببێتەوە لە ئیمام وە گوێ بگرێ , وە بێ دەنگ بێت , بە هەر شەقاوو هەنگاوێك کە دەیهاوێ خێری یەك سالّی بۆ دەنوسرێ کە ئەم سالّە لە رۆژەکانیدا بە رۆژی بێت و لە شەوەکانیدا خوا پەرستی بکات.

## نوێژکردنی بەیانی ڕۆژی جومعە بە جەماعەت

عن ابن عمر قال: قال رسول الله (ﷺ) : (أفضلُ الصَّلوات عند الله صلاةُ الصُّبحِ يومَ الجمعةِ في جماعة)[1]

واتە: باشترین نوێژ لای خوا نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەیە کە بەجەماعەت بکرێ*

## چی دەخوێندرێ لە نوێژی بەیانی جومعەدا

عن ابن عباس قال: (كانَ رسُول اللهِ (ﷺ) يَقرأ يومَ الجمعةِ في صلاةِ الفجرِ تَنزيلُ (السجدة)، وهل أتى على الأنسان) صحيح: رواه الترمذي (٥٢٠) وابن ماجة (٨٢١).

واتە: ابن عباس دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی جومعەدا لە نوێژی بەیانی سورەتی (سَجْدة) و سورەتی (هل أتى على الانسان) ی دەخوێند.

## ٣- خۆ شووشتن لە ڕۆژی جومعەداو کاتەکەی

## پوختەی ئەم بابەتە

أ- قسەی (جمهور) لەسەر ئەوەیە کە خۆ شۆردنی ڕۆژی جومعە سوننەتە، وە هەندێکیش دەڵێن واجبە.

ب- کاتی ئەم خۆ شووشتنە دەست پێ دەکات لە (طلوع الفجر) واتە: لەگەڵ بانگی بەیانی، وە باشتر وایە پێش چوون بێت بۆ نوێژی هەینی.

---

(١) صحيح انظر (الصحيحة- ١٥٦٦) للألباني، وقال (دار قطني) في (العلل: ٤/ل- ٥١/ب) والصواب أنه من قول ابن عمر.

جـ- ئەم خۆ شۆردنە سوننەتە بۆ هەموو ئەوانـەی دەچـن بـۆ نوێـژی هەینی جا چ پیاو بێت یا ئافرەت بێت، یا مندالّ بێت، یا ڕێبوار بێـت، یـا كۆیلە بێت.

د- ئەم خـۆ شـۆردنە سـوننەت نییـە بـۆ كەسـێك كـە ناچـێتە نوێـژی هەینی.

(ئەم خۆ شووشتنە لەدوای  نوێژی هەینی كاتەكەی بەسەر دەچـێت و نامێنێت، چونكە ئەم غوسلە پێش نوێژی هەینیە).

(وە ئەگەر موسڵمان لە ڕۆژی جومعەدا جەنابەتی لەسەر بوو دەتـوانێ یەك جار خۆی بشوا بە نیازی لابردنی جەنابەت و غوسلی جومعە).

١ - عن سمرَةَ بن جُنْدُب(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ تَوَضَّأَ يَومَ الجُمُعَةِ فَبِها(١) ونِعْمَتْ(٢) ومَنْ اغْتَسَلَ فَالْغُسلُ أَفْضَلُ.

حديث حسن: رواه أبوداود والترمذي(٤٩٧).

واتە: هەر یەكێك لە ڕۆژی هەینیدا تەنها دەست نوێـژی شوشـت ئـەوە باشە , وە هـەر یـەكێكیش خـۆی بشـوا(لەگەڵ دەسـت نوێـژ) ئـەوە خـۆ شوشتن باشترە.

**سوود**: لـەم فەرموودەیـە دەردەكـەوێ كـە خۆشوشـتن لـەڕۆژی هەینیدا سوننەتە.

---

(١) فَبها: أي فيكتفي بها، أي بتلك الفعلة التي هي الوضوء.

(٢) من توضأ يوم الجمعة فبها و نعمت: أي بالفريضة أخذ ونعمت الفريضة هي.

٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ) رواه البخاري (٨٥٨)

**واته: خۆ شووشتن لـه رۆژی جومعـەدا واجبـه لەسـەر هـەموو بـالغ و پێگەیشتوویەك.**

٣-عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنه) أن رسولَ الله(ﷺ) قال: اذا جاءَ احَدُكُم الجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ. رواه البخاري(٨٧٧) ومسلم(٨٤٤).

**واته: کاتێك یەکێك له ئێوه هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوا.**

**سوود** :

**هەروەکو گوتمان باشتر وایه ئەو کاتەی دێی بـۆ نوێـژی هـەینی پـێش ئەو کاته خۆت بشۆی .**

٤-عن ابن عمر أن النبي صلى الله عليه وسلم قال : ( مَنْ أتى الجُمُعَة مِن الرجالِ والنساءِ فليَغْتسِلْ , ومن لم يأتِها فليس عليهِ غُسْلٌ من الرجال والنساء ) رواه ابن خزيمة في صحيحه (١٧٥٢) وقال النووي رحمه الله في "المجموع" (٤/ ٤٠٥) : رواه البيهقي بهذا اللفظ بإسناد صحيح

**واته: هەر یەکێك هات بۆ نوێژی هـەینی لـه پیـاوان و لـه ئافرەتـان بـا خۆی بشوا، وه هەر یەکێك نەهات بۆ نوێژی هـەینی ئـەوه خـۆ شـۆردنی لەسەر نییه له پیاوان و له ئافرەتان.**

# زوو چوون بۆ نوێژی جومعه

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قالَ رسولُ الله(ﷺ) اذا كانَ يومُ الجُمُعَةِ كانَ على كُلِّ بابٍ مِن أبواب المسجد ملائكةٌ يكتبُونَ الأوَّلَ فالأوَّلَ، فإذا جَلَسَ الإمامُ طَوَّوُا الصُّحُفَ وجاءُوا يَسْتَمِعونَ الذِّكرَ، ومَثَلُ الْمُهَجِّرِ[1] كَمَثَلِ الذي يُهْدِى البَدَنَةَ ثُمَّ كالذي يُهْدِى بَقَرةً، ثُمَّ كالذي يُهدِى الكَبْشَ، ثُمَّ كالذى يُهدى الدَّجاجة، ثُمَّ كالذى يُهدى البيضةَ. رواه مسلم(٨٥٠).

واتـە: هـەر كاتێـك كـە ڕۆژى هـەينى هـات لەبـەر هـەر دەرگايـەك لـە دەرگاكانى مزگەوت مەلائيكەتەك ڕادەوەستێ , يەك لەدواى يەك بـەڕێزە ناوى ئەوانە دەنوسن كە دێن بۆ نوێژ تا ئـەو كاتـەى كـە ئيمـام دەچێتە سـەر مينبـەر , كـە ئيمـام چـووە سـەر مينبـەر ئـەوانيش پـەڕاوەكانيان دەپێچـنەوەو دەچـن گـوێ لـە ووتـارى ئيمـام دەگـرن، وە وێنـەى ئـەو كەسەى كە زوو بچێ بۆ نوێـژى هـەينى وەكـو ئـەوە وايـە كـە حوشـترێك بكاتە خێر، لە پاشان وەكو ئەوە وايە كە چێلێك بكاتە خێر , لـە پاشـان وەك ئەوە وايە كە بەرانێك بكاتە خێـر , لـە پاشـان وەك ئـەوە وايـە كـە مريشكێك بكاتە خێر , لە پاشـان وەك ئـەوە وايـە كـە هێلكەيـەك بكاتـە خێر.

**سوود**:

١- لەم فەرموودەيە پێـنج كـات بـاس كـراوە بـۆ ڕۆيشـتن بـۆ نوێـژى

---

(١) التهجير: التبكير.

هـەینی، جـا ئـەم کاتانـە (عثیمین) دەڵـێ: لـە ڕۆژهەڵاتـەوە دەسـت پـێ دەکات تا هاتنی ئیمام بۆ نوێژ، وە هەندێك دەڵێن لـە (طلوع الفجر) ەوە دەسـت پـێ دەکـات بـەڵام ئەرجـەح وایـە لـە ڕۆژ هەڵاتـەوە دەسـت پـێ دەکات، بۆ نموونە لە ڕۆژهەڵاتەوە تا هاتنی ئیمـام بـۆ ووتـاری هـەینی و نوێژ کردن شـەش سـەعات و چـارەکێك بێـت، ئـەو کاتـە هـەر سـەعاتەو سەعات و چارەکێکی بەر دەکەوێ، جا ئەوەی سەعات و چارەکی یەکەم دێت لەدوای ڕۆژ هەڵاتن ئەوە وەکو ئەوە وایە حوشترێکی کردبێتـە خێـر وە هەروەها.

٢- لە (مختار الصحاح)دا دەڵێ:( التهجیر) (التهجر) واتـە:السیر في الهاجرة ,و(الهاجرة)نصف النهار عند اشتداد الحرّ , بۆیـە هەنـدێك دەڵـێن هـەر پێـنج کاتەکە لە کاتژمێر یازدەی نیوەڕۆ دەست پـێ دەکـات , وە ئیمـام مـالیکیش دەڵێ خەڵکی مەدینە سعات یازدەو بەرەو دوا دەچوون بۆ نوێژی جومعە .

٣- هەوڵ بدە ئەگەر زوویش نەچووی بـۆ مزگـەوت لـە ڕۆژی هەینیـدا لـە دەمێکی وادا بچیت کە ناوت لە پەڕاوی فریشتەکاندا بنووسرێ.

## ڕۆیشتن لە کاتی بانگی هەینی بۆ یادی خوا (نوێژی جومعە)

خـــوا دەفـــەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ[1] إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٩﴾ (الجمعة: ٩).

(١) فاسعوا: المراد بالسعي هنا: المبادرة إليها والإهتمام لها، وجعلها أهم الأشغال ، لا العدو الذي قد نهى عنه عند المضي إلى الصلاة.

واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە کاتێك کە بانگدرا بـۆ نوێـژ لـە رۆژی جومعەدا بە پەلە بـڕۆن بـۆ یـادی خـوا (نوێـژی هـەینی) وە واز لـە کڕین و فرۆشتن بهێنن، ئا ئەوە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر ئێوە بزانن.

**سوود**:

١- کڕین و فرۆشتن حەرامە لە کاتی بانگی هەینیدا، کڕیـارو فرۆشـیار هەردووکیان پێی گوناحبار دەبن، بەڵام ئەوانـەی کـە جومعـەیان لەسـەر واجـب نییـە ئـەم حەرامـە نایانگرێتـەوە وەك منـداڵ و ژن و نـەخۆش و ڕێبوار.

## خێری نوێژی جومعە

عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ) مَنْ توضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضوءَ ثُمَّ أَتى الجُمُعَةَ فاسْتَمَعَ وأنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ ما بينَهُ وبينَ الجُمُعَةِ وزِيادةُ ثلاثةِ أيامٍ، ومَنْ مَسَّ الحَصَى فقد لغا. رواه مسلم(٨٥٧).

واتە: هەر یەکێك دەست نوێژێکی جوان بشوا لە پاشان بچێ بۆ نوێژی جومعە , جا گوێ بگرێ و بێ دەنگ بێـت، خـوا لـە گونـاهی نێـوانی ئـەو جومعەو جومعەکەی پێشووی خۆش دەبێـت وە سـێ ڕۆژیـش زیـاتر، وە هەر یەکێك دەست لە وردە بەرد بدات ئەوە(لغو)ی کردووە.

## بێ دەنگ بوون و گوێ گرتن لە کاتی ووتاری هەینی

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله قال: إذا قُلْتَ لِصاحِبِكَ يـوم الجُمُعَـةِ أَنْصِـتْ والأمـامُ يخطـبُ فَقَـد لَغَـوتَ. رواه البخاري(٩٣٤) ومسلم(٨٥١).

واتە: ئەگەر لە رۆژی هەینیدا لەو کاتەی کە ئیمام ووتار دەخوێنێتەوە بڵێیە هاونیشینەکەت بێ دەنگ بە ئەوە(لەغوت) کردووە(خۆت بە شتێ خەریك کردووە خێری جومعەکەت نامینێ).

**سوود:**

١-ئەوەی لە کاتی ووتاری هەینیدا قسە بکات خێری جومعەکەی نامێنێ

٢-لە کاتی ووتاری هەینیدا نابێت نە سەلام بکەیت نە سەلام وەر بگریەوە

٣-لە کاتی ووتاری هەینیدا ئەگەر ناوی پێغەمبەر هات دەتوانی سەلەواتی لەسەر بدەی .

٤-ئەگەر یەکێك لە کاتی ووتاری هەینی قسەی کرد ئەوە پێی نالێی بێ دەنگ بە.

٥-(عثيمين) دەڵێ:موستەحەببە ئامین کردن بۆ دعای ووتار خوێنی هەینی .

## خوێندنی قورئان لە نوێژی هەینیدا

عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) و((هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) قَالَ وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضًا فِي الصَّلَاتَيْنِ . رواه مسلم (٨٧٨)

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە دوو جەژنەکان و لە نوێژی جومعەدا سورەتی (الأعلى) و (الغاشية) ی دەخوێند، وە ئەگەر جەژن و جومعە بکەوتبانە یەك رۆژ دیسان لە هەردوو نوێژەکە هەر ئەو دوو سورەتەی دەخوێند.

## زۆر صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە رۆژی هەینیدا

عن أوس بن أوس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ مِنْ أفضلِ أيَّامِكُمْ يَومَ الجُمُعَةِ، فَأَكْثِروا عَليَّ مِنَ الصَّلاةِ فيه فإِنَّ صلاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، فقالوا: يا رسول اللهِ وكيف تُعْرَضُ صَلاتُنا عليكَ وقَدْ أَرِمْتَ؟! قال: يقول بَلِيتَ، قال: إنَّ الله حَرَّمَ على الأرضِ أجْسادَ الأنبياء)[1].

واتە: بێ گومان لە باشترین رۆژەکانتان رۆژی هەینییە , جا لەم رۆژەدا زۆر صەڵەواتم لەسەر لێ بدەن چونکە بێ گومان صەڵەواتەکانتان نیشانم دەدرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن صەڵەواتەکانمان نیشانت دەدرێ لە کاتێکدا کە تۆ رزیوی؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بێ گومان خودا جەستەی پێغەمبەرانی قەدەغە(حَرام) کردووە لە زەوی(کەبیان خوات).

## ئەو سەعاتەی دوعای تیادا قەبوڵ دەبێت لە رۆژی جومعەدا

١- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ قَالَ قُلْتُ نَعَمْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الْإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ[2].

---

(١) صحيح رواه ابوداود(١٠٤٧) و احمد(٤/٨) وصححه ابن حِبّان(٥٥٠) والحاكم ووافقه الذهبي.

(٢) رواه مسلم (٨٥٣).

واتە: ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسـای ئەشـعەری دەڵـێ: (عبـدالله)ی کوڕی عومەر پێی گوتم ئایە هیچ شتێکت لـە باوکتـەوە بیسـتووە کـە لـە پێغەمبەری خوا بیگێڕێتەوە دەربارەی ئەو سەعاتەی ڕۆژی جومعـە (کـە دوعای تیادا قەبوڵ دەبێت) گوتم بەڵێ: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت گوێم لـە پێغەمبـەر بـوو (ﷺ) دەیفـەرموو: ئـەو سـەعاتە دەکەوێتـە نێـوانی ئەوەی کە پێش نوێژ لەسەر مینبەر دادەنیشێت تا نوێژ تەواو دەبێت.

٢- عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ذَكَـرَ يَـوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ فِيهِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا(١).

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) باسی ڕۆژی جومعەی کـرد فـەرمووی: سـەعاتێکی تێدایـە هـەر موسـڵمانێك بـۆی ڕێـك بکـەوێت لـەو کاتەدا نوێژ بکات داوای شتێك لە خوا بکات، ئـیللا خـوا ئـەم شـتەی پـێ دەدات، وە پێغەمبەر (ﷺ) بەدەسـتی ئامـاژەی کـرد کـە ئـەم سـەعاتە کاتەکەی کەمە.

**سوود:**

أ- (عبدالله) ی کوری سەلام دەڵێ: ئەم کاتە پێشی مەغریبـە کەسـێك چاوەڕوانی نوێژ دەکات، دەکا ئەم کەسە لـەناو نوێـژە ئـەوجا لـەم کاتـە دوعا دەکات.

---

(١) رواه البخاري (٩٣٥) ومسلم (٨٥٢).

ب- له فەرموودەی یەکەم باسی ئەوە دەکات کە ئەم کاتە دەکەوێتە نێوانی ئەوەی کە ئیمام دادەنیشێ لەسەر مینبەر تا نوێژ تەواو دەبێت، جا کاتێکی زۆر گونجاوە ئەگەر موسڵمان لە سەجدەکانی نوێژی هەینی دوعا بکات.

جـ- موسڵمان دەتوانێ لە نێوانی دوو خوتبەکەدا دوعا بکات، وە دەتوانێ کە ئیمام لە کاتی خوتبەدا دوعا بکات ئەو ئامین بکات.

٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ (يَوْمُ الْجُمُعَةِ ثِنْتَا عَشْرَةَ يُرِيدُ سَاعَةً لَا يُوجَدُ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ شَيْئًا إِلَّا أَتَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ)[١].

واتە: ڕۆژی جومعە دوازدە سەعاتە ، نییە موسڵمانێك داوای شتێك بکات لە خوا (عزّ وجلّ) ئیلا خوا (عز وجل) پێی دەبەخشێ، بەدوایدا بگەڕێن لە دوایین سەعات لە دوای نوێژی عەسر.

## نوێژی سوننەت لە دوای نوێژی جومعە

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): اذا صَلَّى احدُكُمُ الجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بعدها أربعاً. رواه مسلم(٨٨١).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی جومعەی کرد با چوار رکات سوننەت لە دوایدا بکات.

---

(١) صحيح رواه أبو داود (١٠٤٨).

٢- عن ابن عمر(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ): كان لا يُصلِّي بَعدَ الجمعةِ حَتَّى يَنصَرِفَ فَيُصَلِّي ركعتينِ في بيتهِ. رواه مسلم(٨٨٢).

**واتـه: پێغەمبـەر(ﷺ) لـە دواى نوێـژى جومعـە نوێـژى نـەدەكرد تـا نەچوبايە ماڵەوە , جا دوو ركات نوێژى لە ماڵەوە دەكرد.**

## خوێندى سورەتى( كهف )لە رۆژى جومعەدا

١-عن ابي سعيدٍ الخُدري أَنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ قرأ سُورةَ الكَهفِ يـومَ الجُمُعَـةِ أضـاءَ لَـهُ مِـنَ النُّـور مـا بـين الجُمُعَتَـينِ. صـحيح رواه النسائي(٩٥٢) والبيهقي(٢٤٤٦).

**واتە: هەر كەسێك لە رۆژى جومعەدا سـورەتى(كهف) بخـوێنىٚ نێـوانى هەردوو جومعەكەى بۆ رۆشن دەبێتەوە.**

٢- عن أبي سعيد الخدري قال: من قرأ سورةَ الكهفِ ليلةَ الجُمعةِ أضـاءَ لَـهُ مـن النـور فيمـا بينـه وبـين البيـتِ العتيـق[1]. حديث صحيح موقوف: رواه: الدارمي (٣٤٠٧).

**واتە: هەر يەكێك سورەتى (كهف) بخوێنىٚ لەشەوى جومعەدا نێوانى خۆىو كەعبەى بۆ رووناك دەبێتەوە.**

**سوود:**

١- قـال المنـاوي فـي فـيض القـدير: فينـدب قرائتهـا يـوم الجمعة وكـذا ليلتها كما تنص عليه الشافعي.

---

( ١) قال حسين سليم أسد: اسناده صحيح إلى أبي سعيد وهو موقوف عليه.

٢- لای ئیمامی شافیعی سوننەتە جارێك سورەتی كهف بخوێنی لە شەوی هەینیدا, واتە لە بانگی ئێوارە تا بانگی بەیانی، وە جارێكیش لە ڕۆژەكەیدا , واتە لە بانگی بەیانی تا بانگی ئێوارە، وە دەشتوانی تەنها لە شەوو ڕۆژی هەینی یەك جار بیخوێنی، وە دەشتوانی ئەگەر لە شەوو ڕۆژی هەینی یەك جار سورەتی (كهف)ت خوێند بەشێكی لە شەو بخوێنی بەشەكەی تری لە ڕۆژدا تەواو بكەیت.

٣- عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله (ﷺ) (من قرأ سورةَ الكهفِ كَمَا أُنْزِلَتْ كان له نوراً يومَ القيامةِ مِنْ مَقامِهِ إلى مكة)[١].

واتە: هەر یەكێك سورەتی كهف بخوێنێ وەكو چۆن دابەزیووە، لە ڕۆژی قیامەت ئەو كەسە ڕوناكیەكی پێ دەدرێت (بەدرێژایی) ئەو شوێنەی كە لێیەتی تا مەككە.

**سوود**:

١- (مصطفى بن العدوي) لە كیتابی (الصحيح في المسند من أذكار اليوم والليلة) ئەم فەرموودەیە لەژێر ناونیشانی (فضل قراءة سورة الكهف يوم الجمعة) دەهێنێتەوە.

---

(١) رواه الحاكم وقال حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه، والحديث صحيح بشواهده.

٢- قال عبدالله بن مسعود في قوله تعالى ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ (الحديد: ١٢)، قال على قدر أعمالهم يمرون على الصراط، منهم من نوره مثل الجبل، ومنهم من نوره مثل النحلة، ومنهم من نوره مثل الرجل القائم، وأدناهم نوراً مَن نوره في إبهامه يَتَّقِدُ مرّةً ويطفأ مرّة) [١].

**واته: ابن مسعود دەڵێ: دەربارەی فەرموودەی خوا ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ دەڵێ: (بڕواداران) بە گوێرەی کردەوەکانیان لەسەر سیرات دەڕۆن، هەندێکیان نورەکانیان وەکو چیا وایە، وە هەندێکیان نوریان وەکو دار خورمایەکە، وە هەندێکیان روناکیەکەیان وەکو پیاوێکی وەستاو وایە، وە ئەوەیان کە لە هەموویان نورو رووناکی کەمترە ئەوەیانە کە نورەکەی لە پەنجەی گەورەی پێیەتی جارێك پێ دەبێت و جارێك دەکوژێتەوە.**

---

(١) صحيح، موقوفاً، ولكن مثله لا يقال بالرأي فهو في حكم المرفوع.

# زەكات

زەكات روكنێكی گەورەیە، بە جێبەجێ كردنی ئەم روكنە موسڵمان پاداشتێكی زۆری دەست دەكەوێ، بە نەدانی تووشی هەرەشەیەكی گەورە دەبێت لە قورئان و لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) , جا موسڵمان دەبێت زۆر بە رێك و پێكی ئەم روكنە گەورەیە جێبەجێ بكات كەمتەرخەمی و رەزیلی تیادا نەكات، وە پێی خۆش بێت هەموو ساڵێ زەكاتی هەبێت بۆ ئەوەی لەم خێرە گەورەیە بێ بەش نەبێت، جا ئەو كەسەی كە زەكات دەدات پاداشتێكی زۆر وەردەگرێ , وە خوای گەورەش لە قورئان و لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی بەڵێنی پێداوە ئەوەی بە زەكات دەیدات بۆی قەرەبوو بكاتەوەو لێی كەم نەكات خوا دەفەرمووێ: (وَمَا أَنْفَقتُم مِن شَيٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ ) [سبأ:٣٩] واتە: وە ئێوە هەر شتێك ببەخشن ئەوە خوا جێگەی پر دەكاتەوە . وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: (ما نَقَصَتْ صدقةٌ مِن مالٍ) (رواه مسلم (٢٥٨٨) واتە: خێركردن و زەكات دان كەم ناكات لە ماڵ و سامان , وە ئەوەش كە زەكات نادات بزانە چی بەسەر دێت وەك لەمەودوا باسی دەكەین.

## زەكات روكنێكە لە روكنەكانی ئیسلام

١-عن ابن عمر(رضي الله عنه) انَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: بُنِيَ الإسلامُ على خَمسٍ: شهادةِ أن لا اله الا الله وأنَّ محمداً عبدُهُ وَرَسُولُهُ وإقامِ الصلاة وايتاءِ الزكاةِ وَحَجِّ البيتِ وصَوْمِ رمضان. رواه البخاري(٨) ومسلم(١٦).

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتی دان بەوە کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا , وە موحەمەد ڕەوانە کراوی خوایە, وە نوێژ کردن , وە زەکات دان , وە حەجی ماڵی خوا کردن , وە بە ڕۆژی بوونی مانگی رەمەزان.

## پاداشتی زەکات دان

خـــوا دەفــــەرمووێ: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ (الحديد: ٧).

واتـە: ئـەوجا ئەوانـەتان کـە بـاوەڕی هێنـاوەو داراییـان بەخشـێوە پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە.

١- عن ابي هريرة(رضى الله عنه) أنَّ أعرابياً أَتى النبيَّ(ﷺ) فقال: دُلَّني على عَمَلٍ اذا عملتهُ دَخَتُ الجنة؟ قال: تَعبُدُ اللهَ ولاتشركُ به شيئاً وتقيم الصلاة المكتوبة وتُؤدي الزكاة المفروضة وتصوم رمضان. قال: والذي نفسي بيده لا أزيدُ على هذا. فلَمّا وَلّى قالَ النبيُّ(ﷺ) مَنْ سَرَّهُ أن يَنظرَ إلى رَجُلٍ مِنْ أهل الجنَّةِ فَلْينظرْ إلى هذا. رواه البخاري(١٣٩٧) ومسلم(١٤).

واتە: ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵێ: ئەعرابیەك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: کردەوەیەکم پیّ نیشـان بـدە ئەگەر کـردم بچمە بەهەشت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوا بپەرستەو هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدە , وە نوێژە فەرزەکان بکەو زەکاتی فەرز بدەو ڕۆژی رەمەزان بگرە , جا عارەبە دەشتەکیەکە گوتی: سوێندم بـەوەی گیـانی منـی بـە

دەستە لەوە زیاتر ناکەم , جا کە رۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر یەکێك پێی خۆشە کە تەماشای پیاوێك بکات لە خەڵکی بەهەشت با تەماشای ئەوە بکات.

## سزای ئەوەی زەکات نادات

خــــوا دەفـــــەرمووێ ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾(التوبه: ٣٥)

واتە: ئەوانەی زێرو زیو کۆدەکەنەوە وەنای بەخشنەوە لە رێگای خوادا(ئەی پێغەمبەر) موژدەیان پێ بدە بە سزایەکی ئازار دەر(٣٤) لە رۆژێکدا کە ئەو زێرو زیوە لە دۆزەخدا سوور دەکرێتەوە ، ئەمجا بەو زێرو زیوە ناوچەوان و تەنیشت و پشتیان پێ داغ دەکرێ ، ئەمە ئەوە بوو کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان ،دەبچێژن سزای ئەوەی کە بۆ خۆتان کۆکردبۆوە.

١- عن أبي هريرة(رضى الله عنه) قال: قالَ رسول الله(ﷺ) مَنْ آتاهُ اللهُ مالاً فَلَم يُؤَدِّ زكاتَهُ مُثِّلَ له يوم القيامةِ شُجاعاً أقْرع لَهُ زَبيبتان يُطَوَّقُهُ يومَ القيامة ثُمَّ يأخُذُ بِلهزِمَتيهِ -يعني سِدْقَيهِ- ثُمَّ يقولُ: أنا مالُكَ، أنا كنزُكَ)رواه البخاري(١٤٠٣)

واتە: هەر یەکێك خوا ماڵێکی بداتێ و زەکاتی لێ دەرنەکات ، لە ڕۆژی دوایدا بۆی دەبێتە نێرە مارێکی کەچەڵ کە دوو خاڵی ڕەش لە پشت چاوەکانی یەوە هەن ، ڕۆژی دوایی لەگەردنی دەئاڵێ ، پاشان بە قەپ هەردووك شەوێلاگەی دەگرێ و دەڵێ: من پارەو سامانەکەتم، من خەزێنەکەتم .

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) : (ما مِنْ صاحِبِ ذَهَبٍ ولا فِضَّةٍ، لا يُؤَدّي منها حَقَّها إلاّ اذا كان يومُ القيامةِ صُفِّحَت له صَفائحُ مِنْ نار، فأُحْمِيَ عليها في نار جَهَنّم فَيُكوى بها جَنبُهُ وجَبينُهُ وظَهرهُ كُلَّما بَرَدَتْ أُعيدَتْ لَهُ في يومٍ كان مقدارهُ خَمْسينَ ألف سَنَةٍ حَتّى يُقضى بينَ العبادِ فَيُرى سَبيلهُ إمّا الى الجَنَّةِ وإمّا الى النار).رواه مسلم(٩٨٧)

واتە: هیچ خاوەن زێرو زیوێك نییە کەوا مافەکەی نەدات , (ئیللا) کاتێك ڕۆژی قیامەت دێت چەندین پلێتی ئاگرینی بۆ ئامادە دەکرێت کە لە ئاگری دۆزەخ دا سوور کراوەتەوە، تەنیشتی و نێوچەوانو پشتی پێ داغ دەکرێت , هەر کاتێك سارد ببێتەوە دووبارەی دەکەنەوە بۆی لە ڕۆژێکدا کە درێژیەکەی پەنجا هەزار ساڵە تا دادگایی لە نێوان بەندەکاندا دەکرێت جا ڕێگاکەی خۆی پێ نیشان دەدرێت یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ.

**سوود**:

ئەی موسڵمان بزانە ئەگەر زەکات نەدەی (أكبر الكبائر) ت ئەنجام داوە، واتە لەناو گوناهە گەورەکان گەورەترینیان، وە یەکێکیش لە سزاکان ئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو پارانە دەکرێن بە چەندین پلێت بە ئاگری جەهەنەم سۆر دەکرێتەوە پێی داخ دەکرێی تا لێپرسینەوە کۆتایی دێت لە ڕۆژێکدا ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە، وە ئەگەر زەکاتیش بدەی پاداشتێکی زۆر وەردەگریەوە، وە لە دونیاشدا ماڵەکەی کە داوتە بۆت قەرەبوو دەکرێتەوە.

## گەورەیی قەرز دان و زیکری قەرز دانەوە

عنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مثلُهُ صَدَقَةٌ قبلَ أَنْ يَحِلَّ الدَّين , فإذا حلَّ الدَّينُ فَأَنْظَرَهُ فلَهُ بكُلِّ يَوْمٍ مِثْلَيْهِ صَدَقَةٌ ) سلسلة الاحاديث الصحيحة(٨٦) وصحيح الجامع الصغير(٦١٠٨)

واتە: هەر یەکێك چاوەڕێی یەکێکی تەنگ دەست بکات (پەلەی لێ نەکات تا کاتی دانەوەی قەرزەکە دێت) بەهەر ڕۆژێك بە ئەندازەی ئەو قەرزەی کە لەلایەتی بەسەدەقەو خێر بۆی دەنووسرێ، پێش ئەوەی کاتی هاتنی دانەوەی قەرزەکە بێت ، جا کاتێك کاتی دانەوەی قەرزەکە تەواو بوو ئەو چاوەڕێی کرد، ئەوە بۆ هەموو ڕۆژێك دوو ئەوەندەی قەرزەکە خێرو سەدەقەی بۆ هەیە.

**سوود**: (ابن مسعود) دەڵێ: (قرض الشيء خير من صدقته) واتە: شتێك بەقەرز بدەی باشترە لەوەی بە سەدەقە بیدەی.

## زیکری قەرز دانەوە

عَنْ إِسْمَعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ : ( اسْتَقْرَضَ مِنِّي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعِينَ أَلْفًا فَجَاءَهُ مَالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ وَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ) صحيح :رواه النَّسائي(٤٦٨٣)

**واتە: باپیری ئیسماعیل دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) چل هەزاری لەمن قەرز کرد،ماڵی بۆ هات پارەکەی منی دایەوەو فەرمووی:** (بارَكَ اللهُ لَكَ في أَهْلِكَ وَمالِكَ) **یانی خوا بەرەکەت بخاتە ناو کەس و کارو سامانتەوە، پاداشتی قەرزدان سوپاس کردنی خاوەن قەرزو گەڕانەوەی قەرزەکەیە(بۆی).**

## دوعای دانەوەی قەرز

١- عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ مُكَاتَبًا جَاءَهُ فَقَالَ إِنِّي قَدْ عَجَزْتُ عَنْ كِتَابَتِي فَأَعِنِّي قَالَ أَلَا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ عَلَّمَنِيهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَوْ كَانَ عَلَيْكَ مِثْلُ جَبَلِ صِيرٍ دَيْنًا أَدَّاهُ اللَّهُ عَنْكَ قَالَ قُلْ ( اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ ) . حسن : رواه الترمذي (٣٥٦٣)

**واتە: عەلی -رەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: کەسێکی کۆیلە کە لەگەڵ گەورەکەی خۆی رێك کەوتووە بۆ ئازاد بوونی بە پێدانی چەند پارەو**

ماڵێك، هاته لام گوتی كاتی دانی پارەو ماڵەكەم هاتووه منیش نیمه بیدەم جا یارمەتیم بدە، ئیمام عەلیش دەڵێ پێم گوت ئایە چەند ووشەیەكت فێر بكەم كە پێغەمبەر (ﷺ) فێری كردووم ئەگەر وەكو چیای (صِبِر) قەردت لەسەر بێت خوا بۆت بداتەوە، فەرمووی: بڵێ:
**(اللهم اكْفِنِي بِحلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَاغْنِنِي بِفَضْلِكَ عمَّنْ سِواك)**
واته: ئەی خودایە ئەوەندەم لە حەڵاڵەكانت پێ بدەی كە بەشم بكات و بێ پێویست بم لە حەرامەكانت، وە بە فەزڵ و بەخششی خۆت دەوڵەمەندو بێ پێویستم بكە لە غەیری خۆت.

# زیکری ڕۆژوو گرتن (الصیام)

## پارێزگاری کردن لە پاداشتی ڕۆژوو

زۆر خەڵك هەن ئازان بۆ ڕۆژوو گرتن بەلاَم نازانن چۆن پاداشتەکەی بپارێزن یان لەوانەیە بزانن بەلاَم نەفسی خۆیان پێ ناگیرێ، وە بە تایبەتی مانگی ڕمەزان ساڵی یەك جار دێت، بەڕۆژوو بوون لەم مانگەدا پاداشتەکەی زۆر گەورەیە، بەلاَم ئەم نازانێ چۆن پاداشتەکەی بپارێزێت ، غەیبەت دەکات، نەزەر دەکات، گوێ دەداتە گۆرانی حەرام، درۆ دەکات، ئەزیەتی ماڵ و منداڵی دەدات، جوێن دەدات، جا موسڵمان دەبێت وریا بێت پاداشتی ئەم برسیەتی و تینووەتی و ماندوو بوونە بەتاڵ نەکاتەوە بە گوناح.

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: قال رسولُ الله(ﷺ): مَنْ لَم يَدَع قَولَ الزُّور والعَمَلَ بِهِ فَلَيس للهِ حاجَةٌ في أنْ يَدَعَ طعامَهُ وشرابَهُ. رواه البخاري(١٩٠٣).

واتە: هەر کەسێك واز نەهێنێ لەووتەی خراپ و کار پێ کردنی ، ئەوە خوا هیچ پێویستیەکی بەوە نییە کە ئەو واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێ.

**سوود**: دوو شتی گرنگ هەن بۆ خۆپاراستن لە گوناح:

أ- کەم قسە کردن.

ب- کەم تێکەلاَوی کردن.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: قال رسولُ الله(ﷺ): رُبَّ صَائِمٍ ليسَ لَهُ مِن صيامِهِ إلاّ الجوعُ ورُبَّ قائِمٍ ليسَ لَهُ من قيامهِ إلاّ السَّهَرُ. صحيح(صحيح جامع الصغير(٣٤٨٨).

واته: زۆر ڕۆژووگر له ڕۆژوو گرتنه‌كه‌ی ته‌نها برسیه‌تی پیَ ده‌برێ , وه‌ زۆر شه‌و نوێژكاریش له‌ شه‌و نوێژه‌كه‌ی ته‌نیا شه‌ونخوونی بۆ ده‌مێنێته‌وه‌.

## پله‌و پایه‌ی ڕۆژووگرتن

١-عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: سمعت النبيَّ(ﷺ) يقول: مَنْ صام يوماً في سبيل الله بَعَّدَ اللهُ وجهَهُ عن النار سبعينَ خريفاً. رواه البخاري (٢٨٤٠) ومسلم (١١٥٣)

١-خريفا: السنه، واته: سالّ.

مانای فه‌رمووده‌كه: هه‌ر یه‌كێك له‌ ڕێی خوادا یه‌ك ڕۆژ به‌ڕۆژوو بێت , خودا حه‌فتا سالّ ڕووی له‌ ئاگری دۆزه‌خ دووررده‌خاته‌وه‌.

٢- عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: في الجنّةِ ثمانيةُ ابواب فيها بابٌ يُسَمّى الرَّيّان لا يدخُلُهُ إلاّ الصّائمون. رواه البخاري(٣٢٥٧).

واته: له‌ به‌هه‌شتدا هه‌شت ده‌رگا هه‌یه‌ , ده‌رگایه‌كی تێدایه‌ ناوی(رَيَّان)ه‌ , بێجگه‌ له‌ ڕۆژووگران كه‌سی دیكه‌ پێیدا ناچێته‌ ژووره‌وه‌.

٣- عن عثمان بن ابي العاص(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقولُ: الصِّيام جُنَّةٌ كَجُنَّةِ أحَدِكُمْ مِنَ القِتال. صحيح رواه النَّسائي(٢٢٣٠).

واته: ڕۆژوو پارێزەرە(لە ئاگری دۆزەخ) وەکو قەلغانی یەکێك لە ئێوە لە کاتی شەردا.

٤- عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) انَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: الصِّيَامُ والقرآنُ يَشْفَعانِ لِلعْبدِ يومَ القيامةِ يقولُ الصِّيامُ: أيْ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطَّعامَ والشَّهوةَ فَشَفِّعْني فيه: ويقولُ القرآنُ: مَنَعْتُهُ النَّوم بالليلِ فشَفِّعني فيه، قال فَيُشَفَّعان. سنده حسن رواه احمد(٦٦٢٦) والحاكم(١/٥٥٤) قال البيهقي في مجمع الزوائد(ورجال الصحيح).

١- أيْ : حرف نداء بمعنى(يا) أي ربِّ : يا ربِّ.

واته: ڕۆژوو و قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت بۆ بەندە دەکەن ڕۆژوو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم (من لە ڕۆژدا) خواردن و بەجێ هێنانی ئارەزوویم لێ قەدەغە کردبوو جا بمکە بە شەفاعەت کارو تکاکار بۆی ، وە قورئانیش دەڵێ: منیش بەشەو خەوم لێ قەدەغە کردبوو جا بمکە بە شەفاعەت کاری(جا هەردووکیان ڕێ دەدرێن ببنە تکاکار بۆی) جا تکاو شەفاعەتی بۆ دەکەن.

٥- عن ابي أُمامة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ صام يوماً في سبيل الله جعل الله بينه وبين النارِ خَندَقاً كما بينَ السماءِ والارض. حسن صحيح رواه الترمذي(١٦٢٤).

واته: هەر یەکێك یەك ڕۆژ لە ڕێی خوادا بەڕۆژوو بێت , خودا چاڵێکی وەکو نێوان عارد و عاسمان دەخاتە نێوانی ئەوو نێوانی ئاگر.

# سوننەتە سێ ڕۆژ بەڕۆژ بوون لە هەموو مانگێکدا

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: أوصاني خَليلي(ﷺ) بثلاثٍ: صيامِ ثلاثةِ أيامٍ مِنْ كُلِّ شَهرٍ وَرَكعتَيْ الضُّحى وأَن أُوتِرَ قَبلَ أن أنام. رواه البخاري(١٩٨١) ومسلم(٧٢١).

**واتە: ئەبو هوریرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: خۆشەویستەکەم ڕای سپاردووم بە کردنی سێ شتان:**

**بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێکدا، وە کردنی دوو ڕکاتی چێشتەنگاو، وە نوێژی وتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم.**

**سوود:**

**سوونەتە موسڵمان لە هەر مانگێك سێ ڕۆژان بە ڕۆژی بێت , ئەم سوننەتەش دێتە دی هەر چۆنێك بەڕۆژی بێت مادام سێ ڕۆژ بێت، بەڵام باشتر وایە کە ئەو سێ ڕۆژە بکەوێتە(أيّام البيض)ەوە واتە: ڕۆژە شەو ڕووناکەکان کە بریتین لە ڕۆژی سێزدەو چواردەو پازدە، هێندێك دەڵێن: بریتین لە دوازدەو سێزدەو چواردە بەڵام هەروەك(نووی) دەڵێ(الصحيح المشهور) قسەی یەکەمە: واتە: سێزدەو چواردەو پازدەی مانگی قەمەری**

.

١- عن معاذَة العَدَويَّةِ انَّها سَألَتْ عائشة(رضي الله عنها) أكانَ رسول الله(ﷺ) يَصومُ مِنْ كُلِّ شَهرٍ ثلاثة أيّامٍ؟ قالَتْ: نعم، فقلت لها: مِن أيِّ أيَّامِ الشَّهرِ كان يَصومُ؟ قالت: لَمْ يَكنْ يبالي من أيِّ أيام الشَّهرِ يَصومُ. رواه مسلم(١١٦٠).

واتە: موعاذەی عەدەوی پرسیاری لە عائشە کردووە(ڕەزای خوای لـێ بێت) ئایا پێغەمبەر(ﷺ) لە هـەموو مـانگێ سـێ ڕۆژان بـەڕۆژی دەبـوو؟ گـوتی: بـەڵێ، جـا پـێم گـوت: لـە چ ڕۆژێکـی مانگێـدا بـەڕۆژوو دەبـوو؟ عائشە(ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمووی: گـوێ ی بـەوە نـەدەدا لە چ ڕۆژێکی مانگدا بەڕۆژوو دەبوو.

٣- عن أبي ذر(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يا أبا ذَر، إذا صُمْتَ مِن الشَّهر ثلاثةَ أيّامٍ فصُم ثلاث عشرةَ، وأربعَ عشرةَ، وخَمْسَ عَشْرَةَ. حسن صحيح رواه الترمذي(٧٦١).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو(ذَر) ئەگەر لە مانگێکدا سێ ڕۆژان بەڕۆژی بووی ڕۆژانی سێزدەو چواردەو پازدەی مانگ بەڕۆژی بە.

**سوود**:

**١**-سـێزدەو چـواردەو پـازدەی مـانگ کـە لـەم فـەرموودە هـاتووە مەبەست ڕۆژانی سێزدەو چواردەو پـازدەن لـە مـانگی قەمـەری نـەك لـە مانگی شەمسی کە لە ناو ئێمە مەشهورە بە ئینگلیزی.

٢- ئـەم سـێ ڕۆژە(ايام البيض)یـان پـێ دەوتـرێ سـێزدەو چـواردەو پـازدە، واتـە: ڕۆژە سـپیەکان، چـونکە شـەوی ئـەم سـێ ڕۆژە سـپینەو ڕوناکن لەبەر دەرکەوتنی مانگ بە درێژایی شەو بە پری.

## باشترین ڕۆژوو گرتن ڕۆژێك نا ڕۆژێکە

١ – عن عبدالله بن عمرو(رضي الله عنه) قال: أُخْبِرَ رَسولُ اللهِ(ﷺ) أنّي اقولُ: واللهِ لأَصُومنَّ النّهارَ ولأَقومَنَّ الليلَ ما عِشتُ، فقُلتُ له: قَدْ قُلْتُهُ بأبي أنتَ وأمّي، قال: فإنَّكَ لا تستطيعُ ذلك فصُمْ وأَفطِرْ، وقُم ونَمْ وصُمْ مِنَ الشّهرِ ثلاثةَ أيامٍ فإنَّ الحسنَةَ بَعَشْرِ أمثالها وذلك مثل صيام الدهرِ. قُلْتُ: إنّي أُطيقُ أفْضَلَ مِنْ ذلك، قال: فَصُمْ يوماً وأَفْطِر يومين، قُلْتُ: إنّي أُطيقُ أفْضَلَ مِنْ ذلك، قال: فَصُمْ يوماً وأفطِر يوماً فذلك صِيامُ دواد عليه السلام وهو أفضَلُ الصيام، قُلْتُ: إنّي أُطيقُ أفْضَلَ مِنْ ذلك، فقال النبيُّ(ﷺ) لا أفضَلَ مِنْ ذلك. رواه البخاري(١٩٧٦) ومسلم(١١٥٩).

واتە: عبداللە کوری عەمر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: خەبەر بە پێغەمبەر درا(ﷺ) کە من ووتومە: سوێند بە خوا هەتا ماوم بە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبم وە بە شەویش شەو نوێژ و خوا پەرستی دەکەم، عبداللە دەڵێ: جا منیش بە پێغەمبەرم گوت بە دایك و باوکمەوە فیات بم من ئەو قسەیەم گوتووە، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی تۆ ئەوە ناتوانی , هەندێ ڕۆژ بە بەڕۆژی بەو وە هەندێکیشی پێ مەبە , وە شەو هەندێکی لێ هەستەو هەندێکیشی لێ بخەوە , وە لە مانگێ سێ ڕۆژان بە ڕۆژوو بە , بێگومان هەر چاکەیەك بە دە چاکە هەیە , وە ئەوەش(واتە سێ ڕۆژ بەڕۆژی بوون لە هەموو مانگێك) وەکو ئەوەیە کە ساڵ دوازدەی مانگ بە ڕۆژی بیت ، جا گوتم من لەمە باشتر دەتوانم فەرمووی: دە ڕۆژێك بەڕۆژوو بەو دوو ڕۆژ پێ مەبە، گوتم من لەمە باشتر دەتوانم ، فەرمووی:

ده ڕۆژێك به ڕۆژی بەو ڕۆژێك پیٚ مەبە ,كە ئەوەش بە ڕۆژی بـوونی داود بوو(عليه السلام) ئـەوەش باشـترین ڕۆژی گرتنـە ، گـوتم لەمـەش باشـتر دەتوانم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لەمە باشتر نی یە.

**سوود**: (شوكانی) دەڵیٚ:(وأفضل التطوُّع صومُ يومٍ وإفطارُ يومٍ) [1].

واتە: باشـترین ڕۆژی گرتنـی سـوننەت ئەوەیـە ڕۆژێـك بـە ڕۆژی بیـت ڕۆژێك بەڕۆژی نەبیت.

## بەڕۆژوو بوونـی دووشەم و پێنج شەم

١-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: كان رسولُ الله(ﷺ) يَتحَرى صَومَ الإِثنينِ والخميسِ. صحيح رواه الترمذي(٧٤٥) وابن ماجه(١٧٣٩).

واتە: عائشە(ڕەزای خـوای لـیٚ بیٚـت) دەڵـیٚ: پێغەمبـەر(ﷺ) دەگـەڕا بەدوای بەڕۆژوو بوونی دووشەممەو پێنج شەممە.

**سوود**: ڕۆژی دووشەممە و پێـنج شـەممە سـوننەتە موسـڵمان تێیـدا بەڕۆژی بێت.

## شەش ڕۆژ بەڕۆژوو بوون لە شەووال

١-عن أبي أيُّوب(رضـي الله عنـه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قـالَ: مَـنْ صـامَ رَمَضـانَ ثـمَّ أَتْبَعَـهُ سِـتّاً مِـن شَـوَّالٍ، كـان كصِـيامِ الـدَّهْرِ. رواه مسلم(١١٦٤).

---

(١) الأدلة الرضية ص١٣٩.

واتە: هەر یەکێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت , لە پاشان شەش ڕۆژیش لە شەووالدا بەدوایدا بگرێ , ئەوە وەکو ئەوە وایە کە بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو بێت .

**سوود**:

١-شەش ڕۆژ بەڕۆژوو بوون لە مانگی شەووالدا سوننەتە , وە مانگی شەووال یەکسەر لە دوای ڕەمەزان دێت. وە ئەم سوننەتەش پێك دێت مادام لەم مانگەدا شەش ڕۆژ بەڕۆژوو بیت لەسەر یەك بیت یا لەسەر یەك نەبێت.

٢- هەر چاکەیەك بەدە چاکە هەیە کە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژی بیت ئەمە دەکا دە مانگ، شەش ڕۆژیش لە شەووال بە(٦٠) ڕۆژ هەیە واتە: دوو مانگ کەواتە بە مانگی ڕەمەزان و شەش ڕۆژ لە شەووال دەبێتە یەك ساڵ.

## بەڕۆژی بوونی ڕۆژی عەرەفە

١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) قالَ: سُئِلَ رسولُ الله(ﷺ) عن صومِ يومِ عَرَفَةَ؟ قالَ: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الماضِيَةَ والباقيةَ. رواه مسلم(١١٦٢).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە؟ فەرمووی: دەبێتە هۆی سڕانەوەی گوناحەکانی ساڵی ڕابردوو و داهاتوو.

**سوود**:

١-ڕۆژی عەرەفە سوننەتە بەڕۆژوو بوون تێیدا وە خێری زۆرە ڕۆژی

**عەرەفە دەکا ڕۆژی پێش جەژنی قوربان کە لەو ڕۆژەدا حاجیان لە کێوی عەرەفاتن.**

**٢- بەڵام بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە بۆ حاجیەکان کە لە حەجدان سوننەت نی یە.**

## بەڕۆژوو بوونی نۆیەم و دەیەمی مانگی موحەڕڕەم

١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) أنَّ رَسولَ الله(ﷺ) سُئِلَ عن صيامِ يَومِ عاشوراءَ؟ فقالَ: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الماضِية. رواه مسلم(١١٦٢).

**واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لیٚ کرا دەربارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕڕەم(عاشوراء) فەرمووی: گوناحەکانی ساڵی رابردوو دەسڕێتەوە.**

٢- عن أبي عَطفان بن طريف المُرِّيَّ يقول: سمعتُ عبدالله بْنَ عباسٍ(رضي الله عنهما) يقول: حين صامَ رسولُ الله(ﷺ) يومَ عاشوراءَ وأمرَ بصيامِهِ قالوا: يا رسول الله: إنَّهُ يومٌ تُعَظِّمُهُ اليَهودُ والنَّصارى، فقال رسول الله(ﷺ): فإذا كان العامُ الْمُقْبِلُ إنْ شاء الله صُمنا اليومَ التاسعَ، قال: فَلَمْ يأتِ العامُ المُقبِلُ حتى تُوُفِّيَ رسولُ الله(ﷺ). رواه مسلم(١١٣٤).

**واتە: عبدالله کوڕی عەبباس(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێ: ئەو کاتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی دەی موحەڕڕەم بەڕۆژی بوو کە ناونراوە بە(عاشوراء) , وە فەرمانیدا بە موسڵمانانیش کە ئەو ڕۆژە بەڕۆژی بن , گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەم ڕۆژە جولەکەو دیانەکانیش بە**

گەورەی دەزانن، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جا ئەگەر سالّی داهاتوو هاتەوە ان شاء الله نۆیەمیش بەرۆژی دەبین، ابن عباس دەڵێ: جا سالّی داهاتوو نەهات پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.

**سوود**:

سوننەتە بەرۆژوو بوون لە مانگی موحەڕڕەم بە گشتی , وە رۆژی نۆیەم و دەیەمی موحەڕڕەم بە تایبەتی.

## پاش شێو خواردن سوننەتە بۆ رۆژووەوان

١-عن انس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): تسحَّروا فَإِنَّ في السُّحُورِ بَركة. رواه البخاري (١٩٢٣) و مسلم (١٠٩٥).

واتە: پارشێو بکەن چونکە بێ گومان لە پارشێو کردن بەرەکەت هەیە.

**سوود**:

١-پارشێو کردن سوننەتە جا ئەم سوننەتە پێك دێت ئەگەر بە خواردن و خواردنەوەی کەم بێت یا زۆر ئەگەر بە قوومە ئاوێکیش بێت(عن عبدالله بن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ) تسحروا ولو بجرعة ماء) حديث صحيح رواه ابن ماجة وابن حبان. واتە: پارشێو بکەن ئەگەر بە قوومە ئاوێکیش بێت.

٢- وە سوننەتە درەنگ پاش شێو بخوات .

٣- پارشێو کاتەکەی لە نیوەشەوەوە دەست پێ دەکات.

## سوننەتە بەربانگ زوو بکرێتەوە

عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا يزالُ الناسُ بخيرٍ ما عَجَّلُوا الفِطرَ. رواه البخاري(١٩٥٧) ومسلم(١٠٩٨).

**واتە: بەردەوام خەڵكی هەر چاكن بە درێژایی ئەو ماوەیەی كە بەربانگ زوو دەكەنەوە.**

## سوننەتە بە خورما فتار بکرێتەوە

عن انس(رضي الله عنه) قال: كان النبيُّ(ﷺ) يُفطِرُ قَبلَ أنْ يُصَلِّيَ على رُطَبَاتٍ فإن لَمْ تَكُن رُطباتٌ فَتُميراتٌ فإنْ لَمْ تكُن تُميراتٌ حَسَا حَسَواتٍ مِن ماءٍ. حسن صحيح رواه ابوداود(٢٣٥٦) والترمذي(٦٩٦).

١- حَسَا : شَرِبَ، **واتە: خواردیەوە.**

٢- حَسَوات :**(كۆی**(حسوة)**یە**(وهي المرة مِن الشَّرب) **بریتی یە لە یەك جار لە خواردنەوە.**

**مانای فەرموودەكە: ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) رۆژووەكەی دەشكاند بە چەند دەنكە خورمایەكی تەڕ پێش ئەوەی نوێژ بكات ، ئەگەر چەند دەنكە خورمایەكی تەر نەبوایە بە چەند دەنكە خورمایەكی ووشك , ئەگەر چەند دەنكە خورمایەكی ووشك نەبوایە چەند قومە ئاوێكی دەخواردەوە.**

## که فتارت کردەوە چی دەڵێی

عـن ابـن عمر(رضـي الله عنـه) قـال: كـان رسـول الله إذا أفطـر قالَ(ذهَب الظَمأُ وابْتَلَّتِ العُروق وثبتَ الأجرُ إن شاء الله). حسن رواه ابواود(٢٣٥٧).

**واتە: پێغەمبەر(ﷺ) جاران کە بەربانگی دەکردەوە دەیفەرموو:( ذهَبَ الظَمأ وابْتَلَّتِ العُروق وثبتَ الأجرُ إن شاء الله) واتـە: تێنـوەتی ڕۆیشـت ڕەگ و دەمارەکـان تەڕبوونـەوە خـوا ویسـتی لەسـەر بێـت پاداشـتیش جێگەی خۆی گرت.**

## گەورەیی بەربانگ دانە ڕۆژیەوان

عن زيد بن خالد الجُهني(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مـنْ فَطَّرَ صَائِماً كانَ لَهُ مِثلُ أَجْرِهِ غَير أنَّهُ لا ينقصُ من أجرِ الصائِم شيئاً. صحيح رواه الترمذي (٨٠٧).

**واتە: هەر کەسێك بەربانگ بداتە کەسێکی بە ڕۆژ ئەوە وەکو پاداشتی ڕۆژوو گرەکەی بۆ هەیە ، وە ئەو پاداشتەی بەربانگ دەرەکە بە دەستی هێناوە هیچ لە پاداشتی ڕۆژوو گرەکە کەم ناکاتەوە**

## زانیاری دەربارەی ڕۆژوو

**١-خۆشوشتن بۆ خۆ فێنك كردنەوە بۆ ڕۆژیەوان حەڵاڵە.**

**٢- كل لەچاو كردن جائزە بۆ ڕۆژیەوان**

**٣- (قطرة) لەچاوكردن جائزە بۆ ڕۆژیەوان ئەگەر تامەكەی لە گەروشیدا ببینێ.**

٤– وە(قطرة) لە گوێ کردن ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە.

٥– وە ڕۆژی بەتاڵ نابێتەوە ئەگەر دەرمانێک لەسەر برینێک دابنرێ ئەگەر تامەکەی لە گەروشیدا ببینێ.

٦– بۆن کردنی بۆنەکان و خۆبۆن خۆشکردن ڕۆژی بەتاڵ ناکەنەوە.

٧– ئاو هاتن بە هۆی خەو بینینەوە ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە.

٨– بەڵام ئاو هاتن بە هۆی ماچ کردن یا دەست لێ دان یا بە دەستی خۆهێنان ڕۆژی بەتاڵ دەکاتەوە.

٩– دەرزی و شرینقە لێ دان ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە بە مەرجێك دەرزیەکە دەرزی(مغذي) نەبێت.

١٠– ددان دەرهێنان ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە.

١١– ئەگەر ڕۆژیەوان ترسا بەهۆی ماچ کردن و لەم جۆرەی خێزانەکەی ئاوی بێ یا ببیات بۆ جیماع کردن لەبەر نەبوونی هێزی دەست بەسەرداگرتنی شەهوەتی , ئەو کاتە ماچ کردن و لەم جۆرە حەرامە.

١٢– ڕۆژئاوا بوون پێك دێت بەوەی کە(قرص)ی ڕۆژ نەمێنێ و بزر بێت ئەگەر تیشکی سۆریشی دیار بێت.

١٣–قوت دانەوەی تف و بەڵغەم

قوت دانەوەی تف ڕۆژووی پێ ناشکێ ،بەڵام بەڵغەم ئەگەر هەڵت نەقەناندبوو قوتی بدەی ڕۆژووی پێ ناشکێ ، بەڵام ئەگەر هەڵت قەناند ،ئەوجا قوتت دایەوە ئەوە هەندێك دەڵێن ڕۆژووەکە دەشکێ ،هەندێکی تر دەڵێن ناشکێ ، بەڵام لەوانەیە بەڵغەمەکە پری میکرۆبات بێت تا بۆت دەکرێ بەڵغەم قووت مەدەوە .

# زیکری رۆژانی جەژن

## ١- کردنی نوێژی جەژن

عن أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ : أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ , فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلاَةَ وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ , قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِحْدَانَا لاَ يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ ؟ قَالَ لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا . رواه مسلم (٨٩٠)

**واتە: دایکی (عطیة) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردین کە ئافرەتان دەربێنین و بیانبەین بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان و قوربان — ئەوانیش— کە کچە عازەبن و ئەوانەشی کە لە حەیزدان وە ئەوانەشی کە لە پشت پەردەدان [1]، جا ئەوانەی حەیز دار بوون نوێژیان نەدەکردو کەنار گیر دەبوون، بەڵام ئامادەیی خێرو دوعای موسڵمانان دەبوون، ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئی وامان هەیە عەبای نییە، فەرمووی: با خوشکەکەی لە عەبای خۆی لەبەری بکات.**

**سوود:**

**١– نوێژی جەژنی رەمەزان دەکەوێتە یەکەمین رۆژی مانگی شەوال، وە نوێژی جەژنی قوربان دەکەوێتە دەیەمین رۆژی مانگی (ذو الحجة) ئەم دوو نوێژە زۆربەی زانایان بە سوننەتی دەزانن، بەڵام هەندێك دەڵێن واجبە.**

(١) الخدور: البيوت، وقيل الخدر بِترٌ فيكون في ناحيه البيت.

(عبدالعظيم) لة (الوجيز) دا دەڵێ: (صلاة العيدين واجبة على الرجال والنساء، لمواظبة النبي (ﷺ) عليها وأمره بالخروج لها).

٢- ئەم نوێژە دوو ركاتە , كاتەكەی دەست پێ دەكات لە دوای بەرز بوونەوەی رۆژ بەقەد رمحێك دەكا (١٥) بۆ (٢٠) دەقیقە لەدوای رۆژ هەڵاتن , وە كۆتایی دێت لەو كاتەی رۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات (زوال الشمس).

٣- هەندێك لە زانایان دەڵێن دەتوانی بە تەنیا بیكەی، بەڵام هەندێكی تر دەڵێن بە كۆمەڵ كرانی مەرجە، وە (عثيمين) دەڵێ: (ابن تيمية) ئەوەی هەڵبژاردووە كە ئەگەر ئەم نوێژە لەگەڵ ئیمام نەكرا (لا يُشرع قضاؤها) قەزا ناكرێتەوە، وە دەڵێ: ئەوەش لای من نزیكترە لە راستی.

٤- جەماوەری زانایان دەڵێن سوننەتە ئەم نوێژە لە دەرەوەی مزگەوت بكرێ، وە ئەم نوێژە بانگ و قامەتی تیادا نییە وە گوتنی (الصلاة الجامعة) سوننەت نیە.

٥- سوننەتە لە ركاتی یەكەم لەدوای (فاتحة) سورەتی (الأعلى) [١]، یان (ق) [٢]، بخوێنرێ، وە لە ركاتی دووەم سورەتی (الغاشية) یان (قمر) بخوێنرێ.

---

(١) رواه مسلم (٨٧٩).

(٢) رواه مسلم (٨٩١).

## ٢- تەكبیراتی ناو نوێژ و دەرەوەی نوێژ لە ڕۆژانی جەژندا

[عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى فِي الْأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ وَفِي الثَّانِيَةِ خَمْسًا .رواه مسلم (١١٤٩)

**واتە: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا لە ڕکاتی یەکەم (٧) جار دەیگوت (الله أكبر) ئەمە جگە لە (الله أكبر) کردنی نوێژ دابەستن، وە لە ڕکاتی دووەم (٥) جار دەیگوت (الله اكبر) ئەمەش جگە لە (الله اكبر) کردنی هەستانەوە.**

**سوود:**

**١- ئەم تەكبیراتانە پێش خوێندنی (فاتحة) و قورئان خوێندن دەگوترێن. لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئەم تەكبیراتانە سوننەتن، هەندێکیشیان دەڵێن فەرزە.**

**٢- هیچ فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهاتووە باس لە زیکرێکی دیاری کراو بکات لەنێوانی تەكبیراتەکان ، ئەوەی هەیە لە سەلەفەوە هاتووە، بۆیە (أبو حنيفة) و (مالك) و (أوزاعي) دەڵێن تەكبیراتەکان یەك لەدوای یەك دەگوترێن و هیچ شتێك لە نێوانی تەكبیراتەکان ناڵێ، وە ئیمام ئەحمەدو شافیعی دەڵێن زیکر لەم نێوانەدا دەکرێ، جا تۆش دەتوانی لەم نێوانەدا بڵێی** (سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا ألله والله أكبر) يا (الله أكبر كبيرا والحمد لله كثيرا وسبحان الله بكرة وأصيلا)، **لە شافیعیەکان و حەنبەلیەکان و حەنەفییەکان لەسەر ئەوەن کە دەست بەرز کردنەوە موستەحەبە لە تەكبیراتەکانی نوێژی جەژن، بەڵام دەست بەرز کردنەوە لە تەکبیرەی یەکەم** (تكبيرة الإحرام) **لە نوێژی جەژن و جەنازە ئەوە ئیجماعی لەسەرە.**

## ٣- تەکبیراتی ڕۆژی جەژن

عن ابن مسعود أنه كان يُكَبِّرُ أيّامَ التَّشريق ( الله أكبر  الله أكبر ، لا اله الا الله  الله أكبر ، الله أكبر ولله الحمد) أخرجه ابن أبي شيبة واسناده صحيح.

**واتـە: (عبـدالله)ی کـوڕی مەسـعود لـە ڕۆژانـی جـەژنی قوربانـدا بـەم شێوەیە تەکبیراتی کردووە** (الله أكبر الله أكبر ، لا اله الا الله  الله أكبر، الله أكبر ولله الحمد).

**سوود**:

**١- ئەم تەکبیراتانە بەجۆری تریش ریوایەت کراون.**

**٢- کاتی تەکبیرات لە جەژنی ڕەمەزان دەست پێ دەکات لەو کاتـەی دەردەچی بۆ شـوێنی نوێـژ تـا نوێـژ دەکـرێ، وە تـەکبیرات لـە جـەژنی قوربان دەست پێ دەکات لە بـەیانی ڕۆژی عەرەفـەوە تـا عەسـری ڕۆژی چوارەمینی جەژن.**

**٣-ئەم تەکبیراتانە بیدعەیە لە دوای نوێژەکان بە جەماعی بکرێ.**

**٤- کان ابن عباس يكبر فيقول:** (الله أكبر الله أكبر الله أكبر، لا اله الا الله الله أكبر، الله أكبر ولله الحمد) [(١)]

---

(١) الأرواء، ١٢٥.

## ٤- خۆ شۆردن له جەژندا

عن علي رضي الله عنه أنّهُ سُئلَ عن الغُسلِ فقال:( يومَ الجمعة، ويـوم عرفـة، ويـوم الفطـر، ويـوم الاضـحى)، رواه الشـافعي(١١٤) والبيهقي(٣/٢٧٨) بسند صحيح.

**واته: پرسيار له ئيمامی عەلی كرا دەربارەی غوسلی سوننەت، فەرمووی: رۆژی هەینی، رۆژی عەرەفە، رۆژی جەژنی رەمەزان، وە رۆژی جەژنی قوربان.**

## ٥- پيرۆزبايی جەژن كردن له يەكتری

عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ قَالَ "كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – إِذَا الْتَقَوْا يَوْمَ الْعِيدِ يَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ : تَقَبَّلَ اللَّهُ مِنَّا وَمِنْكَ . قال ابن الحجر في (الفتح ) اسناده حسن.

**واته: جوبەيری كوڕی نوفەير دەڵێ: ئەسحابەكانی پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك كه له رۆژی جەژن بەيەكتر دەگەيشتن هەندێكيان بە هەندێكيانی دەووت (تقبلَ اللهُ مِنّا ومنك) واته: خوا له ئێمەو ئێوەشی قەبوڵ بكات.**

## سوود:

**(عثيمين) دەڵێ: پيرۆزبايی كردن لە رۆژی جەژن جائيزە بەوەی كە خەڵك لەسەری راهاتوون بەمەرجێك گوناح نەبێت (الفتاوی المهمة).**

## ٦- کاتێك نوێژی جەژن و نوێژی جومعە بکەونە یەك ڕۆژ

١- هەر یەکێك لەو ڕۆژەی کە یەکەم ڕۆژی جەژن دەکەوێتە ڕۆژی جومعە، ئەگەر نوێژی جەژنی کرد، بۆی هەیە نوێژی جومعە بە جەماعەت لە مزگەوت نەکات بەڵکو تەنها چوار رکاتی نیوەڕۆ بکات، بەڵام ئەگەر لەگەڵ خەڵك نوێژی جومعە بکات ئەوە باشترە.

٢- ئەوەی نوێژی جەژنی نەکردبێ و ئامادەی نەبووبێت، واجبە بچێ بۆ نوێژی جومعە.

٣- واجبە لەسەر ئیمام کە نوێژی جومعەش بکات.

# حەج و عومرە

حەج روکنێکە لە روکنەکانی ئیسلام، کەواتە حەج پلەو پایەکی بەرزی هەیە لە ئیسلامدا، حـەج یـەك جـار واجبـە لەسـەر هـەموو موسـڵمانێکی پێگەیشتوو (بالغ) کە لە توانایدا هەبێت جا پیـاو بێـت یـا ئـافرەت، خـوا دەفـــــەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗا﴾ (آل عمران: ٩٧).

واتە: بۆ خودا هەیە لەسەر خەڵکدا حەج کردنـی کەعبـە هـەر کەسـێك کە توانای گەیشتنی هەبێت بۆی.

جـا هـەر کەسـێك کـە حـەج دەکـات ئـەوە روکنێـك و کـارێکی خێـری گەورەی ئەنجام داوە, ئەوەشـی کـە لـە توانایـدا هەیـە بچـێ بـۆ حـەج و ناچـێ ئـەوە گونـاحێکی گـەورە (کبـائر) ی ئـەنجام داوە، بۆیـە دەبـێ موسـڵمان حـەج زۆر بـە گـرنگ وەربگـرێ کـەم تەرخـەمی و رەزیلـی و تەمبەڵی تیادا ناکات، هەوڵ بدات بەخۆ بەو گوناحە گـەورە نەگەڕێتـەوە بۆ لای خوا، وە هەروەها عومرە کـردنیش پاداشـتی زۆرە بەتایبـەتی لـە رەمەزاندا .

## گەورەیی حەج کردن

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: سمعتُ النبيَّ(ﷺ) يقولُ: مَـنْ حَـجَّ للهِ فَلَـمْ يَرفُـثْ، ولَـمْ يَفْسُـقْ رجَـعَ كَيَـومِ وَلَدَتْـهُ أُمُّـهُ. رواه البخاري(١٥٢١) ومسلم(١٣٥٠).

واتە: هەر یەکێك حەج بکات بۆ خوا ، جا قسەی خراپ نەڵێت و کاری خراپ نەکات، ئەوە دەگەڕێتەوە وەك ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لە دایك بووە.(واتە گوناحی نامێنن وەك منداڵ کە تازە لە دایك دەبێ)

٢- عن عائشة أُمِّ المؤمنين(رضي الله عنها) أنها قالت: قلتُ يا رَسُول الله نَرَى الجهادَ أفضل العَمَل أفلا نجاهد؟ قال: لا ولكنَّ أفضَلَ الجِهادِ حَجٌّ مَبرور. رواه البخاري(١٥٢٠).

واتە: دایکی ئیمانداران عائشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە جیهاد کردن بە باشترین کردەوە دەبینین جا ئایا جیهاد نەکەین؟ فەرمووی: نەء، بەڵام(بۆ ئێوەی ژنان) حەجێك کە گوناهی تیادا نەکرێت باشترین جیهادە.

## پلەو پایەی عومرە کردن

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: العُمْرةُ إلى العُمرةِ كفَّارةٌ لما بينهما والحجُّ المبرورُ ليسَ لَهُ جزاءٌ إلاّ الجَنَّةُ. رواه البخاري(١٧٧٣) ومسلم(١٣٤٩).

واتە: عومرە هەتا عومرەیەکی تر سڕەرەوەیە بۆ ئەو(گوناحانەی) کە لە نێوانیاندایە , حەجێك کە هیچ گوناحێکی تیا ناکرێت جگە لە بەهەشت هیچ پاداشتێکی دیکەی نیە.

**سوود**:

١-(العمرة): له زماندا واته سەردان(زيارة) بەلاَم له (شەرع)دا پێناسەی بەم شێوەیە:(سەردانی ماڵی خوایه بە ئیحرام بەستن و سووڕانەوه بە دەوری کەعبەداو هاتن و چوون له نێوان صەفاو مەڕواداو تاشینی سەر یان کورت کردنەوه)

٢- (جميع أيام السنة وقت العمرة إلاّ انها في رمضان أفضلُ منها في غيره) [1]

واته: هەموو ڕۆژەکانی ساڵ کاتن بۆ عومره کردن بەلاَم له مانگی ڕەمەزان چاکتره.

کەواته: عومره کردن وەکو حەج کردن نییه کاتێکی دیاری کراوی هەبێت.

٣-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال:(.... فَإِنَّ عُمرةً في رَمضان تقضِي حَجَّةً معي) رواه البخاري(١٨٦٣).

واته: بێ گومان عومرەیەك که له مانگی ڕەمەزاندا بکرێ وەکو کردنی حەجێکه لەگەڵ مندا.

---

(١) الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز.

# فەزلی نوێژکردن لەمزگەوتی حەرامو مزگەوتی پێغەمبەر

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: صلاةٌ في مسجدي هذا خيرٌ مِنْ ألف صلاةٍ فيما سِواهُ إلاّ المسجدَ الحرام. رواه البخاري(١١٩٠) ومسلم(١٣٩٤).

**واتە: نوێژێك لەو مزگەوتی منە باشترە لە هەزار نوێژ لە شوێنەكانی دیكە جگە لە مزگەوتی حەڕام نەبێت .**

٢- عن جابر(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: صلاةٌ في مسجدي أَفْضَلُ مِنْ ألفِ صَلاةٍ فيما سِواهُ إلاّ المسجِدَ الحرامَ وصلاةٌ في المسجد الحرامِ أفْضَلُ مِنْ مِئَةِ أَلْفِ صلاةٍ فيما سواهُ، قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه احمد وابن ماجه باسنادين صحيحين.

**واتە: نوێژێك لە مزگەوتی من باشترە لە هەزار نوێژ لە جگە لەو تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت , وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرام باشترە لە سەت هەزار(١٠٠٠٠٠) نوێژ لە شوێنەكانی دیكە.**

# زیكرەكانی نووستن ، خەوتن

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (مَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا لَمْ يَذْكُرْ اللَّهَ تَعَالَى فِيهِ إِلَّا كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ إِلَّا كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ )[1].**واتە: هەر یەكێك پاڵ بداتەوە لە شوێنێك , ناوی خوای بەرز نەهێنێ لەم جێگایەدا ، ئیللا دەبێتە هۆی كەم و كوڕییەك لەسەر ئەو كەسە لە ڕۆژی قیامەتدا، وە هەر یەكێك لە شوێنێكدا دابنیشێ ناوی خوای (عزّ وجلّ)ی تیادا نەهێنێ، ئیللا دەبێتە هۆی نەقس و كەم و كوڕییەك لەسەر ئەو كەسە لە ڕۆژی قیامەتدا.**

## زیكری یەكەم- خەوتن :

عن حذيفة قال: كان النبيُّ(ﷺ) اذا نام قال: أللهمّ باسمكَ أحيا وأموت. واذا استيقظَ قال: الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا و إليه النُّشور. رواه البخاري(٦٣١٤) و مسلم(٢٧١١) وأبوداود(٥٠٤٩).

**واتە: حوزەیفە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك خەوتبا دەیفەرموو(**أَللهمّ باسْمِكَ أحيا وأمُوت**) واتە: ئەی خودایە بە ناوی تۆ دەژیم و دەمرم، وە كاتێك بەخەبەر بهاتبایە دەیفەرموو(**أَلحمد لله الذي أحْيانا بعدَ ما أماتَنا ,وإليه النُّشور**) واتە: هەموو سوپاس ستایشێك بۆ ئەو خوایەی كە زیندووی كردوینەوە دوای ئەوەی كە ئێمەی مراندبوو، وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە.**

---

(١) حسن :رواه ابوداود(٥٠٥٩)

## زیکری دووەم- خەوتن :

٣- عـن حَفْصَـةَ زوجِ النبـيِّ(ﷺ) أنَّ رسـول الله(ﷺ) كـانَ إذا ارادَ أنْ يَرقُدَ وضَعَ يَدهُ اليُمنى تَحتَ خَدِّهِ ثُمَّ يقولُ:(اللهمَّ قِني عذابكَ يومَ تبْعَثُ عبادَكَ) ثلاث مرار[1].

**واتە: حەفسەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بیویستبا پاڵ بداتەوە دەستی راستی لە ژێر روومەتی دادەناو لە پاشان دەیفەرموو(اللهمَّ قِني عذابكَ يومَ تبعَثُ عبادَكَ) سێ جار ئەمەی دەفەرموو. (بەڵام گوتمان تەنها گوتنی یەك جار بە(صحیح)ی هاتووە).**

### سوود:

**١-ئەم فەرموودەیە لە(سنن الترمذي) بە(صحيح)ی هاتووە لە فەرموودەی ژمارە(٣٣٩٨) باسی یەك جار گوتنی زیکرەکە دەکات.**

**٢- مانای زیکرەکە: واتە: ئەی خودایە بمپارێزە لە عەزابت لەو رۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیەوە.**

## زیکری سێیەم- خەوتن: خوێندنی (آية الكرسي)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ وَكَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ فَأَتَانِي آتٍ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ وَقُلْتُ وَاللَّهِ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ وَلِي حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ قَالَ فَخَلَّيْتُ عَنْهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

---

(١) رواه ابوداود(٥٠٤٥) ئەلبانی دەڵێ ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە، بەڵام(ثلاث مرار)ی لەگەڵدا نەبێت، واتە گوتنی یەکجار ئەم زیکرە بە(صحیح)ی هاتووە.

وَسَلَّمَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالًا فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّهُ سَيَعُودُ فَرَصَدْتُهُ فَجَاءَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ دَعْنِي فَإِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ لَا أَعُودُ فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالًا فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ فَرَصَدْتُهُ الثَّالِثَةَ فَجَاءَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ وَهَذَا آخِرُ ثَلَاثِ مَرَّاتٍ أَنَّكَ تَزْعُمُ لَا تَعُودُ ثُمَّ تَعُودُ قَالَ دَعْنِي أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهَا قُلْتُ مَا هُوَ قَالَ إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ { اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ } حَتَّى تَخْتِمَ الْآيَةَ فَإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلَا يَقْرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ زَعَمَ أَنَّهُ يُعَلِّمُنِي كَلِمَاتٍ يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِهَا فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ مَا هِيَ قُلْتُ قَالَ لِي إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ مِنْ أَوَّلِهَا حَتَّى تَخْتِمَ الْآيَةَ {اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ } وَقَالَ لِي لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلَا يَقْرَبَكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الْخَيْرِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلَاثِ لَيَالٍ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ لَا قَالَ ذَاكَ شَيْطَانٌ[1].

---

(١) رواه البخاري (٢٣١١).

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) پارێزگاری کردنی زەکاتی رەمەزانی بە من سپاردبوو، یەکێك هاتە لام کەمێکی لە خواردنەکە برد، منیش گرتم و گوتم بەخوا دەتدەمە دەست پێغەمبەری خوا، ئەویش گوتی: من پێویستیم وە منداڵی هوردم هەن و پێداویستیەکی زۆریشم هەیە، دەڵێ منیش وازم لێ هێنا، بەیانیم کردەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی ئەبو هورەیرە دیلەکەی دوێنێ شەوت چی کرد؟ منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا سکاڵای کرد کە زۆر پێویستە وە خاوەنی خێزان و ماڵ و منداڵە، بۆیە منیش رەحمم پێیدا هاتەوەو بەرەلام کرد، فەرمووی ئاگاداربە بێ گومان درۆی لەگەڵتدا کردووەو دیسان دێتەوە، جا منیش زانیم کە دێتەوە لەبەر قسەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی دەگەرێتەوە، دەڵێ: منیش بۆی لە کەمین دانیشتم و کەسەکە هاتەوەو هەندێکی لە خواردنەکە برودو گرتم، گوتم دەتبەم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی لێم بگەرێ من موحتاجم و خاوەنی ماڵ و منداڵم، جارێکی تر ناگەرێمەوە، منیش رەحمم پێیدا هاتەوەو بەرمدا، بەیانیم کردەوەن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەسیرەکەت چی کرد؟ گوتم ئەی پێغەمبەری خوا سکاڵای کرد کە پێداویستیەکی زۆری هەیەو خاوەنی ماڵ و منداڵە، منیش بەزەییم پێیدا هاتەوەو بەرمدا، فەرمووی ئەو درۆی لەگەڵدا کردی و دیسان دەگەرێتەوە، جا جاری سێ یەم مراقەبەم کردو بۆی دانیشتم , هات هەندێ خواردنی بردو منیش گرتم و گوتم دەتبەمە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە سێ جارە تۆ دەڵێی نایەمەوەو لە پاشان دێیەوە، گوتی بەرەڵام بکە هەندێ ووشەت فێر دەکەم خوا بە هۆیانەوە سوودت پێ دەگەیەنێت، گوتم ئەوانە چینە؟ گوتی: هەر کاتێك چویتە ناو جێگای نووستن (آية الكرسي) بخوێنە

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة: ٢٥٥، تا تەواوی دەکەی (ئەگەر وات کرد) ئەوە خوا پارێزەرێکت بۆ دادەنێ و شەیتان نزیکت ناکەوێتەوە تا بەیانی، جا منیش بەرمدا، کە بەیانیم کردەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم: دوێنێ شەو ئەسیرەکەت چی کرد؟ گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەو گوتی: کە ئەو هەندێ ووشەم فێر دەکات بەهۆیەوە خوا سوودم پێ دەگەیەنێت، منیش بەرمدا، گوتی چیە؟ گوتم: پێی گوتم ئەگەر چویە ناو جێگای نووستن (آیة الكرسي) بخوێنە تا تەواوی دەکەی , وە پێی گوتم :(ئەگەر وا بکەی) خوا پارێزەرێکت بۆ دادەنێ وە شەیتان نزیکت ناکەوێتەوە تا بەیانی , وە ئەسحابەکانیش زۆر سوور بوون لە سەر بەدەست هێنانی خێرو چاکە) جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێ گومان ئەو قسەیەی راست بووە لە گەڵتدا بەڵام ئەو زۆر درۆزنە ، جا فەرمووی ئەی ئەبو هورەیرە دەزانی ئەوە ماوەی سێ شەوە قسە لەگەڵ کێ دەکەیت؟ گوتی نەخێر، فەرمووی ئەوە شەیتان بوو.

## زیکری چوارەم –خەوتن :

عن علي((رضي الله عنه) انَّ رسولَ الله(ﷺ) قالَ لَهُ ولفاطمة: إذا أَخَذْتُما مضاجِعَكما فَكَبِّرا اللهَ اربعاً وثلاثين، واحمدا ثلاثاً وثلاثينَ، وسَبِّحَا ثلاثاً وثلاثين. رواه البخاري(٣١١٣) ومسلم(٢٧٢٧).

واتە: ئیمامی عەلی(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەو و فاتیمەی فەرمووە: ئەگەر چوونە ناو جێگای نووستن(٣٤) جار بڵێن(الله اكبر) وە(٣٣) جار بڵێن(الحمد الله) وە(٣٣) جار بڵێن (سبحان الله).

## زیکری پێنجەم- خەوتن :

٦- عن عائشة: أنَّ النبيَّ(ﷺ) كانَ اذا أوى الى فِراشهِ كُلَّ ليلةٍ جمعَ كفَّيهِ ثُمَّ نَفثَ فيهما فقَرأ فِيهما: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ ثُمَّ يَمسحُ بِهما ما اسْتطاعَ مِن جَسدهِ، يَبدأُ بِهما على رأسهِ وَوجههِ، وما أَقبَلَ مِنْ جَسدهِ، يفعلُ ذلك ثلاثَ مَرّات. رواه البخاري(٥٠١٧) وأبوداود(٥٠٥٦).

النَّفثُ: نفخٌ لطيف بلا ريق، **واتە: فووەکی نەرم بەبێ تف.**

**واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بچووبایە ناو جێگای نووستن هەموو شەوێ ، هەردوو دەستی پێکەوە دەناو لە پاشان فووەکی نەرمی تێ دەکرد، ئینجا سورەتی(إخلاص) و(فلق) و(ناس)ی تیادا دەخوێند، لە پاشان هەردوو دەستەکانی دەهێنا بەسەر جەستەیدا ئەوەندەی پێی بکرایە ، یەکەم جار سەرو دەم و چاوی مەسح دەکرد لەگەڵ پێشەوەی جەستەیدا ، وە ئەمەشی سێ جار دووبارە دەکردەوە.**

## زیکری شەشەم-خەوتن :

٧- عن الحارثِ بنِ جَبلة قال: قُلتُ يا رسولَ اللهِ عَلِّمني شيئاً أقولُهُ عندَ مَنامي قال: إذا أخَذْتَ مَضْجعكَ مِن الليل فاقْرأْ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ فإنها بَراءةٌ مِن الشِّرك. حسن: رواه أحمد في المسند(٢٧٨٩٤).

واته:(حارث بن جبلة) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێر بکە لە کاتی نوستندا بیڵێم، فەرمووی: کاتێك چوویە ناوی جێگای نووستن﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١﴾ ﴾ بخوێنە، چونکە بێگومان ئەم سوورەتە بەریبوونە لە شیرك و هاوبەش.

## زیکری حەوتەم- خەوتن:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ. رواه البخاری(٦٣٢٠)

واتە: هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە چووە ناو جێگای نووستن، با بەلایەکی جێگاکەی رایەخەکەی دابەوەشێنێ، چونکە ئەو نازانێ لەدوای ئەودا چی چوەتە ناوی، لە پاشان با بڵێ: (بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ).

واتە: بەناوی تۆ پەروەردگارم تەنیشتم (لەسەر جێگا) دانا، وە هەر بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر گیانی منت گرت و نەتگەڕاندەوە ناو لاشەم ئەوە رەحمی بکە، وە ئەگەر گەڕاندتەوە ناو لاشەم ئەوە بیپارێزە بەوەی کە بەندە چاکەکانت پێ دەپارێزی.

## زیكری هەشتەم- خەوتن :

عَنْ أَبِي الْأَزْهَرِ الْأَنْمَارِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنْ اللَّيْلِ قَالَ :{بِسْمِ اللَّهِ وَضَعْتُ جَنْبِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي وَأَخْسِئْ شَيْطَانِي وَفُكَّ رِهَانِي وَاجْعَلْنِي فِي النَّدِيِّ الْأَعْلَى}.صحيح:رواة ابوداود(٥٠٥٤)

**واتە: كاتێك كە پێغەمبەر (ﷺ) بچووبا ناو جێگای نووستن بەشەو دەیفەرموو بەناوی خوا تەنیشتم لەسەر جێگا دانا، ئەی خودایە لە گوناحەكانم خۆش بە، وە شەیتانەكەم لێ دوور بخەوە, وە گەردنم لە هەرچی حەقێك هەیە لەسەرم ئازادی بكە, وە دام بنێ لە كۆری بەرزو بەرێزان (لای فریشتەكان).**

مانای هەندێك لە ووشەكانی فەرموودەكە:

١- أللهم : **واتە: يا الله، یانی ئەی خودایە.**

٢- وأخسيء: أي أبعد وآطْرُدْ. **دوور بخەوە**

٣- فُكَّ : (فَكّ الشيء) خلَّصَهُ، (فَكَّ الرَّقَبَةَ) **واتە:** (أعتقها) **یانی: بەندەكەی ئازاد كرد.**

٤- النديّ : المجلس الْمُجتَمعُ.

## زیكری نۆیەم- خەوتن :

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ أبابكرٍ الصِّدِّيقَ(رضي الله عنه) قال: يا رسول الله مُرْني بكلماتٍ أقولُهُنَّ إذا أَصْبَحتُ واذا أمْسَيتُ، قال: قُلْ:(أللهمَّ فاطِرَ السَّماوات والأرضِ، عالِمَ الغيبِ والشَّهادةِ، رَبَّ كُلِّ شيءٍ

ومَليكَهُ، أشهدُ ان لا إله إلا أنت،أعوذُ بكَ مِن شَرِّ نَفسِي و شَرِّ الشيطانِ وشِركِهِ) قالَ: قُلها إذا أصبحتَ، وإذا أَمسَيتَ، وإذا أَخَذتَ مَضْجِعَكَ).

صحيح: رواه ابوداود(٥٠٦٧) والترمذي(٣٣٩٢).

فاطر : **داهێنەر.**

ومليكه: أي: مالكه، **یانی: خاوەنی.**

وشِركِهِ: أي ما يدعو اليهِ من الإشراك بالله. **یانی: ئەوەی کە بانگی بۆ دەکات لە شەریك پەیدا کردن بۆ خوا.**

<u>مانای فەرموودەکە</u>

**ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەبوبەکر(خوای لێ رازی بێت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێ ووشەم پێ بفەرموو بەیانیان و ئێواران بیڵێم: ئەویش فەرمووی: بڵێ:**(أَللهمَّ فاطِرَ السَّماوات والأرضِ، عالِمَ الغيبِ والشَّهادةِ، رَبَّ كُلِّ شيءٍ ومَليكَهُ، أشهدُ أن لا إله إلا أنت،أعوذُ بكَ مَن شَرِّ نَفسِي و شَرِّ الشيطانِ وشِرْكِهِ).

**واتە: ئەی خودایە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا، پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوی بە ڕاستی نییە بێجگە لە تۆ، خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەری نەفسم وە لە شەری شەیتان و ئەوەی بانگی بۆ دەکات لە شیرك. جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بڵێ کاتێ کە بەیانی دەکەیتەوە، وە کاتێك کە ئێوارە دەکەیتەوە وە کاتێکیش کە دەچیتە ناو جێگای نووستن.**

## زیکری دەیەم- خەوتن :

٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ أَمَرَ رَجُلًا إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ قَالَ اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ أَسَمِعْتَ هَذَا مِنْ عُمَرَ فَقَالَ مِنْ خَيْرٍ مِنْ عُمَرَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .رواه مسلم(٢٧١٢)

**واتە: (عبدالله) کوڕی عومەر فەرمانی بە پیاوێك کرد کاتێك کە چووە ناو جێگـای نووسـتن بڵـێ:** (اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ).

**پیاوەکە ووتی ئەمەت لە عومەری باوکتەوە گوێ لێ بووە؟ (ابن عمر) گوتی: لە یەکێك باشتر لە عومەر , لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) .**

ماناى زیکرەکە:

(اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ). **ئەی خوایە نەفسی منت دروست کردووە، وە هەر تۆش دەیمرێنی، مردنی و ژیانی بۆ تۆیە، واتە: توانای مراندنی و ژیاندنی بەدەستی تۆیە، ئەگەر زیندووت کردەوە بیپارێزە (لەهەموو شتێك کە زیانی پێ دەگەیەنێ) وە ئەگەر مراندت و (جیات کردەوە لە لاشەم) لێی خۆش بە، ئەی خودایە داوای سەلامەتیت لێ دەکەم (لەهەموو ناخۆشیەك و زەرەرو زیانێك).**

## زیکری یازدەم- خەوتن :

عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ: ( الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانِي وَآوَانِي وَأَطْعَمَنِي وَسَقَانِي وَالَّذِي مَنَّ عَلَيَّ فَأَفْضَلَ وَالَّذِي أَعْطَانِي فَأَجْزَلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ اللَّهُمَّ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ وَإِلَهَ كُلِّ شَيْءٍ أَعُوذُ بِكَ مِنْ النَّارِ) .رواه ابوداود باسناد صحيح

**واتە: (ابن عمر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك بچووبا ناو جێگای نووستن دەیفەرموو: هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی کە دەوڵەمەندو بێ پێویستی کردم، وە ماڵ و جێگای بۆ دابین کردووم، وە خواردن و خواردنەوەی پێ داوم، وە ئەوەی نیعمەتی پێ داوم، وە ئەوەی نیعمەتی لەگەڵدا کردووم بە زیادەوە، وە ئەوەی کە زۆری پێ بەخشیوم، ستایش بۆ خوا لەسەر هەموو حاڵێکدا، ئەی خودایە پەروەردگارو پادشای هەموو شتێکی, وە پەرستراوی هەموو شتێکی, خۆم دەپارێزم بەتۆ لە ئاگر***

## زیکری دوازدەم -خەوتن :

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ ((اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَرَبَّ الْأَرْضِ وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِي شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنْ الْفَقْرِ))[1].

---

(١) رواه مسلم (٢٧١٣) وأبو داود (٥٠٥١) وأحمد في المسند (٨٧٣٧).

**واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە دەچووە ناو جێگای نووستن دەیفەرموو:** ((اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَرَبَّ الْأَرْضِ وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِي شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنْ الْفَقْرِ)).

**واتە: ئەی خودایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی و پەروەردگاری هەموو شتێکی, شەق کاری دانەوێڵەو[1]، ناوکی خورما , دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، خۆم دەپارێزم[2] بەتۆ لە شەڕو خراپەی هەموو خاوەن شەڕێ کە جڵەوی بەدەستی تۆیە، (ئەی خودایە) تۆ یەکەمین و هیچ شتێك لە پێش تۆوە نەبووە، وە تۆ دواهەمین و هیچ شتێك لەدوای تۆوە نییە، وە تۆ لەسەرووی هەموو شتێکی[3]، وە هیچ شتێك لە سەرووی تۆ نییە، وە تۆ شاراوەی لە دروستکراوەکانت، جا هیچ شتێك لە دوای تۆوە لەتۆ شاراوەتر نییە (تا وای لێهاتووە هیچ کەسێك نازانێ و گومانیشی بۆ ئەوە ناچێت کە زاتی تۆ چۆنە لەگەڵ تەواوی ئاشکرایی تۆ) قەرزەکانمان بۆ بدەرەوەو دەوڵەمەندمان بکە لە هەژاری**

## سوود:

١- (بناصیته): (الناصية) **واتە: پرچی پێشەوەی سەر.**

(١) وەك دەنکی گەنم.

(٢) پەنا دەگرم

(٣) خوای گەورە لەسەرووەی هەموو دروستکراوەکانە، هیچ دروستکرایك نییە لە زاتی خوا بەرزتر بیت یا لە ئاستی ئەویش بیت.

٢- وأنت الآخر.

وَأَمَّا تَسْمِيَتُهُ سُبْحَانَهُ بِالْآخِرِ ، فَقَالَ الْإِمَامُ أَبُو بَكْرِ بْنُ الْبَاقِلَّانِيِّ : مَعْنَاهُ بِصِفَاتِهِ مِنَ الْعِلْمِ وَالْقُدْرَةِ وَغَيْرِهِمَا الَّتِي كَانَ عَلَيْهَا فِي الْأَزَلِ ، وَيَكُونُ كَذَلِكَ بَعْدَ مَوْتِ الْخَلَائِقِ ، وَذَهَابِ عُلُومِهِمْ وَقَدَرِهِمْ وَحَوَاسِّهِمْ ، وَتَفَرُّقِ أَجْسَامِهِمْ ، قَالَ : وَتَعَلَّقَتِ الْمُعْتَزِلَةُ بِهَذَا الِاسْمِ ، فَاحْتَجُّوا بِهِ لِمَذْهَبِهِمْ فِي فَنَاءِ الْأَجْسَامِ وَذَهَابِهِمْ بِالْكُلِّيَّةِ ، قَالُوا : وَمَعْنَاهُ الْبَاقِي بَعْدَ فَنَاءِ خَلْقِهِ ، وَمَذْهَبُ أَهْلِ الْحَقِّ خِلَافُ ذَلِكَ ، وَأَنَّ الْمُرَادَ الْآخِرُ بِصِفَاتِهِ بَعْدَ ذَهَابِ صِفَاتِهِمْ ، وَلِهَذَا يُقَالُ : آخِرُ مَنْ بَقِيَ مِنْ بَنِي فُلَانٍ فُلَانٌ ، يُرَادُ حَيَاتُهُ ، وَلَا يُرَادُ فَنَاءُ أَجْسَامِ مَوْتَاهُمْ وَعَدَمُهَا ، هَذَا كَلَامُ ابْنِ الْبَاقِلَّانِيِّ .

**٣- وَأنت الباطن فليس دونك شيء**: أي المحتجب عن خلقك، الذي ليس ورائك شيء يكون أبطن منك، حتى لا يقدر أحد على إدراك ذاتك مع كمال ظهورك، وقيل: العالم بالخفيات.

## زيكرى سيزدەم -خەوتن :

**عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) من قال حين يأْوي إلى فراشهِ (لا إله إلا الله وحده لا شريك لَه، لَهُ الملك وله الحمد، وهو على كلّ شيء قدير، لا حول ولا قوة إلاّ بالله، سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر) غفر الله ذنوبَهُ أو خطاياهُ وإن كان مثل زبَد البحر)** [1].

**واتە: هەر يەكێك كاتێك دەچێتە ناو جێگای نووستن ئەم زيكرە بكات كە لە نێوانی دوو كەوانەكە دايە بەسۆرى نووسراوە، خوا لە هەموو گوناهەكانى خۆش دەبێت ئەگەر وەكو كەفاوى دەرياش بێت***

(١) رواه ابن حبان (٥٨٧-٣٢٦٥) واللفظ له، وابن السني في (عمل اليوم والليلة) (٢٢٩-٧١٦) والنسائي في (عمل اليوم والليلة) (٤٧١-٨١١) وصححه الألباني في (السلسلة الصحيحة -٣٤١٤).

## زیکری چواردەم –خەوتن :

عن أبي أمامة قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: مَن أوى إلى فِراشِه طاهراً، لم يَنقلبْ ساعةً من الليل يسأل اللهَ شيئاً مِن خيرِ الدنيا والآخرة إلاّ أعطاهُ اللهُ إيّاه (١).

**واتە: هەر یەکێك بچێتە ناو جێگای نووستن بە دەست نوێژەوە، هەر کاتێك لە شەودا لە بارێك وەربگەڕێتە سەر بارێکی تر، داوای شتێك لە خوا بکات لە خێرو چاکەی دونیاو دواڕۆژ ئیللا خوا پێی دەدات.**

## زیکری پازدەهەم_ خەوتن :

عن البراء بن عازب قال: قال رسول الله (ﷺ) إذا أتيتَ مَضجعكَ، فَتوضَّأْ وضوءَك للصلاةِ، ثُمَّ اضطَجع على شِقِّكَ الأيمنِ وقُل:

**واتە: کاتێك چویە ناو جێگای نووستن، دەست نوێژ بشۆ وەك ئەو دەست نوێژەی بۆ نوێژ دەیشۆی، لە پاشان لەسەر لای راست پاڵ بدەوەو بڵێ:** (أللهم أسلمتُ نفسي إليكَ، وفَوَّضتُ أمري إليكَ، وألْجأتُ ظَهري إليكَ، رهبةً ورغبةً إليك، لامَلْجأَ ولا مَنجا منك إلاّ إليك، آمنتُ بكتابِك الذي انزلتَ، وبنبيِّك الذي أرسلت).

فَإن مُتَّ مُتَّ على الفطرة، فاجْعَلْهُنَّ آخِرَ ما تقول. رواة البخاري(٦٣١١) ومسلم(٢٧١٠).

**واتە: ئەگەر(ئەم زیکرە بکەی و) بمری ئەوە لەسەر ئیسلام دەمری، وە ئەم زیکرەش لە کۆتایی زیکرەکانت دا بکە.**

---

(١) صفة الصلاة للألباني، ١٦٧.

**سوود**:

**(صحيح)ی بخاری(٧٥٦٣) فەرموودەیە بە دووبارەوە بۆ نمونە ئەم فەرموودەیە لە(صحيح)ی بخاری پێنج جار دووبارە بویتەوە هەمووشیان لە بەرراء ریوایەت کراوە، وە هەموو فەرموودەکانیش بە یەك شێوە نەهاتوون، ئەمەش ژمارەی فەرموودەکانە لە بخاری(٢٤٧ – ٦٣١١ – ٦٣١٣ – ٦٣١٥ – ٧٤٨٨).**

## زیکری شازدەهەم- خەوتن :

عن أنس أنَّ رسولَ الله (ﷺ) كان إذا أَوى إلى فراشِهِ قال: (الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا وكفانا وآوانا، فكم مِمَّن لا كافيَ لهُ ولا مُئْوِيَ)[1].

## مانای هەندێك لە ووشەكان

١- وكفانا : أي أغنانا وقَنعَّنا.

٢- ولا مُئْوِيَ: قيل لا وطن له ولا سكن يأوي إليه.

٣- وآوانا : أي ردّنا إلى مأوى لنا، ولم يجعلنا منتشرين كالبهائم (والمأوى) المنزل (المأوى) كل مكتن يأوي إليه شيء ليلاً أو نهاراً وقد (أوى) إلى منزله (يأوي) (آواه) غيره.

مانای فەرموودەکە:

**ئەنەس رەزای خوای لیٚ بێت دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك بچووبا ناو جێگای نووستن دەیفەرموو:** (الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا وكفانا وآوانا، فكم مَّمن لا كافيَ لهُ ولا مُئْوِيَ) .

---

(١) رواه مسلم (٢٧١٥).

واتە: هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەیە، ئەوەی کە خواردن و خواردنەوەی پێداین، وە بێ پێویستی کردین، وە گێڕاندینیەوە بۆ ماڵ و حاڵمان، چەندەها کەس هەیە بەشی پێویستیان نییە، وە جێ و ڕێیەکیان نییە بچنە ناویەوە*

## زیکری حەڤدەهەم-خەوتن :

### زیکر لە کاتی لە خەو ڕاچڵەکین و ترسان :

عن عمْرِو بن شُعيب عن أبيه عن جدّه. أنّ رسولَ الله (ﷺ) قال: إذا فَزِعَ أحدُكم في النّوم فَلْيقُلْ: (أعوذُ بكلماتِ الله التّامّات من غضبهِ وعِقابهِ وشرّ عبادهِ ومن همزات الشّياطين وأنْ يحضُرون . فإنها لن تضُرّهُ)[1].

واتە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە لە خەودا ترسێکی لەناکاو ڕووی تێ کرد با بڵێ (أعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه وشرّ عباده ومن همزات الشياطين وأنْ يحضُرون) واتە: پەنا دەگرم و خۆم دەپارێزم بە ووشە تەواوەکانی خوا لە تووڕەیی ئەو و لە سزای ئەو، وە لە خراپەی بەندەکانی، وە لە وەسوەسەی شەیتانەکان و لەوەی کە ئامادە بن لەلام*

**سوود**: ١- بكلمات الله التامات: بە ووشە تەواوەکانی خوا، واتە: قورئان کە هیچ ناتەواویەکی تیادا نییە.

٢- عثيمين دەڵێ: (الفزع) الخوف المفاجيء، واتە: ترسێکی لەناکاو، وە دەڵێ (والخوف المستمر لا يُسمى فزعاً) یانی: ترسێکی بەردەوام پێی ناگوترێ (فزع).

٣- خۆ پاراستن بە قورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان مەخلوق نییە، دەنا خۆی پێ نەدەپاراسترا.

---

(١) حسن، رواه الترمذي (٣٥٢٨).

## زیکری بەخەبەر هاتن لە شەودا

١- عن عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ تَعَارَّ مِنْ اللَّيْلِ فَقَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ ثُمَّ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي أَوْ قَالَ ثُمَّ دَعَا اسْتُجِيب لَهُ فَإِنْ عَزَمَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى قُبِلَتْ صَلَاتُه[1] .

**واتە: هەر یەکێك شەو بەخەبەر هات گوتی:** (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) **لە پاشان گوتی: (پەروەردگارم لێم خۆش بە) یا گوتی: لەپاشان پاڕایەوە پاڕانەوەکەی وەڵام دەدرێتەوە، جا ئەگەر دەست نوێژی گرت لەپاشان نوێژی کرد، نوێژەکەی قەبوڵ دەکرێت.**

### سوود:

**ئیمام نەوەوی -رەحمەتی خوای لێ بێت- ئەم فەرمودەیە لە کیتابی (الأذکار) لە ژێر ئەم ناو نیشانە دەهێنێ (باب ما یقولُ إذا استیقظ في اللیل وأراد النوم بعده) واتە: چی دەڵێ کاتێك لە شەو بەخەبەر هات و ویستی وابوو بخەوێتەوە لە دوای بەخەبەر هاتنەکە***

**کەواتە ئەم زیکرە جیایە لەگەڵ زیکری لەخەو هەستان کە مەبەستی نییە بخەوێتەوە***

---

(١) رواه البخاري (١١٥٤) والترمذي (٣٤١٤) وابن ماجة (٣٨٧٨).

# زیکرەکانی شەو

## قورئان خوێندن لە شەودا

### یەکەم : خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة)

عن ابي مسعودٍ الْبدْريّ عن النبيّ(ﷺ) قال: منْ قرأ بالآيتين مِن آخر سورةِ البقرةِ في ليلةٍ كفتاهُ. رواه البخاري(٥٠٠٩) ومسلم(٨٠٨).

**واتە: هەر یەکێك لە شەوێکدا دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(البقره) بخوێنێ بەسیەتی( لە قیام اللیل)وە گوتراویشە بەسیەتی بۆ پارێزران لە شەڕو زیانی ئەم شەوە.**

### سوود:

**١-شەو کاتەکەی دەست پێ دەکات لە بانگی ئێوارە تا بانگی بەیانی.**

**٢- دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(بقرة) دەست پێ دەکات لە﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ ﴾ تا کۆتایی سورەتەکە.**

### دووەم : خوێندنی (زمر) و (إسراء) و (مُسَبِّحات)

١- عن عائشة قالت: (كان رسول الله (ﷺ) لا ينام حتى يقرأ (الزُمر) و (بني اسرائيل) (أي الإسراء) [1]،

**واتە: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نەدەخەوت تا سورەتی (زمر) و (اسراء) ی نەخوێندبایەوە.**

---

(١) سلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني، (٦٤١).

٢- عن العرباض بن سارية:أنَّ النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) كان لا ينامُ حتى يَقْرأَ الْمُسَبِّحاتِ . ويقولُ :فيها آيةٌ خيرٌ مِن ألْفِ آية . حسن:رواه الترمذي(٣٤٠٦)

**واتــه :عیربـازی کوری ساریه دەڵێ:پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەدەخەوت تا (مُسَبِّحات)ی نەخوێنبایە , وە دەیفەرموو: (مسبحات) ئایەتەکی تیادایە باشترە لە هەزار ئایەت .**

**سوود** :

(مسبحات):**ئەو سورەتانەن کە بە (سَبِّح) یا (سَبَّحَ) یا (يُسَبِّحُ) دەست پێ دەکەن کە ئەم سورەتانەن** : (الحديد –الحشر– الصف– الجمعة – التغابن الأعلى)

## سێیەم : خوێندنی (١٠) ئایەت لە شەودا

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه و سلم : ( مَن قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ فِي لَيلَةٍ لَم يُكتَبْ مِنَ الغَافِلِينَ ) رواه الحاكم في المستدرك (٧٤٢/١) وقال : هذا حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه ، وصححه الألباني في صحيح الترغيب (٨١/٢)

**واتە: هەر یەکێك (١٠) ئایەت بخوێنێ لە شەوێکدا لە بێئاگایاندا نانووسرێ.**

## **چوارەم : خوێندنی (١٠٠) ئایەت لە شەوێکدا**

عن تميم الداريّ قال: قال رسول الله (ﷺ) (مَنْ قرأ بِمائةِ آيةٍ في ليلةٍ كُتِبَ له قنوت(١)،ليلةٍ)(٢)

**واتە: هەر یەکێك (١٠٠) ئایەت لە شەوێکدا بخوێنێ، تاعەت و عیبادەتی شەوێکی بۆ دەنووسرێ.**

## **پێنجەم : خوێندنی (١٠) ئایەت یا (١٠٠) یا (١٠٠٠) لە شەونوێژ**

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ : عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ : " مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ ، وَمَنْ قَامَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ ، وَمَنْ قَرَأَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُقَنْطِرِينَ " ) صحيح :رواه ابوداود(١٣٩٨)

**واتە: هەر یەکێك شەونوێژ بکات (١٠) ئایەتی تیادا بخوێنێ لە بێئاگایان نانووسرێ، وە هەر یەکێك شەو نوێژ بکات (١٠٠) ئایەتی تیادا بخوێنێ لە گوێڕایەڵان دەنووسرێ، وە هەر یەکێك شەو نوێژ بکات (١٠٠٠) ئایەتی تیادا بخوێنێ (کە بە خوێندنی جوزئی (تبارك) جوزئی (عم)ە، ئەمە بەدەست دێت) پاداشتێکی گەورەی پێ دەدرێ.**

(المُقَنطِرين): **خاوەنانی ماڵی زۆر، مەبەست لێرەدا واتە پاداشتێکی گەورەی دەدرێتەوە.**

---

(١) قنوت: أصله (الطاعة) واته: گویرایەلی.

(٢) رواه الإمام أحمد في المسند (١٦٥١٠) وصححه الألباني في صحيحه (٦٤٤).

## شەشەم : خوێندنی سورەتی (ملك) و (سجدة)

١- عن جابر (رضي الله عنه) أن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) كان لاينامُ حتى يَقرأَ [الم تنزيل] و ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾ صحيح رواه الترمذي (٢٨٩٢).

**واتە: جابر (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەدەخەوت تاوەکو سورەتی (سجده) و (مُلك)ی نەخوێندبایەوە.**

٢-عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: من قرأ ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾ كُلَّ ليلةٍ منَعَهُ الله عز وجل بِها مِن عذابِ الْقَبرِ وكنّا في عهْدِ رسولِ الله نُسَمّيها المانعة) حسن: رواه النسائي واللفظ له والحاكم وقال صحيح الأسناد, انظر صحيح الترغيب للالباني (١٥٨٩)

**واتە: (عبدالله)ی کوڕی مسعود (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هەریەکێك هەموو شەوێ ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾ بخوێنێ، خودا بەهۆی خوێندنی مەنعی دەکات لەسزای ناو گۆڕ , وە ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر ئەم سورەتەمان بە (المانعه ) ناو دەبرد (واتە رێگر لە عەزابی قەبر)**

**سوود : ناکرێ (ابن مسعود) ئەم قسەیە لە خۆیەوە بکات**

**٣- عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله (ﷺ):**

**سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر.** صحيح: انظر (صحيح الجامع - ٣٦٤٣).

**واتە: خوێندنی سورەتی ( تبارك) رێگرە لە سزای قەبر.**

٤- عن أبي هريرة، عن النبي (ﷺ)، قال: إنَّ سورةً مِن القرآن ثلاثون آيةً شَفَعَتْ لِرجلٍ حتى غُفِر له، وهي سورةُ تبارك الذي بيده الملك.
حسن : رواه أبو داود (١٤٠٠) والترمذي (٢٨٩١).

واته: بێ گومـان سـورەتێك لـەقورئان دا سـی ئایەتـە تكـای كـرد بۆ پیاوێك تاوەكو لێی بوردرا، ئەم سـورەتەش سـورەتی ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾

## كاتی خوێندنی سورەتی (الملك) لە شەودا

خوێندنی ئـەم سـورەتە لـە شـەودا كاتەكـەی دەسـت پـێ دەكـات لـە بانگی مەغریب تا بانگی بەیانی بەلاّم ئەگـەر پێشـی نووسـتن بخوێنـدرێ باشترە.

جا ئومێد وایە هەر كەسێك ئەم سورەتە هەموو شەوێ بخوێنێ خـوای گەورە دەربازی بكات لە عەزابی قەبر.

جـا پـێم خـۆش بـوو لەبـەر ئـەوەی هـەموو شـەوێ ئـەم سـورەتە دەخوێندرێ , تەفسیرەكەی بە كورتی بنووسم.

# تەفسیری سورەتی (ملك)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾(1)

**مانای ئایەتەکە: بەرزو گەورەیە ئەو زاتەی کە هەرچی دەسەلآت و پادشایی هەیە (لە دونیاو لە دوارۆژدا) بەدەست ئەوە، وە ئەو خاوەن تواناو دەسەلآتە بەسەر هەموو شتێکدا.**

**مانای وشەکان:** (تَبَـٰرَكَ) : تعاظم وتعالى: **بەرزو گەورەیە.** ٱلْمُلْكُ : **دەسەلآت**

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾

**مانای ئایەتەکە: ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی درووست کردووە تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە، وە هەر ئەوە زاڵ و لێبوردە.**

**مانای وشەکان:** لِيَبْلُوَكُمْ : **ليختبركم، تا تاقیتان بکاتەوە.** ٱلْعَزِيزُ : **سیغەی موبالەغەیە واتە زۆر زاڵ.** ٱلْغَفُورُ : **سیغەی موبالەغەیە واتە زۆر لێبوردە.**

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَـٰنِ مِن تَفَـٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾﴾

---

(١) تفسير الطبري.

**واتـه:** ئەو زاتەی کە حەوت ئاسمـانی درووسـت کـردووە یـەك لەسـەر یەك، تۆ هیچ نا ڕێکییەك لە دروست کردنی خوای میهرەباندا نابینی، جـا جارێکی دیکە چاو بگێڕە ئایا هیچ ناتەواوییەك دەبینی.

**مانای وشەکان:** طِبَاقًا: کۆی (طبق) یا (طبقة) یە، واتـە: یـەك لەسـەر یەك بێ پێکەوە نووسـان (مـن غـیر مماسـه ). تَفَٰوُتٍ: نـاڕێکی. فُطُورٍ: صدوع وشقوق، شەق بوون و دوو لەت بوون.

﴿ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ٤ ﴾

**واتـه:** لەپاشـان چـەندین جـار چـاوت بگێـڕە (پێیـدا) ، (سـەرەنجام) چاوت بە زەبوونی دەگەڕێتەوە بۆ لات، وە ئەو (چاوەت) ماندووە.

**مانـای وشـەکان:** كَرَّتَيۡنِ : لێـرەدا واتــە چــەندین جــار . يَنقَلِبۡ: دەگەڕێتەوە. خَاسِئٗا: ذليلاً، ریسوا — زەلیل. حَسِيرٞ: كَليل، ماندوو.

﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ٥ ﴾

**واته:** بێ گومان ئاسمـانی دونیامـان ڕازاندۆتـەوە بـە چـرای زۆر ، وە گێڕاومانن بـە ڕەجمـی شـەیتانەکان، وە ئامادەمـان کـردووە بۆیـان (لـە دواڕۆژدا) سزای ئاگری هەڵگیرساو.

**مانـای وشـەکان:** زَيَّنَّا : ڕازاندوومانەتـەوە. ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا : نـزیکترین ئاسمان لە زەوی , (الدنیا): واته: (القُربـی) یـانی: نـزیکترین. بِمَصَٰبِيحَ :

به ئەستێرەکان، بِمَصَٰبِيحَ : واتە بە چراکان، بە چرای زۆر، کە مەبەست پێی ئەستێرەکانە.

لێکۆڵینەوە: قەتادە دەڵێ: (خلق الله النجوم لثلاث، زينة للسماء، ورجوما للشياطين، وعلامات يهتدي بها في البر والبحر) واتە: خوا ئەستێرەی درووست کردووە بۆ سێ شت: بۆ رازاندنەوەی ئاسمانەکان، بۆ رەجم کردنی شەیتانەکان، (ئەو شەیتانانەی کە بەرز دەبنەوە بۆ لای ئاسمان، دەیانەوێ گوێ بگرن لە فریشتە بۆ ئەوەی هەواڵ و دەنگ و باسێکیان لێ ببیستن بە نهێنی)، وە بۆ ئەوەی ببنە نیشانە بۆ دۆزینەوەی رێگا لەکاتی شەودا لە دەریاو لە ووشکانیدا.

﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٦ ﴾ واتە: وە بۆ ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون بە پەروەردگاریان سزایان دۆزەخە کە خراپترین سەرنجامە.

مانای وشەکان: كَفَرُواْ : کفریان کرد، بێ بڕوا بوون .ٱلۡمَصِيرُ : سەرەنجام، ئەنجام و کۆتایی.

﴿ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ٧ ﴾

واتە: کاتێك کە فڕێ درانە ناویەوە دەنگێکی زۆر ناسازو ناخۆشی لێ دەبیستن لە کاتێکدا دەکوڵێ.

**ماناي وشەكان:** إِذَآ : كاتێك. ـ أُلۡقُواْ : فڕێ دران، هاوێشتران. ـ شَهِيقًا : صوت منكر كصوت الحمار، دەنگێكی ناخۆش وەك دەنگی گوێ درێژ.

تَفُورُ : تغلی، دەكوڵێ.

﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ٨ ﴾

**واتە:** نزیكە (جەهەنەم) لە تورەییدا پارچە پارچە بێت، هەرچەند دەستەو تاقمێك فڕێ بدرێنە ناویەوە، سەرپەرشتیاری دۆزەخ پرسیاریان لێ دەكەن ئایا (پێغەمبەرێكی) ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە (لە دونیادا).

**ماناي وشەكان:** تَكَادُ : نزیكە. ـ تَكَادُ تَمَيَّزُ : تكاد تتقطع، نزیكە لەت لەت بێت، نزیكە پارە پارە بێت. ٱلۡغَيۡظِ : رق، تورەیی. أُلۡقِيَ : فڕێ درا. خَزَنَتُهَآ : سەرپەرشتیاری دۆزەخ، چاودێرانی جەهەنەم. نَذِيرٞ : ترسێنەر.

﴿ قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ٩ ﴾

**واتە:** گوتیان بەڵێ بەڕاستی (پێغەمبەرێكی) ترسێنەرمان بۆ هات بەلام بەدرۆزنمان دەزانی، وە گوتمان خودا هیچ شتێكی نەناردۆتە خوارەوە، ئێوە بەس لە سەرلێشێواویەكی گەورەدان.

**ماناى وشەكان:** بَلَىٰ : نعم، بەڵێ. جَآءَنَا : هاتە لامان. نَذِيرٌ : ترسێنەر. فَكَذَّبْنَا : قسەكانیمان بە درۆ زانی. إِنْ أَنتُمْ إِلَّا : ما أنتم إلاّ، نین ئێوە مەگەر. ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ : گومڕاییەكی گەورە، سەرلێشێواویەكی گەورە.

﴿وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾﴾

**واتە: وە گوتیان ئەگەر ئێمە بیستبامان یان تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبووین(١٠) جا دانیان نا بە گوناحی خۆیاندا، دووری لە میهرەبانی خوا بۆ هاوڕێیانی دۆزەخ(١١).**

**ماناى وشەكان:**

فَٱعْتَرَفُوا۟ : جا دانیان نا، جا ئیعترافیان كرد. فَسُحْقًا : فبعداً، دووری. ٱلسَّعِيرِ: ئاگری بڵێسەدار.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾﴾

**واتە: بێ گومان ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەترسن بە نهێنی ، لێخۆش بوون و پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.**

**ماناى وشەكان:** يَخْشَوْنَ : دەترسن. بِٱلْغَيْبِ : بە پەنهانی واتە: (فی غیبتهم عن أعین الناس)، یانی لەوكاتەی كە خەڵك نایان بینن (تفسیر

جلالـين) ابـن عبـاس دەڵـێ: بِٱلْغَيْبِ : وإن لم يريـوه، يـانی: بـێ ئـەوەی خودایان دیبێت. مَّغْفِرَةٌ : لێخۆش بوون.

﴿وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝١٣﴾

واتە: ئێوە بە پەنهانی قسە بکەن یان بە ئاشکرا (بۆ خـوا یەکسـانەو وەك یـەك دەیـان بیسـتێ و پێیـان ئاگـادارە) بەڕاسـتی ئـەو زۆر زانایـە بەوەی کە لەناو دڵەکاندایە.

**مانای وشەکان:** وَأَسِرُّواْ : ئەمە بە ڕواڵەت ئـەمرە بـەڵام لـە مـەعنادا خەبەرە، واتە: بیشارنەوە. إِنَّهُۥ : بێ گومان ئەو (خوا). عَلِيمُۢ : ناوێکە لـە ناوەکانی خوای گەورە، سیغەی موبالەغەیـە واتـە: زۆر زانـا. بِذَاتِ : بـە خودی. ٱلصُّدُورِ : کۆی (صدر)ە، واتە: سینە، کە مەبەست پێی دڵە.

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ۝١٤﴾

**واتە:** ئایا ئەوەی کە خـەڵکی درووسـت کـردووە ئاگـای لـە نهێنییـان نییە لە کاتێکدا کە ئەو زۆر ووردبین و زۆر شارەزایە.

**مانای وشەکان:** ٱللَّطِيفُ : ناوی خودایە، سـیغەی موبالەغەیـە، وات: زۆر وورد بـین. ٱلْخَبِيرُ : نـاوی خوایـە، سـیغەی موبالەغەیـە، واتـە: زۆر شارەزا.

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾

**واتە:** ئەو (خودا) ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ ئێوە رام کردووە، جا بە ئەم لاو ئەو لاو شانەو شانیدا بڕۆن، وە لە رزق و رۆزی خوا بخۆن، وە هەر بۆلای ئەوە گەڕانەوە.

**مانای وشەکان:** ذَلُولًا : رام ، ژێر دەسەلات ، زەلیل و مل کەچ ، لە جلالین دەڵێ (سهلة للمشي فيها) ئاسان بۆ رۆیشتن بەناویدا. مَنَاكِبِهَا : کۆی (مَنكب)ە، واتە: شان مَنَاكِبِهَا : واتە: (جوانبها) یانی: تەنیشتەکانی. ٱلنُّشُورُ : گەڕانەوە.

﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ ﴾

واتە: ئایە ئێوە ئەمینن لەوەی (لەو خوایەی) کە لەسەر ئاسمانەکانە کە بتانباتە خوارەوە بەناخی زەویدا، لەکاتێکدا کە زەوی بکەوێتە شلەژان و جوولەو حەرەکە.

**مانای وشەکان:** ءَأَمِنتُم : ئایا ئەمینن، ئایا دڵنیان، ئایا بێ ترسن. فِى ٱلسَّمَآءِ : لەسەرو (في العلو)، لەسەر ئاسمانەکان، (في) لێرەدا واتە: (علی) لەسەر. يَخْسِفَ : (الخسف) رۆچوون. تَمُورُ : تضطرب وتتحرك، دەشلەژێت و دەجوولێ.

﴿ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًاۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ ﴾

**واته:** **یان دڵنیان لەو زاتەی کە لە سەروەیە (لەسەر ئاسمانەکان) کە بای توندتان بنێرێتە سەر بە وردە زیخەوە، ئەوجا ئەو کاتە دەزانن چۆنە ترساندنی من بۆتان.**

**مانای وشەکان:** فِي ٱلسَّمَآءِ : **فی العلو، لەسەرەوە.** يُرْسِلَ : **بنێرێ.** حَاصِبًا : **الحاصب:** الريح الشديدة تثير الحصباء، **بایەکی توند وردە زیخ بجولێنێ (مختار الصحاح)** حَاصِبًا : ريح فيها حصباء، **بایەك وردە زیخی تیادابێت.** نَذِيرِ : **ڕاناوی (ی) لە کۆتاییەکەی قرتێندراو (**محذوف**)ە، واتە: هەڕەشەی من.**

﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ ﴾

**واتە:** **بەڕاستی ئەوانەی کە لە پێش ئەماندا بوون (پێش بت پەرستەکان) (پێغەمبەرانیان) بەدرۆزن دانا، جا چۆن بوو تۆڵە سەندنی ئێمە( لەوان واتە: توند بوو).**

**مانای وشە:** نَكِيرِ : **بەمانای (**إنكار**) و ڕاناوی (ی) لە کۆتاییەکەیدا قرتێنراو (**محذوف**)ە، (**نکیری**) واتە (**عقوبتي**) تۆڵەم،** (ذكر ابن مجاهد أن ورشاً روى عن نافع (نكيري).

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ ﴾

**واتـه:** ئایـه تەماشـای باڵنـدەیان نـەكردووه لەسـەریانەوه بـه بـاڵ كراوەیی و هێنانەوەیەك ، رای نەگرتوون بەو ئاسمانەوه خوای میهرەبان نەبێت ، بەڕاستی ئەو بەهەموو شتێك بینایه.

**مانـای وشـەكان:** صَٰٓفَّٰتٍ : پـان كـەرەوانی بـاڵان. وَيَقْبِضْنَ : باڵەكانیان دەلكێنن بەخۆیانەوە، باڵـەكانیان دەهێننـەوه یـەك. ٱلرَّحْمَٰنُ : ناوی خوایه صیغەی موبالەغەیه، واته زۆر به رەحم. بَصِيرٌ : ناوی خوایه , صیغەی موبالەغەیه، واته: زۆر بینەر (هەموو شتیّ دەبینیّ).

﴿ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ ﴾

**واتـه:** ئایه كێیه ئەو كەسەی كە لەشكری ئێوەیه، یارمەتیتان دەدەن جگە له خوای میهرەبان، بیّ بڕوایان هەر له فریو خواردنان.

**مانای وشەكان:** جُندٌ : سوپا ، لەشكر. ٱلرَّحْمَٰنِ :ناوێكه له ناوەكانی خوا، سیغەی موبالەغەیه، واته زۆر بەزەیی. إِنِ : حرف نفی بمعنی (مـا)، حەرفی نەفیه مانای (ما) دەدات. غُرُورٍ : هەڵەخەڵەتان، فریو خواردن.

﴿ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ ﴾

**واتـه:** یان ئەوە كێیە ئەو كەسەی كە ڕۆزیتان دەدات ئەگەر خـوا ڕزق و ڕۆزی خـۆی گرتـەوە لێتـان (كـەس نییـە) بـەڵكو درێـژەیان دا بـە سەركێشی و دووركەوتنەوە (لەحەق).

**مانای وشەكان:** إِنۡ أَمۡسَكَ : ئەگەر گرتیەوە (بیبڕێ و نەیدا). لَّجُّواْ : تمادَوا واستمروا، درێژەیاندا. عُتُوّٖ : طغیان، سەركێشی ، نا فەرمانی. وَنُفُورٍ : بُعدِ عن الحق، دووری لە حەق.

﴿ أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ أَمَّن يَمۡشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٢﴾ ﴾

واتە: ئایە ئەو كەسەی كە دەمەو ڕوو كەوتووەو بەو حاڵەتەوە بەڕێـدا دەڕوات باشتر ڕێگـا دەزانێـت یـان ئـەو كەسـەی كـە بـە ڕێـك و پێكـی و ڕاوەستاوی بەسەر ڕێگایەكی ڕاستدا بـڕوات ( نموونـەی یەكـەم نموونـەی كەسی كافرە، ئی دووەم نموونەی كەسی بڕواداره).

**مانای وشەكان :** مُكِبًّا : كەوتوو. سَوِيًّا : قیت و قنج. صِرَٰطٖ : ڕێگا.

﴿ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

**واتـه:** (ئەی موحەمەد (ﷺ) ) بڵێ هەر خوایە كە درووستی كـردوون، وە گوێ و چاوو دڵی پێ داون، كەم سوپاس و شوكرانە بژێری دەكەن.

**مانای وشەكان:** أَنشَأَكُمۡ : خلقكم، دروستی كردوون. وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ :كۆی (فؤاد)ە، واتە: دڵ. مَّا : مزيدة.

﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

**واته: بڵێ ئەو زاتێکە ئێوەی لەزەویدا بەدی هێناوە، وە تەنها بۆلای ئەو کۆدەکرێنەوە.**

**مانای وشەکان:** ذَرَأَكُمْ : **وەدیهێناون (ذرأ) خلق ، دروستی کرد.** تُحْشَرُونَ : **تجمعون، کۆدەکرێنەوە، (لە ڕۆژی قیامەت).**

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ ﴾

**واته: (کافرەکان بە ئیماندارەکان) دەڵێن ئەم بەڵێنە کەی دێتەدی (زیندوو کردنەوەو لێپرسینەوە) ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن﴿٢٥﴾ (ئەی موحەمەد) بڵێ زانینی ئەو ڕۆژە هەر لای خوایە، وە من تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام﴿٢٦﴾.**

**مانای وشەکان:** ٱلْوَعْدُ : **بەڵێن (بەڵێنی هاتنی ڕۆژی دوایی).** نَذِيرٌ : **ترسێنەر.**

﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

**واته: ئەوجا کاتێك ئەو وەعدو بەڵێنەیان لە نزیکەوە بینی، ڕەش دەبێت ڕووی ئەوانەی کە بێ بڕوابوون , وە دەووترێ ئەمەیە ئەوەی کە داواتان دەکرد.**

**ماناى وشەكان:** رَأَوْهُ : بينيان (سزايان بينى). زُلْفَةً : قريباً، نزيك (في عرصات القيامة). سِيٓـَٔتْ : اسودت، رەش بوو. وَقِيلَ : دەگوترێ، (قال الخزنة لهم).

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ ﴾

**واتە:** (ئەى موحەمەد بە بێ باوەڕەكان) بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر خوا من و ئەو (موسڵمانان)ەى كە لەگەڵمدان لەناومان ببات يا رەحممان پێ بكات، كێ هەيە بێ بڕواكان بپارێزێت لە سزاى سەخت.

**ماناى وشەكان:** أَرَءَيْتُمْ : أخبروني ، پێم بڵێن. يُجِيرُ : يحفظ ويقى، دەپارێزێ.

﴿ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ ﴾ الملك: ٢٩

**واتە:** بڵێ هەر ئەوە (خواى) زۆر بەرەحم ، باوەڕمان پێ هێناو وە هەر بەو پشتمان بەستووە، جا لەمەولا دەزانن كێ لە گومڕايى و سەرگەردانێكى ئاشكرا دايە.

**ماناى وشەكان:** ٱلرَّحْمَٰنُ :ناوو سيفەتى خوايە، سيغەى موبالەغەيە، واتە: زۆر بە بەزەيى. تَوَكَّلْنَا : پشتمان بەست (التوكل: تفويض الأمور، كار سپاردن).

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾ ﴾

**واته: (پێیان) بڵێ هەواڵم بدەنێ ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆبچێ (بەناخی زەویداو هەڵی بمژێ) ئایە کێ ئاوێکی جاری ئاشکراتان بۆ دەهێنێ.**

**<u>مانای وشەکان :</u>** أَرَءَيْتُمْ : **خەبەرم بدەنێ، هەواڵم بدەنێ، پێم بڵێن.**

غَوْرًا : **بە زەویدا ڕۆچوون.**

مَّعِينٍ : **(ظاهر) ئاشکرا.**

## ٧- زیکری کاتی سەحەر

**سەحەر چ کاتێکە:**

سەحەر (سَحَر) واتە: پێش بەرەبەیان، پێش ئەوەی (فَجْر) بدات و بانگی بەیانی بدات، جا ئایا ئەو ماوەی (سَحَر)ە، چەندە؟ هەندێك دەڵێن (١٥) دەقیقە پێش بەیانی و بانگی بەیانیە ئەگەر بانگەکە بەتەواوی لەکاتی خۆی بدرێ، وە هەندێك دەڵێن (٢٠) دەقیقەیە، (ابن یزید) دەڵێ: (السحر: هو السدس الأخير من الليل) [١]، واتە: سەحەر ئەگەر شەو بکەیتە شەش بەش بەشی کۆتاییەکەیتی.

وە هەندێکی تر دەڵێن: سەحەر ئەگەر شەو بکەیتە سێ بەش بەشی کۆتاییەکەی کاتی سەحەرە.

**یەکەم: داوای لێخۆش بوون کردن لەکاتی سەحەردا:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾﴾ (الذاريات: ١٨) .

واتە: وە لە پێش بەیانیانداو لەکاتی سەحەردا داوای لێخۆش بوونیان دەکرد.

وە دەفەرموێ: ﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾﴾ (آل عمران: ١٧).

واتە: وە ئەوانەی کە داوای لێخۆش بوون دەکەن لەکاتی سەحەردا.

جا تۆش هەوڵ بدە لەکاتی سەحەردا زۆر بڵێ (أسغفر الله) وە زۆر بڵێ: (ربِّ اغْفِر لي ولوالديَّ وللمؤمنين والمؤمنات) وە هەروەها جۆری تری (إستغفار)یش.

---

(١) تفسير الطبري.

## دووەم: دوعاکردن لەکاتی سەحەردا:

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: يَنزلُ رَبُّنا الى السّماء الدُّنيا حينَ يَبقى ثُلثُ الليلِ الآخرُ فيقول: مَن يَدعوني فَأَسْتَجيبَ لَهُ، ومَنْ يَسألُني فَأُعطيه ومن يَستَغْفِرني فَأَغفرَ لَه. رواه البخاري(١١٤٥) ومسلم(٧٥٨).

**واتە: پەروەردگارمان(تبارك وتعالى) هەموو شەوێ دادەبەزی بۆ ئاسمانی دونیا کاتێك كە سێیەكی كۆتایی شەو دەمێنێ دەفەرمووێ: كێ بانگم دەكات تا وەلآمی بدەمەوە , وە كێ داوام لێ دەكات تا پێ ی ببەخشم , وە كێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەكات تاوەكو لێی خۆش بم.**

### سوود:

**ئەوانەی كە لەكاتی سەحەر هەڵدەستنەوە سوودی زۆر دەبینن لەمانە:**

**١- دەكا ئەمانە (قيام الليل) یان كردووە.**

**٢- بەر سێ یەكی شەوی كۆتایی دەكەون بۆ دوعاكردن.**

**٣- بەر كاتی (استغفار كردن) دەكەون ئەگەر (استغفار) بكەن.**

**٤- بە ئاسانی دەتوانن بۆ نوێژی بەیانیش بچن ئەگەر نەخەونەوە.**

## ٨- شەو نوێژو نوێژی ویتر ئەمەش لە باسی شەو نوێژ بخوێنەوە

## زیكری خەو بینین

## چی دەڵێی لەكاتی بینینی خەونی خۆش یا ناخۆش

١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ[١].

**واتە: خەونی راست بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.**

٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِيَ مِنْ اللَّهِ فَلْيَحْمَدْ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِهَا وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنْ الشَّيْطَانِ فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا وَلَا يَذْكُرْهَا لِأَحَدٍ فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ[٢].

**واتە: كاتێك یەكێك لە ئێوە خەونێكی بینی پێی خۆش بوو، ئەوە لەلایەن خواوەیە، جا با سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بكات و بیگێڕێتەوە، وە كاتێكیش خەونێكی بینی غەیری ئەوەبوو لەوانەی كە پێی ناخۆشە، ئەوە لەلایەن شەیتانەوەیە، جا با خۆی بپارێزێ و پەنا بگرێ لە شەڕو زیانی، وە باسیشی نەكا لای هیچ كەسێك، ئەو خەونە زیانی پێ ناگەیەنێت.**

---

(١) رواه البخاري، (٦٩٨٩).

(٢) رواه البخاري، (٦٩٨٥).

## سوود:

١- له برى (وَلْيُحَدِّث بها) له فەرموودەی تردا هاتووه (فلا يُحَدِّثْ به إلا مَن يحب)[1]، واته: با نەیگێڕێتەوه تەنها بۆ ئەوه نەبێت کە خۆشی گەرەکە.

٢- پێغەمبەر (ﷺ) لەم فەرموودەیە دوو شتی باس کردووه بۆ ئەوەی دوور بیت لە زیانی خەونی ناخۆش

أ- خۆی بپارێزێ لە زیانی خەونەکە بلێ: (خوایە خۆم دەپارێزم یا پەنا دەگرم بەتۆ لە زیانی ئەم خەونە.

ب- ئەم خەونە بۆ کەس نەگێڕێتەوە.

٣- عن أبي قتادة قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: الرُّؤيا منَ اللهِ والحُلُمُ من الشيطان فإذا رأى أحَدكُم شيئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عن يسارِهِ ثلاث مرّات ولْيَتَعَوّذ بالله من شَرِّها فإنّها لنْ تَضُرَّهُ. رواه مسلم(٢٢٦١).

## ماناى ووشە:

فلينفث : {النفث}:(شبيه بالنفخ وهو اقل من التفل ) . واتە:(النفث) بە فوو دەچێت و کەمتریشە لە تف ،واتە فوویەك کە نەرمە تفی لەگەڵدا بێت

## ماناى فەرموودەکە:

واتە: خەونی راست لە خواوەیە، خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە، جا هەر کات یەکێکتان شتێکی دیت پێی ناخۆش بوو با سێ جار فووی

---

(١) رواه البخاري ومسلم.

به تف له لای چەپی بکات وە خۆی بپارێزێ بە خوا لـە خراپـەو زیـانی، ئەوە بێ گومان زیانی لێ نادات.

**سوود**:

قەتادە(رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەو ئەسحابەی کە ئەم فـەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) گێراوەتەوە دەڵێ:(إن كنتُ لأرى الرؤيا اثقلُ عليَّ من جبل، فما هو إلا أنْ سمعتُ بهذا الحديث فما أُباليها).

واتە: من پێشتر خەونی وام دەدیت ئەوەندەی چیایەك زیـاتر لەسـەرم قورستر بوو(دەترسام) بەڵام کە گوێم لـەم فەرموودەیـە بـوو ئـیتر گـوێم نەدەدایێ. دەتۆش ئەگەر خەونێکت بینی پێت ناخۆش بوو، وەك ئەوەی لەم فەرموودەدا هاتووە وا بکە هیچ گوێی پێ مەدەو مەترسە.

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :..... (وَالرُّؤْيَا ثَلَاثَةٌ فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى مِنْ اللَّهِ وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنْ الشَّيْطَانِ وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسهُ فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ وَلَا يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ ) [١].

واتە: خەون سێ جۆرە : خەوتی راست ئەوە موژدەیە لەلایـەن خـواوە، وە خـەونێك هەیـە بـۆ غـەمبار کردنـە ئـەوە لەلایـەن شـەیتانەوەیە، وە خەونێکیش هەیە کە مرۆڤ پێشتر بە فکرو خەیاڵیدا هاتووە، جا هەر یەکێك لە ئێوە خەوێکی بینی پێی ناخۆش بوو با هەستێ نوێژ بکـات , وە بـا لای خەڵکیش باسی نەکات .

---

(١) رواه مسلم (٢٢٦٣).

**سوود**:

١- پێغەمبەر (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا خەون دابەش دەكات بۆ سێ جۆر:

٢- لەم فەرموودەیە شتێكی نوێ بەرچاو دەكەوێ ئەویش ئەوەیە ئەگەر خەونی ناخۆشی بینی هەستێ نوێژی سوننەت بكات.

٣- ئینسان واباشترە ئەگەر خەونی ناخۆشی بینی هەموو ئەوانە بكات كە لە فەرموودەكاندا هاتووە.

٥- عَنْ جَابِرٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ : (إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ ثَلَاثًا وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ) (١).

واتە: هەر كاتێك یەكێك لە ئێوە خەونێكی بینی پێی ناخۆش بوو با سێ جار تف بكات بەلای چەپیدا، وە سێ جار خۆی بپارێزێ بەخوا لە شەیتان، وە با وەرگەڕێ لەسەر ئەو تەنیشتەی كە لەسەری بووە.

**سوود**:لەم فەرموودەیە شتێكی نوێ دەبینرێ ئەویش وەرگەڕانە سەر ئەو تەنیشتەی كە لەسەری خەوتووە، لەكاتی بینینی خەونی ناخۆش .

٦- عن جَابِرٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ لِأَعْرَابِيٍّ جَاءَهُ فَقَالَ إِنِّي حَلَمْتُ أَنَّ رَأْسِي قُطِعَ فَأَنَا أَتَّبِعُهُ فَزَجَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ لَا تُخْبِرْ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِكَ فِي الْمَنَامِ(٢).

---

(١) رواه مسلم (٢٢٦٢).

(٢) رواه مسلم (٢٢٦٨).

واتـه: جـابر دەڵـێ: عارەبـەكی دەشـتەكی هاتـە لای پێغەمبـەر (ﷺ) گـوتی: لـە خەونمـدا بینـیم سـەرم بڕدرابـوو وە منـیش بـەدوای دەكـەوتم، پێغەمبـەر (ﷺ) تێـی خوڕیـەوە فـەرمووی ئـەوە مـەگێڕەوە كـە شـەیتان گەمەی پێ كردووی لە خەویدا.

**سوود**: (ابن الجوزی) دەڵێ: (الرُّؤيا) وە (الحُلْمُ) هەردووك یـەكن واتـە: خەون، بەڵام هەندێك خـەونی باش بـە (الرؤيا) نـاو دەبـەن ، وە خـەونی خراپیشی بە (الحُلْمُ) ناو دەبەن .

## گێڕانەوەی خەون بە درۆ

١- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : (مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلْمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَلَنْ يَفْعَلَ) [1].

واتە: هەر یەكێك خەونێك بگێڕێتەوە كە نەیبینیوە، داوای لێ دەكرێت كە دوو دەنكە جۆ لێك گرێ بدات و ناشتوانێ.

**سوود**: هەروەكو باسمان كـرد خـەونی بـاش بەشـێكە لـە چـل و شـەش بەشی پێغەمبەرایەتی , كەواتە كە یەكێك دەڵێ خەونم بینیوە نەشـی بینیـوە ئـەو كەسـە دەڵێ: خـوا بەشـێكی پێغەمبەرایـەتی پـێ نیشـان داوم كەچـیش وانییە، جا یەكێك درۆ بە خوا هەڵبەستێ گەورەترە لەوەی درۆ بـە دروسـت كراوان یا بە نەفسی خۆی هەڵبەستێ. (حلم) واتە: (رأى) یانی: بینی، بـەڵام (تَحَلَّم) واتە: (إذا ادّعى الرؤيا كاذباً) یانی: ئەگەر بڵێ خەونم بینیوە بە درۆ.

---

(١) رواه البخاري (٧٠٤٢) والترمذي (٢٢٨٣).

# ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا دەیبینێ

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :(مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي )[1].

**واتە: هەر یەکێك من لە خەودا ببینێ ئەوە بێ گومان منی بینیوە، چونکە بێ گومان شەیتان ناتوانێ خۆی بە من بچوێنێ.**

٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : ( تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي وَمَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ فِي صُورَتِي وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ)[2].

**واتە: ناوتان بەناوی من بنێن، بەڵام بە کونیەم ناو لە خۆتان مەنێن وەم (أبو القاسم) وە هەر یەکێك من لە خەودا ببینێ ئەوە بە تەئکید منی بینیوە، چونکە بێ گومان شەیتان ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر وێنەی من، وە هەر یەکێك بە ئەنقەست درۆیەك بەزاری مندا هەڵبەستێ با شوێنەك لە ئاگر بۆ خۆی ئامادە بکات.**

**سوود**: **(قال ابن سيرين إذا رآهُ في صورته)**[3].

**واتە: (ابن سیرین) دەڵێ: ئەوەی کە پێغەمبەر لەسەر وێنەی خۆی لە خەودا دەبینێ، وەك ئەوەی لە وەسفی پێغەمبەردا هاتووە لە سووننەتدا (نەك ئەوەی بە شێوەیەکیتر دەیبینێ)**

---

(١) رواه مسلم (٢٢٦٦).

(٢) رواه البخاري (١١٠).

(٣) رواه البخاري (٦٩٩٣).

# التوبه والإستغفار

## ماناى (التوبة) وه (الإستغفار)

(التوبة) له زمانه‌وانيدا واته (الرجوع) و (الإنابة) يانى : گه‌ڕانه‌وه.

به‌لاَم ماناى (التوبة)، له رووى شه‌رعيه‌وه بريتيه له په‌شيمان بوونه‌وه‌و واز هێنـان لـه گونـاح و بريـار دان بـه‌وه‌ى كـه جـارێكى تـر گونـاح نه‌كه‌يته‌وه.به‌لاَم (الإستغفار) واته: داواى لێخۆش بوون كردن له خـوا، وه (إستغفار) ده‌بێته ته‌وبه ئه‌گه‌ر ماناو مه‌رجه‌كانى ته‌وبه‌ى تيادا كۆببێته‌وه وه موسـڵمان ده‌گـونجێ داواى لێخـۆش بـوون (إسـتغفار) بكـات لـه خـوا له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ى گوناهيشى هه‌ن و ته‌وبه‌ى لێ نه‌كردوون.

## گه‌وره‌يى ته‌وبه‌و (إستغفار)

١- خـوا ده‌فـه‌رموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ١٩ ﴾ (محمد).

واته: وه بزانه كه بێ گومان هيچ په‌رستراوێكى به‌ڕاستى نييـه بێجگـه لـه خـوا، وه داواى لێبـوردن بكـه بـۆ گونـاحى خـۆت، وه بـۆ (گونـاحى) پياوان و ئافره‌انى ئيماندار، وه خوا ده‌زانێ به جم و جۆڵتـان (لـه ڕۆژدا) و ئارام گرتننتان (له شه‌ودا).

### سوود:

أ- هه‌موو ئه‌و دواندنانه‌ى (خطاب) انه‌ى كه له‌لايه‌ن خـواوه ئاراسـته‌ى

پێغەمبەر كراون (ﷺ) ئەوە بۆ ئوممەتی پێغەمبەریشە (ﷺ) , مەگەر بەڵگەیەك هەبێت كە تایبەتی بكا بەو.

ب- هەر لە درێژەی ئەم بابەتەدا باسی گەورەیی لێخۆش بوون دەكەین بۆ ئیمانداران.

٢- خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ (آل عمران: ).

واتە: وە ئەوانەی هەر كات كردەوەیەكی زۆر ناشیرین دەكەن، یان ستەمیان لەخۆیان كرد، خوایان دێتەوە بیر، ئەوجا داوای لێخۆش بوون دەكەن بۆ گوناحەكانیان، جا ئایە جگە لە خوا كێ لە گوناحان خۆش دەبێت، وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی كە كردوویانە لەكاتێكدا كە دەزانن (گوناحەو خراپەو زەرەری هەیە).

**سوود**: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾.

**قيل: الفاحشة الكبيرة، وظلم النفس الصغيرة، أو الفاحشة ما يتعدى إلى الغير وظلم النفس ما ليس كذلك.**

واتە: گوتراوە: (الفاحشة) واتە گوناحی گەورە﴿ أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ یانی گوناحی گچكە.

یا (الفاحشة) ئەوەیە كە بەرامبەر بە غەیری خۆیان گوفتارو رەفتارێكی خراپ بكەن ﴿ أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ خراپەیەكە كە تەنها زەرەری بۆ خۆیانە.

٣- خــوا دەفــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ التحريم: ٨

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتـان هێنـاوە بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا بـە گەڕانەوەیەکی یەکجاری , تا پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش ببێ , وە بتـان خاتـە نـاو باخاتێکـەوە کـە جۆگـەی ئـاوی زۆر بـە ژێریـان دا دەڕوات.

**ســوود** : *سُئِلَ عمر عن التوبةِ النّصوح فقال: أنْ يَتوبَ الرَّجُلُ من العمل السَّيء ثم لا يَعود.

واتە: لە ئیمامی عومـەریان پرسـی دەربارەی(التوبـە النَّصـوح) فـەرمووی: ئەوەیە کە پیاو تەوبە لە گوناح بکات و نەگەڕێتەوە سەری جارێکی تر.

٤-عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) أللهُ أفرحُ بتوبَةِ عبْدهِ مِنْ أحَدِكُم سَقَطَ على بَعيرهِ وقَدْ أضَلَّهُ في أرضٍ فلاةٍ. رواه البخاري(٦٣٠٩) ومسلم(٢٧٤٧).

واتە: خودا شادمان ترە بە تۆبەی بەندەی خۆی لە یـەکێکتان کـە لـە بیابانێکدا حوشترەکەی بزر کردووە لەناکاو دەیدۆزێتەوە.

**سوود** :- لـەم فـەرموودە باسـی شـادمانی(فرح) کـراوە بـۆ خـودا، ئێمەش دەڵێین شادمانی(الفرح) سیفەتێکی خودایـە بـەو شـێوەی کـە لـە زاتی ئەو دەوەشێتەوە.

٥-عن أبي عبيدة بن عبدالله عن ابيه قال: قال رسولُ الله(ﷺ): التَّائِبُ مِن الذَّنب كَمَنْ لا ذَنبَ لَهُ. حسن رواه ابن ماجه(٤٢٥٠).

**واته:ئەو کەسەی تەوبە دەکات لەگوناح وەکو کەسێکە کە گوناهی نیە.**

٦- عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ بُسْرٍ يَقُولُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (طُوبَى لِمَنْ وَجَدَ فِي صَحِيفَتِهِ اسْتِغْفَارًا كَثِيرًا)(١).

**واته: بەهەشت بۆ ئەو کەسەی کە داوای لێخۆش بوونێکی زۆر دەبینێ لە کیتابی کردەوەکانی.**

(وقيل : طوبى: شجرة في الجنة) **وە گوتراویشە (طوبى) دارێکە لە بەهەشت.**

## تەوبەو ئیستغفاری پێغەمبەر (ﷺ)

١- عَنْ الْأَغَرِّ الْمُزَنِيِّ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :(إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ)(٢).

**واته: من دڵم دادەپۆشرێ، وە بێ گومان من لە ڕۆژێکدا (١٠٠) جاران داوای لێخۆش بوون دەکەم لە خوا.**

---

(١) صحيح: رواه ابن ماجه (٣٨١٨).

(٢) رواه مسلم (٢٧٠٢) وأبو داود (١٥١٥).

٢-عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يا أيَّها الناسَ توبوا إلى اللهِ فإنّي أتوبُ في اليومِ إليهِ مِائَةَ مَرَّة. رواه مسلم(٤٢).

**واته: ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا چونکە بێگومان من لە ڕۆژێکدا سەد جاران تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەو**

٣-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: سَمِعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: واللهِ إنّي لأَستَغْفِرُ الله وَأتوبُ إليه في اليومِ أكثرَ مِنْ سَبعِينَ مَرَّةً. رواه البخاري (٦٣٠٧).

**واتە: ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیستووە(ﷺ) دەیفەرموو: سوێند بە خوا من لە ڕۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆش بوون و تۆبە دەکەم.**

٤-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: كُنّا نَعُدُّ لرسول الله(ﷺ) في المجلس الواحِدِ مائَةَ مَرَّةٍ: ربِّ اغْفِرْ لي وتُبْ عليَّ إنَّكَ أنت التَوّابُ الرَّحيم. صحيح رواه ابوداود(١٥١٦) والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

**واتە: عبدالله کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمە لە یەک کۆڕدا سەد جارمان دەژمارد لە پێغەمبەری خوا کە دەیفەرموو:( ربِّ اغْفِرْ لي وتُبْ عليَّ إنَّكَ أنت التَوّابُ الرَّحيم) واتە: پەروەردگارم لێم ببوورەو تۆبەم لێ قبول بکە بێگومان بەس تۆی زۆر تۆبە وەرگری میهرەبان.**

٥-عن أبى بردةَ بن أبي موسى، عن ابيه قال: جاء رسول الله (ﷺ) ، ونحن جلوسٌ فقال: ما أَصْبحتُ غداةً قَطُّ الّا اسْتَغْفرتُ الله فيها مِئَةَ مرَّة. حديث صحيح: رواه الطبراني،انظر: صحيح الجامع (٥٥٣٤).

واتە: باوکی بوردە دەڵێ کە باوکی گوتوویەتی : پێغەمبەر (ﷺ) ، هاتە لامان لەکاتێکدا کەئێمە دانیشتبووین فەرمووی: قەت هیچ بەیانیەکم نەکرۆدتەوە ئیللا (١٠٠) جاران داوای لێخۆش بوونم کردووە لەخوا.

## نا ئومێد مەبە لە تەوبە ئەگەر گوناحت زۆر بوو

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الزمر: ).

واتە: (ئەی موحەمەد) بڵێ: ئەی بەندەیانی ئەوتۆم کە زیادە رەوییان کردووە لە تاوان کردن و گوناحی زۆریان خستۆتە سەرشانی خۆیان نائومێد نەبن لە رەحمەتی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناحەکان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە زۆر لێبووردەی زۆر بەزەییە*

٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: لو أخطأتُم حتّى تبلُغ خَطاياكُم السّماءَ ثُمّ تُبْتُم لَتاب عليكم. حسن صحيح رواه ابن ماجه(٤٢٤٨).

واتە: ئەگەر گوناهتان کرد تاوەکو گوناهەکانتان گەیشتە ئاسمان لە پاشان تەوبەتان کرد تەوبەتان لێ وەردەگرێ.

٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ) (١).

**واته: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێوە گوناح نەکەن، خوا ئێوە لادەبا وە کۆمەڵێکی تر دێنێ کە گوناح بکەن، ئەوجا داوای لێبوردن بکەن، خواش لێیان خۆش بێت***

**سوود**:

**ئەم فەرموودەیە مانای هاندان نییە لەسەر گوناح و داوای لێخۆش بوون کردن، نا خوا پێی خۆش نییە بەندەکانی گوناح بکەن، بەڵام خوا پێی خۆشە ئەگەر بەندەیەکی گوناحی کرد داوای لێبوردن بکات و ئەویش لێی خۆش بێت، کەواتە ئەگەر ئینسان گوناحی کرد با بێ ئومێد نەبێت لە رەحمەتی خوا.**

٤- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ :(قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَا ابْنَ آدَمَ , إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ وَلَا أُبَالِي , يَا ابْنَ آدَمَ لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ وَلَا أُبَالِي , يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتَنِي لَا تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً) (٢).

---

(١) رواه مسلم (٢٧٤٩).

(٢) صحيح رواه الترمذي (٣٥٤٠).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: خوا (تبارك وتعالى) دەفەرمووێ: ئەی نەوەی ئادەم بێ گومان تۆ بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە داوات کردووەو ئومێدت بووە بە من (کە لێت خۆش بم) من لە گوناحت خۆش بوویمە لەوەی کە هەت بووە (لە گوناح ئەگەر زۆرو دووبارە کراوەش بێت)، وە گوێم پێ نەداوە، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر گوناحەکانت گەیشتبێتە ئاسمان (یا هەوری ئاسمان) لە پاشان داوای لێخۆش بوونت لێم کردبێ لێت خۆش بوومەو گوێم پێ نەداوە، ئەی نەوەی ئادەم بێ گومان تۆ ئەگەر هاتبی بۆ لای من (لەدوای مردنت) پڕ بە نزیکی زەوی گوناحت لەگەڵ خۆت هێنابێت، لە پاشان کە گەیشتی بەمن هیچ شەریکێکت بۆ بڕیار نەدابووم، منیش نزیکی پڕ بە زەوی لێخۆش بوونت بۆ دێنم.**

٥- عن أبي سعيد الخدري عن النبي (ﷺ) قال: قال إبليس: وَعِزَّتِكَ يَا رَبِّ لَا أَبْرَحُ أُغْوِي عِبَادَكَ مَا دَامَتْ أَرْوَاحُهُمْ فِي أَجْسَادِهِمْ، فَقَالَ الرَّبُّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى :وَعِزَّتِي وَجَلَالِي لَا أَزَالُ أَغْفِرُ لَهُمْ مَا اسْتَغْفَرُونِي(١).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ئیبلیس گوتی: سوێند بە عیزەتی تۆ -ئەی خودایە- من بەردەوام بەندەکانت گومڕا دەکەم تاوەکو ڕۆح لە جەستەیاندا بێت، جا خودا فەرمووی: سوێند بە عیزەت و جەلالم منیش بەردەوام لێیان خۆش دەبم تاوەکو ئەوان داوای لێخۆش بوونم لێبکەن.**

---

(١) صحيح الترغيب للألباني (١٦١٧).

## ڕێگایەك بۆ لێخۆش بوونی گوناح

١- عن أَبُو بَكْرٍ قَالَ سمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ ثُمَّ يُصَلِّي ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلَّا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ )[1].

**واتە: هیچ پیاوێك نییە گوناحێك بكات , لە پاشان هەڵبستێ دەست نوێژ بشوات , لە پاشان دوو ركات نوێژ بكات، لە پاشان داوای لێخۆش بوون بكات لە خوا , ئیللا خوا لە گوناهی خۆش دەبێت***

## گەورەیی داوای لێخۆش بوون كردن بۆ ئیمانداران

١- **خـوا لەسـەر زمـانی نـوح پێغەمبـەر دەفـەرمووێ:** ﴿ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴿٢٨﴾ ﴾ ( نوح ).

**واتە: ئەی پەروەردگارم لە خۆم و دایكم و باوكم خۆش بە، وە لەوەش كە دێتە ماڵم بە بڕواداری، وە لە هەموو پیاوان و ژنانی ئیماندار، وە زیاد مەكە بۆ ستەمكاران تیاچوون و لەناو چوون نەبێ.**

٢- **وە خوا دەفەرمووێ لەسەر زمانی ئیبراهیم پێغەمبـەر :** ﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ ﴾ (إبراهيم).

**واتە: ئەی پەروەردگارمان لە من و دایكم و باوكم و هەموو ئیمانداران خـۆش بە لەو ڕۆژەدا كە حیساب و لێپرسینەوە دەكرێ و بەرپا ئەبێ .**

---

(١) حسن رواه الترمذي (٤٠٦) وابن ماجة (١٣٩٥).

٣- وه خـوا دهفـهرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾ (الحشر: ).

**واته: وه ئهوانهش له دوای ئهوانهوه هاتوون (واته لهدوای كۆچكهران و یارمهتیدهران (المهاجرون والأنصار) دهڵێن: ئـهی پـهروهردگارمان لێمـان خۆش به، وه لهو برایانهشمان كه پێشمان كـهوتوون لـه بڕواهێنانـدا، وه هـیچ رق و كینیهیـهك مهخـهره دڵمانـهوه بهرامبـهر بهوانـهی ئیمانیـان هێناوه، ئهی پهروهردگاری ئێمه بهراستی ههر تۆی زۆر میهرهبـان و زۆر به رهحم.**

**سوود**: ئـهم دوعایـه زۆر گرنگـه هـهوڵ بـده لهبـهری بكـهیت و زۆر بیڵێی.

٤- عـن عبـادة بـن الصَّامت(رضـي الله عنـه) قـال: سـمعتُ رسـولَ اللهِ(ﷺ) يقـول: مَـنْ اسـتغفرَ لِلمـؤمنينَ والمؤْمِنـاتِ كتـبَ اللهُ لَـهُ بكُـلِّ مُؤْمنٍ ومُؤْمنةٍ حسنة. رواه الطبراني وحسنه الالباني برقم(٥٩٠٢) في صحيح الجامع.

**واته: ههر یهكێك داوای لێبوردن بكات بۆ بڕوادارانی پیـاو و ئـافرهت خـودا بهرامبهر به ههموو ئیماندارێكی پیاو و ئافرهت خێرێكی بۆ دهنوسێ.**

## سوود: خهوێكی گرنگ

حدثنا إبراهيم بن عبد الله ، ثنا محمد بن إسحاق الثقفي ، قال :

سمعت أحمد بن الضحاك الخشاب ، يقول - وكان من البكائين" : -

رأيت فيما يرى النائم شريح بن يونس فقلت : ما فعل بك ربك يا أبا الحارث ؟ فقال : غفر لي ، ومع ذلك جعل قصري إلى جنب قصر محمد بن بشير بن عطاء الكندي ، فقلت : يا أبا الحارث ، أنت عندنا أكبر من محمد بن بشير ، فقال : لا تقل ذاك ، فإن الله تعالى جعل لمحمد بن بشير حظا في عمل كل مؤمن ومؤمنة ; لأنه كان إذا دعا الله قال :( اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات ، والمسلمين والمسلمات ، والكائنين منهم والأموات : "حلية الاولياء)

**واته : ئەحمەدی کوری زەححاك دەڵێ : لە خەدا شورەیحی کوری یونسم بینی گوتم : پەروەردگارت چی لەگەڵدا کردی ئەی باوکی حارس ؟ گوتی لێم خۆش بوو , وە قەسرەکەشمی لە تەنیشت قەسری موحەممەدی کوری بەشیر بۆ دانام , جا منیش گوتم ئەی باوکی حارس خۆ تۆ لای ئێمە گەورەتر بوی لە موحەممەدی کوری بەشیر , گوتی وا مەڵێ : خوای بەرز بەشی موحەممدی کوری بەشیری لە کردەوەی هەموو پیاو ئافرەتێکی ئیماندار داناوە لەبەر ئەوە کاتێك دوعای بکردایە دەیفەرموو:( اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات ، والمسلمين والمسلمات ، والكائنين منهم والأموات ( الكائنين: الأحياء)**

**تۆش دەتوانی ئەم دوعایە بە شێوەیەکی فراوانتر رۆژانە دەورو بەری (٣٠) جار یا زیاتر بەم شێوەیە ئەنجام بدەی و ملیارەها چاکە بە دەست بهێنی** (رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوالديَ ولِلْمُؤْمِنينَ والْمُؤمناتِ والْمُسلمينَ والْمُسلِماتِ ألاحياءِ مِنهمْ والْأَمْوات)

## تەوبە تاکەی قەبوڵ دەبێت

١-عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إنَّ اللهَ يَقْبَلُ تَوبَةَ العبْدِ ما لم يُغَرغِر[1]. حسن: رواه الترمذي (٣٥٣٧) وابن ماجة (٤٢٥٣).

**واتە: بێ گومان خودا تەوبەی بەندە قەبول دەکات بەمەرجێ نەکەوتبێتە حاڵی گیانەڵاوە.**

٢- عن أبي موسى الأشعري(رضي الله عنه) عن النبيَّ) قال: إنَّ الله عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بالليل لِيتوب مُسِيءُ النّهار ويَبْسطُ يَدَهُ بالنهار لِيتوبَ مُسيءُ الليل حتى تَطلعَ الشَّمْسُ مِن مَغْرِبِها. رواه البخاري ومسلم(٢٧٥٩).

**واتە: بێگومان خوای زاڵ و پایەبەرز لە شەودا دەستی خۆی واڵا دەکات بۆ ئەوەی ئەوانەی لە ڕۆژدا خراپەیان کردووە تۆبە بکەن ، وە دەستی خۆی واڵا دەکات بەرۆژ بۆ ئەوەی ئەوانەی لە شەودا خراپەیان کردووە تۆبە بکەن , تا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ.**

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ تاب قبل أنْ تَطْلُعَ الشّمسُ مِنْ مَغْرِبِها تاب الله عليه. رواه مسلم.

**واتە: هەر یەکێك تۆبە بکات پێش ئەوەی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵبێت خوا تۆبەی لێ قەبول دەکات.**

---

(١) ما لم يغرغر: أي ما لم تبلغ روحه حلقومه. فيكون بمنزلة الشيء الذي يتغرغر به المريض، والغرغرة: أي يجعل المشروب في الفم ويردد الى اصل الحلق و لايبلع.

**سوود**: له نزيك كۆتايى هـاتنى تەمـەنى زەوى پـێش ڕۆژى قيامـەت ڕۆژ له ڕۆژئاواوه هەڵدێ وه ئـەم دياردەيـە هـەڵهاتنى ڕۆژ لـه ڕۆژئـاواوه تەنها يەك جار دەبێت دواتر وەك ڕۆژانى ئاسايى لێ دێتـەوە، جـا لەگـەڵ هەڵهاتنى ڕۆژ له ڕۆژئاواوه ئـيتر دەرگـاى تەوبـەكردن دادەخرێـت و هـەر كەسێك له پێش ئـەو ڕووداوەدا بـاوەڕى نـەهێنابێت و تۆبـەى نـەكردبێت ئـيتر لـه دواى ئـەو ڕووداوه نـه باوەڕهێنـان قبـوڵ دەكرێـت و نەتەوبەكردنيش.

## گوناح دڵ ڕەش دەكات و تەوبە لای دەبات

١-عـن أبـي هريرة(رضـي الله عنـه) عـن رسـول الله(ﷺ) قـال: إنَّ العبـدَ إذا أخطأ خطيئـةً نُكِتَـتْ فـي قلبـه نكتـةً سـوداء فـإذا هـو نـزع واسْتَغفَرَ وتاب سُقِلَ قلبُهُ وإنْ عادَ زيدَ فيها حتى تعلوَ قلْ بَه وهو الرَّان الــذي ذكــرَ اللهُ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ (المطففين:١٤). حسن رواه الترمذي(٣٣٣٤).

واته: بێگومان ئەگەر بەنـدە گونـاهێكى كـرد خـاڵێكى ڕەش لـه دڵيـدا دورست دەكرێ , جا ئەگەر دەستى هەڵگرت و داواى لێخۆشبوونى كـردو تۆبەى كرد دڵى سپى و ساف دەبێتـەوە , بـەڵام ئەگـەر گەرايـەوە خاڵـه ڕەشـەكان لـه دڵيـدا زيـاد دەكـرێ تـاوەكو دڵـى دادەپۆشـێ ئـەوە ئەو(ران)ەيـە كـه خـوا باسـى كـردووه كـه دەفـەرمووێ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ (المطففين:١٤) واتـه: نـەء وانـى يـە: بـەڵكو ئەوەى كه دەيانكرد(له خراپه) پەردەى هێناوه بەسەر دڵياندا.

## گوناهكاری تەوبەكار

١- عن انس قال: قال رسول رسولُ اللهُ(ﷺ) كُلُّ بَني آدم خطّاء وخَيرُ الخطّائينَ التَّوابون. حسن رواه ابن ماجه(٤٢٥١) والترمذي(٢٤٩٩).

**واتـە: هـەموو ئادەمیزادێك گونـاح دەكـات وە باشـترین گوناهبـاریش ئەوانەن كە تـەوبە دەكەن.**

## تەوبەو(استغفار)ێكی گەورە

١- عـن عبـدالله بـن مسعود(رضـي الله عنـه) قـال: قـال رسـول اللهِ(ﷺ) مَنْ قال: أَستغفر الله الذي لا إله إلاّ هو الحيُّ القَّيوم وأتوبُ إليـهِ، غُفِـرَتْ ذنوبُـهُ وإنْ كـان قَـدْ فَـرَّ مِـنَ الزَّحـفِ. صـحيح رواه أبـو داواد(١٥١٧) والترمذي(٣٥٧٧).

**واته: هەر یـەكێك بڵـێ**(أَستغفر الله الذي لا إله إلاّ هو الحيُّ القَّيوم وأتوبُ إليهِ) **خوا لە گوناهەكانی خۆش دەبێـت ئەگـەر لـە شـەر لـە كـاتی بەیـەك گەیشتنی لەگەڵ كافرانیشدا رای كردبێت.**

### سوود:

**مانای تـەوبەو(استغفار)ەكە بـەم شـێوەیە: داوای لێخۆشبوون دەكـەم لەو خوایەی كـە جگـە لـەو هـیچ پەرسـتراوی بـە ڕاسـتی نیـەو زینـدوو و سەرپەرشتیكەرەو تەوبە دەكەم و دەگەڕێمەوە لای ئەو.**

## داوای لێخۆشبوون کردن  له سێیه‌کی کۆتایی شه‌و و کاتی سه‌حه‌ر

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: ينزلُ ربُّنا الى السّماء الدُّنيا حينَ يبقى ثُلثُ الليلِ الآخرُ فيقول: مَن يدعوني فأَستَجيبَ لَهُ، ومَنْ يَسألُني فأُعطيه ومن يستَغْفِرني فأَغفرَ لَه. رواه البخاري(١١٤٥) ومسلم(٧٥٨).

**واته: په‌روه‌ردگارمان(تبارك وتعالى) هه‌موو شه‌وێ داده‌به‌زی بۆ ئاسمانی دونیا کاتێك که سێیه‌کی کۆتایی شه‌و ده‌مێنێ ده‌فه‌رمووێ: کێ بانگم ده‌کات تا وه‌ڵامی بده‌مه‌وه , وه کێ داوام لێ ده‌کات تا پێ ی ببه‌خشم , وه کێ داوای لێخۆشبوونم لێ ده‌کات تاوه‌کو لێی خۆش بم.**

**سوود:**

**١-شه‌و کاته‌که‌ی ده‌ست پێ ده‌کات له رۆژئاوابوونه‌وه تا بانگی به‌یانی سێیه‌کی شه‌وی کۆتایی ئه‌وه‌یه شه‌و بکه‌یته سێ به‌ش به‌شی ئاخیریه‌تی.**

٢- **سه‌حه‌ر(ابن يزيد) ده‌ڵێ** : ( السَّحَر: هو السُّدُس الأَخير مِن الليل[1]). **واته: سه‌حه‌ر بریتی یه له یه‌ك له‌سه‌ر شه‌شی کۆتایی شه‌و.**

---

(١) تفسير الطبري

## دووبارەکردنەوەی گوناحو تەوبە

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ : أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي , فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ , ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي , فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ , ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي , فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ , اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ قَالَ عَبْدُ الْأَعْلَى لَا أَدْرِي أَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوْ الرَّابِعَةِ اعْمَلْ مَا شِئْتَ). رواه البخاري(٧٥٠٧) ومسلم(٢٧٥٨).

**واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ لەو فەرموودانەی کە لە پەروەردگاری(عزّ وَجلَّ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: بەندەیەك گوناحێکی کرد، جا گوتی: ئەی خودایە لە گوناهم خۆش بە خوا(تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەم گوناهێکی کردو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح دەبووریّ و لەسەر گوناهیش سزای دەدات، پاشان دووبارە گەڕایەوە گوناهی کردەوە و گوتی: ئەی پەروەردگارم لە گوناهم خۆشبە خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەم گوناهێکی کرد زانی کە بێگومان پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێت و لەسەر گوناهیش سزای هەیە، لە پاشان دیسان گەڕایەوەو گوناهیی کردەوەو گوتی: ئەی پەروەردگارم لە گوناهم خۆش بە، خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەم**

گوناهێکی کردو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێت و لەسەر گوناهیش سزای دەدات چیت دەوێ بیکە بێگومان لە گوناهت خۆش بووم(واتە مادام وادەکەی گوناح دەکەی و تەوبە دەکەی لە گوناهت خۆش دەبم).

(عبدالأعلى) دەڵێ: نازانم نە لە جاری سێ یەم نە لە جاری چوارەم فەرمووی(واعمل ما شئت).

**سوود**:

١-ئیمام(مسلم) رەحمەتی خوای لێ بێت لە(صحیح)ەکەی ئەم فەرموودەیە لە ژێر ناونیشانی(باب قبول التوبة من الذّنوب وإن تكرَّرت الذُّنوب والتوبة) دەهێنێ واتە: قەبول بوونی تەوبە لە گوناهان هەر چەند ئەگەر گوناهەکان و تەوبە دووبارە بوونەوە.

٢- خوای گەورە داوای(التوبە النّصوح)ی لە ئیمانداران کردووە، گوتمان(التوبە النصوح) ئەوەیە کە ئیماندار تەوبە لە گوناح بکات و جارێکی تر نەگەرێتەوە سەری. بەڵام ئەگەر تەوبەیەکی ڕاستی کرد لە گوناهێك لە پاشان گەڕایەوە سەر گوناهەکە ئەوە تەوبەی یەکەمی راست و تەواوە، کە جاری دووەم گوناهەکە دەکاتەوە ئەوە وەکو یەکێکە کە گوناهێکی نوێ ی کردبێت پێویستە تەوبەیەکی نوێ لە گوناهەکە بکاتەوە.

# نوێژی تەوبە

نوێژی تەوبە سوننەتە بە کۆدەنگی هەر چوار پێشەواکە، سوننەتە کەسێك گوناحێکی گەورە یا گچکەی کرد لە پاشان هەڵبستیٚ دەست نوێژ بشواو لە پاشان دوو رکات نوێژ بکات، لە پاشان داوای لێبوردن لە خوا بکات.

عن أبو بكر [ رضي الله عنه ] أنه قال سمعت رسول الله يقول " (ما مِنْ عبدٍ يُذنبُ ذنبا فيُحْسِن الطُّهُورَ ثم يَقومُ فيُصلي رَكعتينِ ثم يَستغفرُ اللهَ إلا غَفَرَ اللهُ له) " ثم قرأ هذه الآية { وَالذِينَ إذا فَعَلُوا فَاحِشَةً أوْ ظَلَمُوا أنفُسهُم ذكَروا اللهَ } إلى آخر الآية .صحيح:رواه أبوداود(١٥٢١)

واتە: هەر بەندەیەك گوناحێکی کرد، دەست نوێژێکی جوان بشوات، لە پاشان هەڵبستیٚ دوو رکات نوێژ بکات، لە پاشان داوای لێبوردن بکات لە خوا، ئیللا خوا لێی خۆش دەبێت، لە پاشان ئایەتی (١٣٥) ی (آل عمران) ی خوێندەوە.

**سوود**:

چاکە خراپە لادەبات، وە نوێژیش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (وَاعْلَمُوا أَنَّ مِن أفضلِ أعمالكم الصلاة) صحيح :رواه ابن ماجه(٢٧٨)

واتە:وە بزانن بیٚ گومان لە باشترینی کردەوەکانتان نوێژە، کەواتە نوێژ کردن بۆ سڕینەوەی گوناح زۆر گرنگە، بەتایبەتیش ئەگەر قورئانی زۆر تیادا بخوێنیٚ.

# سوودی (توبة) و (إستغفار)

## ١- گوێڕایەڵیە بۆ خوا

خـــوا دەفــــەرمووێ: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ٣١﴾(النور)

**واتە: ئەی ئیمانداران هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بەڵکو بگەن بە ئامانج و خۆش بەختی (لەهەردوو جیهاندا).**

**سوود: واجبە تەوبە بکرێت لە هەموو گوناهێکی گەورەو گچکە.**

**(ابن القیم) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ:** (إنَّ المبادرةَ الى التوبة من الذنب فرضٌ على الفور لا يجوز تأخيرها فمتى أخّرها عصى بالتّأخير) **واتە: پەلە کردن لە تەوبە کردن لە گوناهان پێویستە یەکسەر بێت دورست نیە دوا بخرێ , جا هەر کات دوای خست بە دواخستنی گوناهبار دەبێت.**

**کەواتــە پێویســتە موســڵمان هــەموو کــاتێکی ژیــانی لــە حالــەتی ئامادەباشـیدا بێـت بـۆ پێشـوازی کـردن لـە مـردن و قیامـەت بـەوەی تەوبەیەکی باشی کردبێت، وە هەرچی مافی خەڵك هەیە لەسەر خۆی لای بردبێت، ئەگەر موسڵمان وابوو بەڕاستی ئەمە دەستکەوتێکی گەورەیـە، مایەی سەرفرازیە بۆ دونیاو قیامەتی.**

خـــوا دەفــــەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ١٨﴾ (الحشر).

واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە لە خوا بترسن، وە با هەموو کەسێك تەماشا بكات (بزانیٚ) چی پێش خۆی ناردووە بۆ پاشەڕۆژی ، وە پارێز لە خوا بکەن ، بەڕاستی خوا زۆر شارەزایە بەوەی کە دەیکەن.

## ٢- دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکان و چوونە بەهەشت.

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ (التحريم: ٨).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە گەرانەوەیەکی یەکجاری تا پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش ببیٚ وە بتان خاتە ناو باخاتێکەوە کە جۆگەی ئاوی زۆر بە ژێریاندا دەڕوات.

**سوود** :

*سُئلَ عمر عن التوبةِ النّصوح فقال: أن يتوب الرّجُلُ من العملِ السّيء ثم لا يعود.

واتە: لە ئیمامی عومەریان پرسی دەربارەی(التوبة النّصوح) فەرمووی: ئەوەیە کە پیاو تەوبە لە گوناح بکات و نەگەڕێتەوە سەری جارێکی تر.

## ٣- هۆكاره بۆ سەرفرازی دونیاو دوارۆژ:

خـــوا دەفـــەرمووێ: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾ (النور: ٣١).

واتە: ئەی ئیمانداران هەمووتان تەوبە بكەن و بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، تا رزگارو سەركەوتووبن.

* كەواتە ئیمانداران بەهۆی تەوبە هەم لە دونیـا وە هـەم لـە قیامـەت رزگارو بەختیار و سەرفراز دەبن*

## ٤- هۆكاره بۆ خۆش گوزەرانی لە دونیادا.

خـوا دەفـەرمووێ: ﴿وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ (هود: ٣).

واتە: هـەروەها بـۆ ئـەوەی داوای لێبـوردن بكـەن لـە پـەروەردگارتان پاشـــان تەوبـــە بكـــەن و بگەڕێنـــەوە بـــۆ لای (ئەگـــەر واتـــان كـــرد) خۆشگوزەرانتان دەكات و دەتـان ژیـەنی بـە ژیـانێكی چـاك و خـۆش تـا ماوەی دیاری كراو (بۆتان).

كەواتـە ئـادەمیزاد بـەهۆی تەوبـەو داوای لێخۆشـبوون كـردن، خـوای گەورە ژیانی دونیای خۆش دەكات و ئەو كەسە خۆش گوزەران دەبێت و بەخۆشی دەژی .

## ٥- هۆكارێكه بۆ ئەوەی خوا خۆشتی بوێت

خــوا دەفــەرمووێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢﴾ (البقرة).

واتە: بێ گومان خوا تەوبـەكارانی خـۆش دەوێـت، وە پاكـانی خـۆش دەوێت.

## ٦- هۆكارێكه بۆ زیاد بوونی هێزو باران بارین

خـــوا دەفـــەرمووێ: ﴿وَيَٰقَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ ٥٢﴾ (هود).

واتـە: (خـوا لەسـەر زمـانی (هـود) پێغەمبـەر دەفـەرمووێ) وە ئـەی گەلەكەم داوای لێخۆش بوون بكەن لە پەروەردگارتان , لە پاشان تەوبـە بكـەن بگەڕێنـەوە لای ئـەو (ئەگـەر وا بكـەن ئـەوە خـوا) لـە ئاسمانـەوە بارانی بـە لێزمـە دەبـارێنێ بەسـەرتاندا، وە هێـزی تـر زیـاد دەكـات بـۆ هێزەكەتان، وە روو وەرمەگێڕن بە تاوانباری.

## ٧- هۆكارێكه بۆ پێدانی سامان و كورو بـاخ و باخـات و جۆگەی ئاو

خــوا دەفــەرمووێ: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ١٠ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ١١ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ١٢﴾ (نوح).

واتە: (خوا لەسەر زمانی (نوح) دەفەرمووێ): ئەوسا پێم گوتن داوای لێخۆش بوون بکەن لە پەروەردگارتان بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆش بووە(١٠) لە ئاسمانەوە بارانی بە لێزمەتان بۆ دەبارێنێ(١١) وە سامان و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێ وە باخ و باخاتی زۆرتات پێ دەدات، وە جۆگەی ئاوی زۆرتان دەداتێ(١٢)

**سوود**:

(ابن صُبیح) دەڵێ: پیاوێك هاتە لای حەسەنی بەسری گوتی: باران ناباریێ، پێی گوت (أستغفر الله) بکە، وە یەکێکی تر گوتی هەژارم، پێی گوت (أستغفر الله) بکە، وە پیاوێکی تر پێی گوت داوا لە خوا بکە کە کوڕم پێبدا ، پێی فەرموو (أستغفر الله) بکە، وە یەکێکی تر گوتی باخەکەم ووشك بووە، پێی فەرموو، (أستغفر الله) بکە، جا لە شێخ حەسەنیان پرسی ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکی جیا جیا بوون، بەڵام تۆ بۆ هەموویان یەك وەڵامت دایەوە، ئەویش فەرمووی من هیچم لە خۆمەوە نەگۆتیە خوای بەرز لە سورەتی نوح دەفەرمووێ: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ .

## ٨- هۆکارێکە بۆ تووش نەبوون بە سزای خوا .

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الأنفال).

واتە: وە بەڕاستی خوا سزایان نادات لە کاتێکدا تۆ (ئەی موحەمەد) لەناویاندا بێت، هەروەها خوا تووشی سزایان ناکات لە کاتێکدا ئەوان داوای لێبوردن بکەن.

## ٩- هۆکارە بۆ لاچوونی خەم و خەفەت و تەنگی

عَنْ عَبْد اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (مَنْ أَكْثَرَ مِنْ الِاسْتِغْفَارِ جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجًا وَمِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ).

ئەم فەرموودەیە ئیمام أحمد لە (مسند) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٢٣٤) وە (أحمد شاكر) لە تەحقیقی ئەم فەرموودەیە دەڵێ فەرموودەیەکی (صحیح)ە، وە أبو داود ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی ژمارە (١٥١٨) وابن ماجه (٣٨١٩) شێخ ئەلبانی دەڵێ: ئەم فەرموودەیە (ضعیف)ە، لەبەر ئەوەی لە ریوایەتی ئەم فەرموودەیە (حكم بن مصعب) هەیە کە (مجهول)ە، هەروەکو (حافظ) لە (التقریب) وا دەڵێ .

وە شێخ (عیثمین) دەڵێ: (هذا الحدیث ضعیف، ولكن معناه صحیح) واتە: حەدیسەکە زەعیفە بەڵام ماناکەی راستە، وە (ابن باز) دەڵێ: (یصلح ذكرهُ في الترغیب والترهیب) واتە: دەگونجێ لە بابی (ترغیب و ترهیب) ئەم فەرموودەیە باس بکرێ.

مانای فەرموودەکە:

هەر یەکێك زۆر داوای لێخۆش بوون بکات ، خوا لە هەموو خەم و خەفەتێك دەر بازی دەکات، وە لە هەموو تەنگییەك دەرگای رزگاری بۆ دەکاتەوە، وە رزق و رۆزی پێ دەدات لە لایەکەوە کە ئەو گومانی بۆی نەچووە.

# پرسیارو وەڵام دەربارەی تەوبە

<u>١-تەوبە دەکەم دەگەڕێمەوە سەر گوناهەکە:</u>

موسڵمان کە تەوبە دەکات یەکێك لـە مەرجـەکانی تەوبـە ئەوەیـە کـە عەزمی وابێت کە هیچی تر ئـەم گوناهـە نەکاتـەوە جـا ئەگـەر موسـڵمان تەوبەیەکی راس تی کرد گەڕایەوە سەر گوناهەکە ئەوە تەوبەی یەکـەمی ڕاستە ئەو کاتە تەوبەیەکی نویێ بۆ گوناهەکە دەکاتەوە.

<u>٢- ئایا دەبێت تەوبە لە هەندیێ لە گوناهەکانم بکەم:</u>

بەڵێ دەبیێ تەوبە لە هەندێك لـە گوناهـەکانت بکـەی لـە هەنـدێکی تـر نەکـەیت، بـەڵام گونـاهی ئـەوانی تـرت لەسـەر دەمێنـێ , وە گونـاهی دواخستنەکەش , چونکە تەوبە یەکسەر واجبە بۆ گوناهەکان.

(ابن تیمیە) رەحمەتی خوای لیێ بێت دەڵیێ: (وتَصحُّ التَّوْبةُ من ذَنبٍ مع إصْرارِه على آخَر عند السَّلف والخلف) واتە: تەوبـە دورسـتە لـە گوناهێك لەگەڵ بەردەوام بوونی لەسەر گوناهی تر لە لای زانایانی پێشین و پاشین.

<u>٣- ئەوەی نوێژی چواندووە:</u>

أ-کافر کە موسڵمان بوو نوێژ ناگێڕێتەوە.

ب- منداڵ تا بالغ نـەبێت نوێـژی لەسـەر واجـب نییـە , بـەڵام ئەگـەر بیکات خێری بۆ دەنوسریێ.

ج- کەسیێ خەوی لیێ کەوت یا لەبیری چوو نوێژی نەکرد ئەوە کـەی لـە خـەو هەستا یا کەی بیری کەوتەوە ئەوە کاتی نوێژەکەیەتی بە حازر بیکات.

د- ئەگەر یەکێك بە ئەنقەست نوێژی نەکرد تا کاتەکەی بەسەر چوو جەماوەری زانایان دەڵێن دەبێت نوێژەکەی بگێرێتەوەو گوناهباریش بووە، بەڵام هێندێك لە زانایان لەوانە ئیبن تیمیەو ئیبن حەزم و شەوکانی دەڵێن ناتوانێ بیگێرێتەوە دەڵێن با تەوبە بکات و نوێژی سوننەت و کردەوەی چاك بکات.

٤- چی دەکەی لەو ماڵەی بە کاسبی حەرام پەیدا کراوە:

ئەگەر یەکێك ماڵێکی بە کاسبی حەرام پەیدا کردبێ وەك فرۆشتنی جغارە یا فرۆشتنی کاسێتی حەرام ویستی تەوبە بکات:

أ-ئەگەر لە کاتی پەیداکردنی کافر بووبێت لە کاتی تەوبەکردنی پێویست ناکات دەری کات و پارەکە لای دەمێنێتەوە.

ب- بەڵام ئەگەر لە کاتی وەدەست هێنانی موسڵمان بووبێت و دەیزانی کە کاسبیەکە حەرامە ئەوە ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە چی لە حەرام کۆکردیتەوە سەرفی دەکا لە کاری خێر نەك بە خێر بیدات چونکە خودا حەرام قەبول ناکات.

٥- بە ماڵی زەوت کراوی یەتیم بازرگانی کردن:

زانایان چەند قسەیەکیان هەیە دەربارەی ئەوە , یەکێك لەم قسانە ئەوەیە: پارەکەی خۆیان هەموو دەدەیەوە قازانجەکەشی دەکەی بە نیوە لە گەڵیاندا ئەمە قسەی ئیمام ئەحمەدو ئیبن تیمیەیە.

٦- ئەوانـــەی ئەزیـــەتی دایـــك و باوكیـــان داوەو ئـــەوانیش مردوون:

ئەوانەی كە ئەزیەتی دایك و باوكیان داوە ئەوانیش مردوون , با ئـەو كەسە تەوبەیەكی ڕاست بكات وە زۆر ئـەم دوعاو(استغفار)ە بكات بۆ ئەوان(ربِّ اغفر لي ولوالديَّ وارْحمْهُما كما ربَّياني صغيرا) واتـە: پەروەردگارم لە خۆم و دایك و باوكم خۆش بـە , وە ڕەحمیـان پـێ بكـە هەروەكو ئەوان منیان پەروەردە كردووە بە گچكەیی.

ئەم دوعاو داوای لێخۆشبوونە چاكەیەكی گەورەیە بۆ بكەرەكـەی جا دایك و باوكی زیندوو بن یا مردوو .

٧- زەكات:

ئەوەی موسـلمانەی زەكـاتی نـەدابێ دەبێت هـەموو زەكاتەكـە بـدات ئەگـەر سـاڵانێكی زۆریـش زەكـاتی نـەدابێ زەكـات حـەقی فەقیرانیشـی تێدایە.

٨- ڕۆژوو:

ئەوەی كە ڕۆژووی ڕەمەزانی خـواردووە لـەو كاتـەش موسـڵمان بـووە دەبێ هەمووی بگرێتەوە, وە ئەگەر پێش ئەوەی بچێتە ناو ڕەمەزانێكی تر ڕۆژووەكـەی نەگرتبێتـەوە بـەبێ عـوزر دەبـێ لەگـەڵ هـەر ڕۆژێكـیش خـــواردنی هـــەژارێك بـــدات ئەگـــەر چـــەند ڕەمـــەزانیش بەســـەر ڕۆژوو نەگرتنەكەی تێپەڕیبێ ئەو تەنها لەگەڵ هـەر ڕۆژوو گرتنـەوەك خـواردنی هەژارێك دەدات.

**٩- سەیارەیەکم هەیە خانووەکم هەیە هەندێکی حەرامە هەندێکی حەڵاڵە چی بکەم:**

هەر یەکێك سەیارەیەك یا خانووەك یا شتێکی لەم جۆرەی بە ماڵی حەڵاڵ و حەرام کریبوو ئەوە بای حەرامەکە لەو ماڵەی کە هەیتی دەردەهێنێ , ئەگەر خاوەنەکەی دەناسیەوە ئەوە پێی دەداتەوە , وە ئەگەر مردبوو دەیداتەوە بە میراتگرەکانی , وە ئەگەر نەشی دەناسیەوە لە دوای هەوڵی جددی بۆ دۆزینەوەیان ئەوە پارەکە بەنیەتی ئەوان دەکاتە خێر.

**١٠- تەوبە لە نێربازی:**

ئەم تاوانە تاوانێکی گەورەو قێزەونە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:(مَنْ وجدْتُمُوهُ يعملُ عملَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلوا الفاعلَ والْمفعُولَ بِه) [1].

واتە: هەر یەکێکتان بینی کردەوەی قەومی لوتی دەکرد(واتە نێربازی) ئەوە ئەوەی کە کردوویەتی و ئەوەش کە لە گەڵی دا کراوە هەردووکیان بکوژن.

کەواتە حەددی نێربازی کوشتنە.

جا ئەوانەی ئەم کارەیان کردووە نە گەیشتۆتە دادگا ,با تەوبەیەکی رێك و ڕاست بکەن.

---

(١) رواه أبوداود و الترمذي وابن ماجه وصححه الالباني(إرواء الخليل(٢٣٥٠)

## ١١- تەوبەی قاتل:

١-ئەگەر یەکێك موسڵمانێك بە ئەنقەست بکوژێ سێ هەقی دەکەوێتە سەر:

١- حەقی خودا کە ئەمە بە تەوبە لادەچێ.

٢- حەقی میراتگرەکانی: کە ئەمەش دەبێ خۆی تەسلیمیان بکات جا یا دەکوژرێتەوە یا عەفووی دەکەن یا پارەو ماڵی لێ وەردەگرن.

٣- حەقی کوژراوەکە: ئەوەش ناتوانرێ لەدونیادا بدرێ، ئەهلی عیلم دەڵێن ئەگەر بکوژەکە تەوبەیەکی جوان بکات، ئەوە خوا مافی کوژراوەکەی لەسەر هەڵدەگرێ، لەلایەن خۆیەوە خوا لەرۆژی قیامەت تۆڵە بۆ کوژراوەکە دەکاتەوە.

## ١٢- دز چۆن تەوبە دەکات:

ئەگەر ماڵە دزراوەکەی لەلا ماوە ئەوە بۆیان دەگێرێتەوە , بەلام ئەگەر فەوتاوە یا نرخی کەمی کردووە بە بەکارهێنان یا بەسەردا چوونی کات دەبێ بۆیان تەعویز بکاتەوە مەگەر عەفووی بکەن , وە ئەگەر نەیتوانی رووبەروو بیانداتەوە با هەوڵ بدات رێگایەك بدۆزێتەوە بۆیان بنێرێتەوە.

## ١٣- دزێك کە خاوەنەکەی ناناسێتەوە:

ئەگەر ئەو ماڵەی دزیویەتی خاوەنەکەی ناناسێتەوە یا دەیناسیەوە بەلام مردووە , ئەگەر خاوەنەکەی مردبێت ئەوە ماڵەکە دەگەرێنێتەوە بۆ میراتگرانی , بەلام ئەگەر لە دوای هەوڵ دانی جددی خاوەنەکەی نەدۆزیەوە ئەوە ماڵەکە دەکاتە خێر لە بری ئەوان بۆ ئەوان.

## ١٤- تەوبە لە زینا:

زینا لە گوناهە گەورەکانە موسڵمان دەبێ زۆر بە توندی خۆی لەم کارە بپارێزی بەڵام ئەگەر ئەم گوناهە گەورەی ئەنجام داو هەر لە نێوان و خۆی و خودا بوو ئەوە حەددی لەسەر پێویست نییە بە تۆبەیەکی ڕاست پاك دەبێتەوە. بەڵام پاش ئاشکرا بوون و ئیسپات بوونی تاوانەکە سزاو حەددی لەسەر لاناچێ، واتە ئەگەر گەیشتە لای ئیمام یا نایبی ئیمام و لەسەری ئیسپات بوو.

بەڵام ئەگەر بە زۆری زینای لەگەڵ ئافرەتێك کرد ئەو رازی نەبوو , ئەوە لەگەڵ تەوبەکە مارەییەکی وەکو خۆشی پێ دەدات ئەمە ئەگەر نەگەیشتبووە لای ئیمام , وە ئەو کەسەی تۆبە لە زینا دەکات و لێی ئاشکرا نەبووە باشتر وایە ئاشکرای نەکات و تەوبەیەکی رێك و پێکی لێ بکات لە نێوان و خۆیی و خوای گەورەدا.

# ماره كردن (النكاح)

## حوكمی ژن هێنان و شووكردن

عن عَبْد الله بن مسعود قال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَبَابًا لا نَجِدُ شَيْئًا فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :(يَا مَعْشَر الشَّبَاب مَنْ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَر وَأَحْصَنُ لِلْفَرْج وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ) رواه البخاري(٤٧٧٩)ومسلم(١٤٠٠)

واتـه: (ابـن مسـعود) دەڵـێ: ئێمـه گـەنج و جاحێـڵ بـووین لەگـەڵ پێغەمبەردا پارەو پولمان نەبوو، جا پێغەمبـەر (ﷺ) پێـی فـەرمووین: ئەی كۆمەڵی گەنجان هەر كەسێك لـه ئێـوه توانـای هەیـه بـا ژن بێنـێ، چونكه ژن هێنان باشترین هۆكاره بۆ چـاو پـارێزی و داوێـن پـارێزی، وه هەر كەسێكیش نەتوانێ (ژن بێنێ) با بەڕۆژوو بێت چونكه بـۆی دەبێتـه قەڵغان.

**سوود**:

١- هەنـدێ لـه زانایـان دەڵـێن ئەگـەر پیـاو یـا ژن ترسـا لـەوەی كـه تووشی فیتنـه بێـت واجبـه كـه زەواج بكـەن , وه هەنـدێكی تـر دەڵـێن واجبـه زەواج بـۆ هـەموو كەسێك كـه توانـای هـەبێت و حـەز (شـهوه)ی هەبێت، وه ئەگەر ژنێكیش كەسێك هاته داخوازی كەسێكی گونجـاو بـوو پێویسـته لەسـەری قـەبوولی بكـات، وه هـەروەها (ابـن بـاز) و (عیثمین) ئەوەیان لا راجحه كه ئ*ەگەر بتوانێ، زەواج بكات.

٢- وه هەندێکیش لە زانایان دەڵێن ئەگەر ئینسان توانی لە گوناحەکان کە پەیوەندییان بە جسنەوە هەیە خۆی بپارێزێت ئەمە زەواج بۆ ئەو سوننەتە.

٣- هەوڵ بدە ژن بهێنیت چونکە ژن هێنان بە سوودە بۆ دین و دونیات , لە لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە ئەوانەی کە ژن دەهێنن تەمەنیان زیاتر بووە لەوانەی کە ژنیان نەهێناوە.

٤- وە پیاو دەبێ زوو ژن بهێنێ وە ئافرەتیش دەبێ زوو شوو بکات چونکە ئەگەر وا نەکەن لەوانەیە لە رووی جنسیەوە تووشی کێشە بن، هەموو شتێ لە لاشەی ئینسان ئەگەر کارت پێ نەکرد سست دەبێت، جا کۆ ئەندامی جنسیش هەر وایە.

## کەسی دیندار هەڵبژێرە بۆ هاوسەرگیری

١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:( تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ )رواه البخاري(٥٠٩٠)ومسلم(١٤٦٦)

واتە: ژن لەبەر چوار شتان مارە دەکرێ، لەبەر ماڵ و سامانەکەی، وە لەبەر بنەماڵەی، وە لەبەر جوانیەکەی، وە لەبەر دینەکەی، جا تۆش ئەوە بخوازە کە دیندارە دەستەکانت بەخۆڵ بێت.

**سوود**:

زۆر گرنگە کە پیاو ژنێك بخوازێ دیندار بێت وەکو خۆی بیر بکاتەوە، بۆ بەجێهێنانی ئەرکە ئاینیەکان و تەبایی نێوانیان و پەروەردەکردنی

**منداڵەکانیان بە شێوەیەکی باش، وە هەروەها بۆ منداڵ پەروەردە کردن لەسەر بنەمایەکی ئایینی ئافرەتێکی دیندار زۆر گرنگە.**

٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:( إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ )حسن صحيح:رواه الترمذي(١٠٨٤)

**واتە: کاتێك یەکێك خوازبێنی کرد لێتان لە دین و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوە پێی بدەن، ئەگەر وا نەکەن فیتنەو ئاژاوەیەکی گەورە ڕوودەدات لەسەر زەویدا.**

## چی دەڵێی کاتێ هاوسەرگیریت کرد

عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً أَوْ اشْتَرَى خَادِمًا فَلْيَقُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ , وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَمِنْ شَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ , وَإِذَا اشْتَرَى بَعِيرًا فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سَنَامِهِ وَلْيَقُلْ مِثْلَ ذَلِكَ ) حسن:رواه أبوداود(٢١٦٠)وابن ماجة(١٩١٨)

**واتە: کاتێك یەکێك لە ئێوە هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ئافرەتێکدا یا خزمەتکارێکی کڕی با بڵێ** (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَمِنْ شَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ)[1].

**واتە: ئەی خودایە من داوای چاکەی ئەوەت لێ دەکەم , وە ئەو**

---

(١) جبلتها عليه، خلقتها وطبعتها عليه، وجَبَلَهُ الله، أي خَلَقه.

چاکەیەش کە تێیدا دروستت کردووە، وە خۆم دەپارێزم لە شەڕی ئەو , وە لەو شەڕەش کە تێیدا دروستت کردووە، وە کاتێك حوشترێکی کڕی با دەست لە سەرەوەی کۆپەراکەی دابنێ وەك ئەمە بڵێ، (واتە وەکو دوعاکەی پێشوو).

ذورة سنامه: (سنام) کۆپەران، ئەو بەشە بەرزەی سەر پشتی حوشترە، (الذروة) بەرزترین شوێنی شت.

## پاڕانەوە بۆ موسڵمان لە دوای ژن هێنان (دوای مارە بڕین)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسلَّمَ كَانَ إِذَا رَفَّأَ الْإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ قَالَ :(بَارَكَ اللَّهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ)صحيح: رواه ابوداود(٢١٣٠)وغيره

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ پیرۆزبایی بکردبایە لە کەسێك کە ژنی بهێنایە دەیفەرموو: :(بَارَكَ اللَّهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ)، واتە: خوا لێت پیرۆز بکات و بەرەکەت بڕێژێ بە سەرتاو لەسەر خێر کۆتان بکاتەوە.

## خۆ پاراستن و پەناگرتن پێش سەرجێیی کردن

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:( لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ بِاسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا )رواه البخاري(١٤١)ومسلم(١٤٣٤)

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە کاتێك ویستی بچێتە لای خێزانەکەی بڵـێ: (بِاسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّب الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا)، جا ئەگەر لـەم سەرجێیی کردنەدا منداڵێکیان بۆ تەقدیر کرا , تا ماوە شـەیتان نـاتوانێ زیانی پێبگەیەنێ.

## خواردنی ژن هێنان (ولیمة)

سوننەتە کەسێك ژن دەهێنێ خواردن درووست بکات خەڵکی بۆ بانگ بکات، جا کەمترینی خواردنی ژن هێنان بۆ کەسێ کە هەیبێت مـەڕێك یـا بزنێکە لای زۆربەکەشی دیار نییـە، بـەڵام بـۆ کەسـێ کـە نـەیبێت چـەند ئەتوانێ با بیکات با خواردنێکی سادەش بێت هەر سوننەتە بکرێت.

وە واجبیشە بۆ ئەو کەسـەی کـە دەعـوەت دەکـرێ بـۆ خـواردنی ژن هێنان بچێت، بەڵام ئەگەر کاری بـێ شـەرعی لـە زەماوەندەکـەدا هـەبوو دروست نییە بڕوات، مەگەر بۆ ڕێگری کردن بێت لە ناشەرعییەکە.

عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ وَعَلَيْهِ رَدْعُ زَعْفَرَانٍ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَهْيَمْ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً قَالَ مَا أَصْدَقْتَهَا قَالَ وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ )رواه البخاري(٢٠٤٩)ومسلم(١٤٢٧)وابوداود(٢١٠٩)

واتە: ئەنەسی کـوڕی مالیـك دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) (عبـدالرحمن)ی کوڕی عەوفی بینی شوێنەواری زەعفەرانی پێوەبوو (کە ئی خێزانی بووە پێیـوە لکـاوە) فـەرمووی ئـەوە چـییە؟ گـوتی ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـافرەتێکم مـارە کـردووە، فـەرمووی چـەند مارەییـت پێـداوە؟ ووتـی گۆیەکی ئاڵتون، فەرووی: خواردن درووست بکە با بە مەڕێکیش بێت.

**(وزن نواة) ئەمە ناوێکە بۆ ئەندازەیەك لە زێڕ کە بەقەد پێنج دیرهەم زێڕ بووە، وە گوتراویشە بەقەد دەنکە خورمایەك، بەڵام یەکەم راسترە.**

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :(إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا)رواه البخاري(٤٨٧٨)ومسلم(١٤٢٩)

**واتە: کاتێك یەکێك لە ئێوە بانگ کرا بۆ خواردنی ژن هێنان با بڕوات بۆی.**

# منداڵ

## شیرین کردنی مەڵاشووی منداڵ

١- عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ وُلِدَ لِي غُلَامٌ فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ وَدَفَعَهُ إِلَيَّ وَكَانَ أَكْبَرَ وَلَدِ أَبِي مُوسَى)رواه البخاري(٥٤٦٧)ومسلم(٢١٤٥)

**واتە: ئەبو موسا دەڵێ: (منداڵێکمان بوو، جا منیش بردمە لای پێغەمبەر (ﷺ) ناوی لێنا (ابراهیم) , مەڵاشووی شیرین کرد بە خورمایەك , وە دوعای بەرەکەتی بۆ کرد، ئینجا دایەوە بە من، وە ئەو منداڵەش گەورەترین منداڵی ئەبو موسا بووە.**

### سوود

**١- شیرین کردنی مەڵاشووی منداڵ واتە ئاسمانەی سەرووی دەمی، دەست پێ دەکات لەدوای لە دایك بوونی.**

**٢- بۆ شیرین کردنی مەڵاشووی منداڵ خورمایەك لە دەمت شل دەکەیتەوە بەو خورمایە بەدەستت مەڵاشوی منداڵەکەی پێ شیرین دەکەی.**

## ناو لێنانی منداڵ و عەقیقەو سەرتاشینی

١- عَن عَمْرو بن شُعَيب، عن أبيه عن جَدِّه، أنَّ النبيَّ (ﷺ) أَمَرَ بتسميةِ المولُود يومَ سابِعِهِ وَوَضْعِ الأَذى عنه والحقِّ ) حسن رواه الترمذي (٢٨٣٢).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە منداڵ لە حەوتەم رۆژدا ناوی لێبرنێ، وە سەری بتاشرێ، وە عەقیقەی بۆ بکرێ.**

**سوود**:

١- ئـەوەی لـە (**ریـاض الصـالحین**) دا دەڵـێ: (السنة أن يسمى المولود اليوم السابع من ولادته أو يوم الولادة)، واتە: سوننەتە کـە منـداڵ لە ڕۆژی حەوتەم ناوی لێ بنرێ، یاخود لە ڕۆژی لە دایك بوونی.

٢- بەڵگە لەسەر ناونـانی لـە ڕۆژی یەکـەم فەرموودەکـەی پـێش ئـەم فەرموودەیە کە لە ئەبو موسا گێڕدراوەتەوە.

٣- ئەو پرچەی کە لێی دەکەیتەوە بەقەد کێشـی ئـەو زیـو دەکەیتـە خێر، جا منداڵەکە کوڕ بوو یا کچ، وە زیـو ئێسـتا مامەڵـەی پـێ نـاکرێ، دروستە پارە بدرێ لە جیاتی زیو.

٤- (عقیقە) دوو مەڕ یا دوو بزن بۆ کوڕ، یەك مەڕ یا یەك بزن بـۆ کـچ سەر دەبڕدرێ، جا هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەمە واجبـە وە هەنـدێکیش دەڵێن سوننەتە، باشتر وایە لە ڕۆژی حەوتـەم بێـت، بـەڵام ئەگـەر پـێش ئەم کاتەو دوای ئەم کاتەش بێت هەر دروستە.

٥- پیاو یا ئـافرەت دروسـتە عەقیقـە بـۆ خۆیـان بکـەن، ئەگـەر بـە منداڵی بۆیان نەکرابوو، پێغەمبەر (ﷺ) عەقیقەی بـۆ خـۆی کـردووە لـە دوای ئەوەی کە بووە بە پێغەمبەر.

٢- عـن سَمُـرَةَ بـن جُنـدبٍ أَنَّ رسـولَ الله (ﷺ) قـال: (كُـلُّ غُـلامٍ رهينـةٌ بِعَقيقَتِـهِ، تُـذبَحُ عنـه يـومَ سـابِعِهِ، ويُحْلَـقُ ويُسَـمَّى) صـحيح، رواه أبـو داود (٢٨٣٨).

واتە: هەموو منداڵێك بارمتەیە بە عەقیقەکـەی، لـە ڕۆژی حەوتـەم بـۆی سەردەبڕدرێ وە پرچی دەتاشرێ، وە ناوی لێدەنرێ.

٣- عن أنس قال: قال رسول الله (ﷺ) (وُلِدَ لِي الليلةَ غلامٌ فسَمَّيْتُهُ باسمِ أَبِي ابراهيمَ عليه السلام) رواه مسلم (٢٣١٥) وأبو داود (٢١٢٦).

**واته: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویٚ : ئەم شەو منداڵێکمان بوو ناوم لێنا بەناوی باوکم ئیبراهیم (علیه السلام).**

٤- **عن أنس قال: (وُلِدَ لأبِي طلحة غلام، فأتيت به النبيّ (ﷺ) فَحَنّكَهُ وسَمّاهُ عبدالله)** رواه البخاري (١٣٠١) ومسلم (٢١٤٤).

**واته: ئەنەس دەڵێ: ئەبو تەڵحە منداڵێکیان بوو منیش بردمە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، مەلاشووی شیرین کرد وە ناوی نا (عبدالله).**

**٥- عن ابن عمر قال: قال رسول الله (ﷺ) : (إنَّ أَحَبَّ أَسمائِكُم إلى اللهِ عَزّ وجَلّ عبْدُ اللهِ وعبدالرحمن)** رواه مسلم (٢١٣٢).

**واتە: بێ گومان خۆشەویسترین ناوەکانتان لای خوا (عزّ وجلّ) (عبدالله) و (عبدالرحمن)ە.**

**سوود:**

**با موسڵمان هەوڵ بدات ناوێکی شەرعی لە منداڵەکەی بنێ، رۆژێك لە رۆژان ئەگەر منداڵەکەی بووە کەسایەتیەکی بەرز شەرمی بەو ناوە نەبێت، درووست نییە ناوێك لە منداڵەکەت بنێی کە ماناکەی ناخۆش بێت، یان خراپ، یان واتاکەی جوێن دان بێت یان پاکانەی تێدا بێت.**

## پەنادانی منداڵ لە شەیتان و چاو پیسی

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ يَقُولُ أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ وَيَقُولُ هَكَذَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يُعَوِّذُ إِسْحَقَ وَإِسْمَعِيلَ )رواه البخاري(٣٣٧١)والترمذي(٢٠٦٠).

**واتە: (ابن عباس) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) حەسەن و حوسەینی دەپاراست (پەنا دەدا) دەیفەرموو: (دەتانپارێزم، پەناتان دەدەم بە ووتە تەواوەکانی خوا (کە قورئانە تەواوەو بێ کەم و کورتیە) لە هەموو شەیتانێك و زیندەوەرێکی ژەهرداری کوژەر، وە لە هەموو چاوێکی زیان بەخش، وە دەیفەرموو: بێ گومان بەم شێوەیە باوکتان (ئیبراهیم) ئیسحاق و ئیسماعیلی دەپاراست و پەنا دەدا.**

## فەرمان کردن بە منداڵ لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بە نوێژ کردن

عن عَمْرِو بْنِ شُعَيبٍ، عن أبيه، عن جَدِّهِ، قال: قال رسول الله(ﷺ): مُرُّوا أولادَكُم بِالصَّلاةِ وهم أبناءُ سَبْعِ سِنِينَ، واضْرِبُوهُم عليها وهُم أبْناءُ عَشْرِ سِنِينَ، وفَرِّقُوا بَينهُم في الْمَضَاجِعِ. حسن صحيح: رواه أبوداود(٤٩٥).

**واتە: فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژکردن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، وە لە تەمەنی دە ساڵیدا لەسەر نوێژ لێیان بدەن، وە جێگەی نوستنیان لە یەکتری جیا بکەنەوە.**

## سوود:

١- منداڵ ئەگەر پێش باڵغ بوونی گوناح بکات لەسەری نانوسرێ، بەڵام ئەگەر چاکە بکات بۆی دەنووسرێ، وە ئەگەر تووشی نەخۆشی و ناڕەحەتی بێت بۆی بە چاکە دەنووسرێ، وە بۆ دایك و باوکیشی بەهۆی سەبر گرتنیان.

٢- کوڕێك تەمەنی بگاتە (١٠) ساڵ درووست نییە لەیەك پێخەفدا لەگەڵ دایك و خوشکیدا بخەوێ، بەڵام لەمە کەمتر درووستە، وە هەروەها درووستە هەموویان لەیەك ژوور بخەون بەڵام جێگەیان جیا بێت.

٣- ئەگەر منداڵەکەت پشت گوێ بخەی و زوو پەروەردەی نەکەی, دوور نییە لە پاشان پەروەردە کردنی قورس بێت و پێیەوە گرفتار بیت، جا ئاگادار بە.

٤- ئەگەر تۆ منداڵەکەت فێری ئایین و نوێژ و قورئان خوێندن و زیکر بکەی یا رێگای نیشان بدەی بۆ ئەمانە ئەوە ئەو کاتە ئەو منداڵە لە هەموو ژیانیدا چی ئەنجام بدات لە چاکە بۆ تۆش دەنوسرێ .

# باسی قورئان خوێندن

**پێشەکیەك:**

نەوەوی لە کیتابی (أذكار/١٢١) دا دەڵێ: (إعلم أنّ تلاوة القرآن هي أفضل الأذكار) واتە: بزانە بێ گومان خوێندنی قورئان گەورەترین زیکرە، وە دەڵێ: (ينبغي أن يحافظ على تلاوته ليلاً ونهاراً سفراً وحضراً) واتە: دەبێ پارێزگاری لە خوێندنی قورئان بکات بە شەو و بە رۆژ لەو کاتەی کە لەماڵەوەیە وە لەو کاتەش کە لە سەفەردایە.

وە دەڵێ: (إعلم أن أفضل القراءة ما كان في الصلاة) ومذهب الشافعي وآخرين أن تطويل القيام في الصلاة بالقراءة أفضل من تطويل السجود وغيره) واتە: بزانە باشترین خوێندنی قورئان ئەوەیە کە لەناو نوێژدا بیخوێنێ، مەزهەبی شافیعی و ئیتریش لەسەر ئەوەن درێژ کردنەوەی وەستان لە نوێژ و خوێندنی قورئان تیایدا باشترە لە درێژکردنەوەی سەجدەو غەیری سەجدە.

عن أبي جعفر قال: (من قرأ القرآن قائماً في صلاته كتب الله له بكل حرف مائة حسنة، ومن قرأ في صلاته جالساً كتب الله له بكل حرف خمسين حسنة ومن قرأه في غير صلاته كتب الله له بكل حرف عشر حسنات) واتە: هەر یەکێك قورئان بخوێنێ لە نوێژەکەی بە وەستاوی خودا بە خوێندنی هەر پیتێك (١٠٠) خێری بۆ دەنووسێ، وە هەر یەکێك لە نوێژدا بیخوێنێ بەدانیشتوویی خودا بە خوێندنی هەر پیتێك (٥٠) خێری بۆ دەنووسێ، وە هەر یەکێك لە غەیری نوێژدا بیخوێنێ خودا بە خوێندنی هەر پیتێك (١٠) خێری بۆ دەنووسێ.

بەندەی من بەردەوام بە هۆی سوننەتەکانەوە لێم نزیك دەبێتەوە هەتا خۆشم دەوێ، جا کاتێك کە خۆشم ویست دەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێ و ئەو چاوەی کە پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە پێی لێ دەدا وە ئەو قاچەی کە پێی دەڕوا، وە ئەگەر داوای شتێکم لێ بکات دەیدەمێ وە ئەگەر خۆی پێم بپارێزێ بێگومان دەیپارێزم، وە من لە کردنی هیچ شتێك وەك ئەوە سێ و دوو ناکەم کە لە کێشانی گیانی ئیمانداردا سێ و دوو دەکەم چونکە ئەو حەزی لە مردن نییە و منیش بێ دڵی ئەوم پێ ناخۆشە.

**سوود**:

١-وەك گوتمان(ولي) واتە:(المؤمنُ التَّقِي) یانی: ئیماندارێکی پارێزگار(متقي). وە پارێزگاریش ئەوەیە ئەوەی لە سەری واجبە دەیکاو جێبەجێی دەکا وە ئەوەی لە سەری حەرامە خۆی لێ دەپارێزێ.

## چۆن دوعات قەبول دەبێت

### ١- پەلە نەکردن لە قەبول بوونی دوعادا:

١-عن أبي هريرة عن النبيّ(ﷺ): أنَّهُ قال: لا يزالُ يُستَجابُ لِلعبد ما لم يَدعُ بإثمٍ أو قطيعةِ رَحِمٍ ما لم يَستعجِل. قِيل يا رسول الله ما الإستعجالُ؟ قال: يقول قد دعوتُ وقد دعوتُ فلَم أرَ يَستَجيبُ لي فَيستَحسِرُ عند ذلك ويدعُ الدُّعاء. رواه مسلم(٢٧٣٥).

واتە: بەردەوام وەڵامی(پاڕانەوەی) بەندە دەدرێتەوە بە مەرجێ داوای شتێکی گوناح نەکات یا خزمایەتی پچراندن مادام پەلە نەکات،

گوترا ئەی پێغەمبەری خوا پەلە کردن چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە بڵێ پارامەوەو پارامەوە پێم وانییە کە وەڵامم بداتەوە، ئەوجا لە پارانەوە واز دێنێ و کۆڵ دەدات.

## ٢- نەخواردنی حەرام:

**1**-عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : إنَّ اللهَ تعالى طيِّبٌ لا يَقبلُ إلا طيِّباً ، وإنَّ اللهَ تعالى أمرَ الْمُؤمنينَ بما أمرَ به الْمُرسلين ، فقال :( **ياأيها الرُّسُلُ كُلُوا من الطَّيِّبات واعْمَلُوا صالحاً** ) ( المؤمنون : ٥١ ) ، وقال تعالى :( **ياأيها الذين آمنوا كُلُوا من طيِّبات ما رَزَقْناكُم**) ( البقرة : ١٧٢ ) ، ثم ذَكَرَ الرجلَ يُطيلُ السفرَ : أشْعثَ أغْبَر ، يَمُدُ يَديْهِ إلى السماء : يا ربِّ يا رب ، ومَطْعمُه حرام ، ومَشْربُه حرام ، ومَلْبسُه حرام ، وغُذِيَ بالحرام ، فأنَّى يُستجابُ لذلك ؟ . رواه مسلم(١٠١٥)

طيب: أى طاهر منزهٌ عن النقائص والطيب من اسماء الله الحسنى، واتە: پاك و دوور لەکەم و کوری وە(طيب) یەکێکە لە ناوەکانی خودا.

ماناى فەرموودەكە: ئەی خەڵکینە بێگومان خودا پاك و بێ عەیبە ئەوەی پاك و حەڵاڵ و خاوێن نەبێ وەری ناگری وە خوا بەوەی کە فەرمانی پێ بە پێغەمبەران کردووە فەرمانیشی پێ بە بڕواداران کردووە خودا فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا ﴾ (المؤمنون: ٥١) واتە: (ئەی پێغەمبەران بخۆن لە خواردەمەنی حەڵاڵ و پاك وە کردەوەی باش بکەن ) وە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ

﴿ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾ (البقرة: ١٧٢) واتــه : (ئــەی ئەوانــەی بڕواتان هێناوه لەو ڕۆزیه پـاك و چـاكانه بخـۆن كـه پێمـان بەخشـیون)، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێكی كرد كه سەفەری درێـژ دەكـات(بۆ حەج و سەردانی خزمان و خوا پەرستی تـر) سـەرو ریـش ئـاڵۆزو تـەپ و تۆزاوی، هەردوو دەستی بەرەو ئاسمـانیٚ بـەرز دەكاتـەوەو دەڵـیٚ: ئـەی پــەروەردگارم ئــەی پــەروەردگارم! بــەڵام خواردنەكــەی حەرامــەو خواردنەوەكـەی حەرامـەو پۆشـاكەكەی حەرامـە وه هـەر بـە حـەرامیش بەخێوكراوه , جا چۆن ئەم جۆره كەسه دوعای قەبول دەبیٚ؟

**سوود**:

**١- قيل لِسعد بن أبي وقاص: تُستجابُ دَعْوَتُكَ من بين أصْحاب رسولِ الله(ﷺ) فقال: ما رفعتُ إلى فمي لقمةً إلاّ وأنا عالمٌ من أينَ مَجيئها ومن أين خَرَجَت[1].**

واتــه: بـه ســەعدی كـوڕی أبـو وقــاص گـوترا بـۆ تـۆ لـه نێـوان ئەصحابەكانی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) دوعات قەبول دەبێـت ؟ فەرمووی: هیچ لوقمەیەكم بۆ دەمم بـەرز نەكردۆتـەوه ئـیللا زانیومـه لـه كویٚ هاتوەو له كویٚ دەرچووه.

**٢- عن يوسف بن أسباط قال: بَلَغَنا أن دعـاء العبـد يُحبَسُ عـن السماوات بسوء المطعم[2].**

---

(١) جامع العلوم والحكم.

(٢) جامع العلوم والحكم.

واتە:یوسفی کوڕی ئەسبات دەڵێ: پێمان گەیشتووە دوعاو پارانەوەی عەبد حەپس دەکرێ لە ئاسمانەکان بە هۆی خراپی خواردنەوە.

**٣- عن وهب بن مُنَبِّه قال: من سَرَّهُ أن يستجيب الله دعوتَهُ فَلْيطب طعمتهُ[١].**

واتە: وەهبی کوڕی مونەببیە دەڵێ: هەر یەکێك پێی خۆشە کە خوا دوعاکانی قەبول بکات با خواردنی حەڵاڵ بخوات.

**٤- عن سهل بن عبدالله قال: من أكل الحلال أربعين صباحاً اُجيبت دعوتهُ[٢].**

واتە: سەهل دەڵێ: هەر یەکێك چل ڕۆژان خواردنی حەڵاڵ بخوات دوعای قەبول دەبێت.

## ٣- بەجێ هێنانی فەرزو سوننەت:

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الله قال: مَنْ عادى لي وَليّاً فقَد آذَنْتُهُ بالحرب، وما تَقرَّبَ إلي عبدي بشيءٍ أحَبَّ إليَّ مِمّا افْتَرَضْتُهُ عليه، وما يزالُ عبدي يَتَقرَّبُ إليَّ بالنَّوافِل حَتى أُحِبَّهُ فإذا أحبَبْتُهُ كنتُ سمعهُ الذي يَسمَعُ بهِ وبَصرَهُ الذي يَبصُر بِهِ، ويَدهُ التي يَبْطِشُ بِها ورِجْلَهُ التي يَمشي بِها، وإنْ سَألَني لأُعطِيَنَّهُ، ولَئِنْ اسْتَعاذني لأُعيذَنَّهُ وما ترددتُ عن شَيءٍ أنا فاعِلُهُ تَرَدُّدي عن نفس المُؤمِن يَكرَهُ المَوتَ وأنا أكرهُ مَساءَتَهُ. رواه البخاري(٦٥٠٢).

---

(١) جامع العلوم والحكم.

(٢) جامع العلوم والحكم.

**الـولـي** : هو المؤمن التَّقي، واتة:(ولي) يـانى: ئيمانـدارێكى پارێزكـارو (مُتَّقي).

**آذنتـه** : واتـه: أعلمته بأَني محارب له، يانى: ئاگادارى دەكەمـەوە كـە من خۆم جەنگى لەگەڵدا دەكەم.

**النوافل** : سوننەتەكان، وەك: نوێژى سوننەت، رۆژى سوننەت.

**إستعاذ** : خۆى پاراست، پەناى گرت.

**ماناى فەرموودەكە:**

پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويـەتى: خـودا فەرموويـەتى: هـەر كەسـێك دوژمنايەتى بكات لەگەڵ دۆستێكى مندا ئاگادارى دەكەمەوە كە من خۆم جـەنگى لەگەڵدا دەكـەم، وە بەنـدەى مـن بـە هـيچ شـتێك لـە مـن نزيـك نابێتـەوە كـە خۆشەويسـت تـر بـێ لام لـەوەى كـە لـە سـەرم پێويسـت كردووە، وە بەندەى من بەردەوام بـە هـۆى كردنـى سـوننەتەكانەوە لـێم نزيك دەبێتەوە هەتا خۆشم دەوێ، جا ئەگەر خۆشـم ويسـت دەبمـە ئـەو گوێيەى كە پێى دەبيستێ و ئەو چاوەى كە پێى دەبينێ و ئەو دەستەى كە پێى لێ دەدا وە ئەو قاچەى كە پێى دەڕوا، وە ئەگـەر داواى شـتێكم لێ بكات دەيدەمێ , وە ئەگەر خۆى پـێم بپـارێزێ بێگومـان دەيپـارێزم، وە من لە كردنى هيچ شتێك وەك ئەوە سێ و دوو ناكەم كـە لـە كێشـانى گيانى ئيمانداردا سێ و دوو دەكەم , چونكە ئەو حەزى لـە مـردن نييـەو منيش بێ دڵى ئەوم پێ ناخۆشە.

**سوود:**

١-وەك گوتمان(ولي) واته:(المؤمنُ التَّقِي) يانى: ئيماندارێكى

پارێزگار(متقي). وه پارێزگاریش ئەوەیە ئەوەی لە سەری واجبە دەیكاو جێبەجێی دەكا وە ئەوەی لە سەری حەرامە خۆی لێ دەپارێزێت.

## ٤- پاڕانەوە لەكاتی خۆشیدا:

عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) : (مَن سَرَّهُ أَن يَستجيبَ اللهُ لَهُ عند الشدائدِ والكُربِ فَلْيُكثرِ الدُّعاءَ في الرخاء) حسن رواه الترمذي (٣٣٨٢).

واتە: هەر یەكێك پێی خۆشە كە خوا لە كاتی سەختی و خەمدا وەڵامی دوعاكانی بداتەوە با لەكاتی خۆشیدا زۆر دوعا بكات.

## دەست نوێژو دەست بەرز كردنەوە سوننەتە لەكاتی دوعادا

١- عن سلمان قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ رَبَّكُم تبارك وتعالى حَيِيٌّ كريمٌ يَستَحْيِي مِن عبدهِ إذا رفَعَ يديهِ إليهِ انْ يَرُدَّهما صِفراً. صحيح: رواه ابوداود(١٤٨٨) والترمذي(٣٥٥٦).

واتە: بێگومان پەروەردگارتان(تبارك وتعالى) بەشەرم بەخشندەیە، شەرم دەكات لە بەندەی خۆی ئەگەر دوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە بۆ لای ئەو بە بەتاڵی بیانگێڕێتەوە.

**سوود**: ناوی(حَيِيّ) ئەوە ناوو سیفەتی خوایە، جیایە لەگەڵ(حَيّ) كە ئەمەش یەكێكی ترە لە ناو و سیفەتەكانی خوا، ئی یەكەمیان واتە: بەشەرم , بەلام دووەمیان واتە: زیندوو، ئی یەكەمیان سێ یائی هەیە , ئی دووەمیان دوو یائی هەیە.

٢- عن أبي موسى قال: دعا النبي (ﷺ) بماءٍ فَتوضأَ، ثم رفَع يَدَيه

فقال: (أللهم اغْفر لِعُبيدٍ أبي عامرٍ) ورأيتُ بَياض إبْطيهِ، فقال: (أللهم اجعلهُ يومَ القيامةِ فوقَ كثير مِن خَلقِكَ مِن الناس) رواه البخاري (٦٣٨٣).

**واته: پێغەمبەر (ﷺ) داوای ئاوی کردو دەست نوێژی گرت، له پاشان دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: (ئەی خوایه له عوبەید باوکی عامر خۆش بە، ئەبو موسا دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە دەستەکانی بەرز کردبۆوە تا سپیایەتی هەردوو بن هەنگڵیم بینی، جا فەرمووی: ئەی خودایه له رۆژی قیامەتدا پلەی لە زۆر لە دروست کراونت لە خەڵکی بەرزتر بکەوە.**

## سوود:

**١- ابن حجر له (تدریب الراوی) دا دەڵێ: نزیکەی سەد فەرموودە هاتووە دەربارەی دەست بەرز کردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) له دوعادا.**

**٢- (ابن تیمیه) دەڵێ: ئەوەندە فەرموودە هاتووە دەربارەی دەست بەرزکردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) له دوعادا که له ژماره نایەن.**

**٣- سوننەته که دوعا دەکەی بەدەست نوێژەوە بێت هەروەکو لە فەرموودەکەدا هاتووە.**

# به نهێنی دوعا کردن

**خوا دەفەرمووێ:** ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٥٥﴾ (الأعراف: ٥٥)، **واته: بە ملکەچی و پەنهانی لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە بەڕاستی ئەو (خوا) سنوور بەزێنانی خۆشناوێن.**

پاڕانـەوە لـە خـوا بـە نهێنـی نـزیکترە لـە (إخـلاص) ، خـوای گـەورە دەربارەی پاڕانەوەی زەکەریا دەفـەرمووێ: ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ۝٣﴾ (مريم: ٣)، واتـە: لـە کاتێکـدا پاڕایـەوە لـە پـەروەردگاری بـە پاڕانەوەیەکی نهێنی و پەنامەکی . هەندێك لە (مُفسرين) دەڵێن زەکـەریا بۆیە بە نهێنی داوای کردیەو پاڕاوەتەوە لەبەر (إخلاص).

## چەند دوعایەك لە قورئاندا

١- ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾ (البقرة: ٢٠١).

**واتە: پەروەردگارمان لە دونیادا چاکەو لـە دوارۆژیشـدا چـاکەمان پـێ ببەخشە وە بمان پارێزە لە سزای ئاگر.**

٢- ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٠﴾ (الحشر: ١٠)، واتە: ئەی پەروەردگارمان لێمان خۆش بـە ، وە لـەو برایانـەشمان کە پێشمان کەوتوون لە ئیمان هێناندا، وە هیچ رق و کینەیـەك مەخـەرە دڵمانـەوە دەربـارەی بـاوەڕداران، ئـەی پـەروەردگارمان بەڕاسـتی تـەنها ئەتۆی ئەوپەڕی بەڕەحم و میهرەبان.

٢- ﴿ وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ (المؤمنون: ١١٨).

**واته : (ئەی موحەمەد) (ﷺ) بلّیٚ ئەی پەروەردگارم لیٚم خۆش بەو رەحمم پیٚ بکە.**

**سوود:**

**هەر فەرمانیٚك بۆ پیٚغەمبەر هاتبیٚت لە قورئاندا ئەوە بۆ ئیماندارانیشە تەنها کاتیٚك نەبیٚت کە بەڵگەیەك هەبیٚت تایبەتی بکات بە ئەو.**

٤- ﴿ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ (الفرقان: ٧٤).

**واتە: ئەی پەروەردگارمان پیٚمان ببەخشە لە خیٚزانەکانمان و نەوەکانمان (منداڵەکانمان) ئەوەی چاوانی پیٚ گەش بیٚ هۆی دڵ خۆشی بیٚت وە بمانگیٚرە بە پیٚشەنگ بۆ پاریٚزگاران.**

٥- ﴿ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ٩٧ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحۡضُرُونِ ﴾ (المؤمنون: ٩٧ - ٩٨).

**واتە: وە بلّیٚ ئەی پەروەردگارم خۆن دەپاریٚزم بەتۆ لە خەتەرەو وەسوەسەی شەیتانەکان (٩٧) وە پەنات پیٚ دەگرم لەوەی (شەیتانەکان) ئامادەبن لام (٩٨).**

٦- ﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ ﴾ (إبراهيم: ٤١)

**واته: ئەی پەروەردگارمان لە من و دایکم و باوکم و بڕواداران خۆش بە لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێ.**

٧- ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾ (آل عمران: ٨).

**واته: ئەی پەروەردگارمان دڵەکانمان لە ڕێی ڕاست لامەدە دوای ئەوەی کە ڕێنموێنیت کردین , وە پێمان ببەخشە لەلای خۆتەوە بەزەییەك بەڕاستی هەر تۆی زۆر بەخشندە.**

٨- ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾ (الإسراء: ٢٤).

**واته: وە بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە (بە دایك و باوکم) هەر چۆنی ئەوان منیان پەروەردەکرد بە منداڵی.**

٩- ﴿ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ ﴾ (الفرقان: ٦٥).

**واته: ئەی پەروەردگارمان سزای دۆزەخمان لێ لادە بەڕاستی سزای ئەو لانەچووی بەردەوامە.**

# هەندێ لە دوعاو پاڕانەوە لە فەرموودەدا

١-عن أنس قال: كانَ أكثرُ دعاءِ النبيِّ(ﷺ): أللهمَّ ربّنا آتنا في الدُّنيا حسنةً وفي الاخرةِ حسنةً وقِنا عذابَ النار. رواه البخاري(٦٣٨٩) ومسلم(٢٦٩٠).

واتـــە: ئەنـــەس دەڵـــێ: زۆربـــەی پاڕانـــەوەی پێغەمبـــەر(ﷺ) ئەوەبوو(أللهمَّ ربّنا آتنا في الدُّنيا حسنةً وفي الاخرةِ حسنةً وقِنا عذابَ النار).

**سوود:**

١-موسلیم لە ریوایەتێکی تردا ئەم دوعایەی ریوایەت کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ گوتنی(اللهم) , ئەمیش هەر لە فەرموودەی ژمارە(٢٦٩٠).

٢- ئەم دوعایە گشت گیرە(حسنە) لە دونیادا واتە(كل ما يَسرُّ ولا يضر) هەموو شتێکە کە کەیف خۆشت دەکات و زیانی نییە بۆت لە ئافرەتی چاك و منداڵی باش و لەش ساغی و زانست و عیبادەت و رسقی حەلال و ......

٣- **ماناى دوعاكە:** ئەی خودایە پەروەردگارمان لە دونیادا چاکەو لە دوا رۆژیش چاکەمان پێ ببەخشە وە بمانپارێزە لە ئازاری ئاگر(ی دۆزەخ).

٢- عن ابي مالك الأشجعي عن أبيه(رضي الله عنهما) قال: كانَ الرَّجُلُ إذا أسلمَ علَّمَهُ النبيُّ(ﷺ) الصلاة، ثُمَّ أَمَرَهُ أنْ يَدعُوَ بِهؤُلاء

الكلمـاتِ(اللهمَّ اغفِـر لـي وارحَمنـي واهـدني وعـافني وارزقنـي). رواه مسلم(٢٦٩٧).

**واته: باوكی مالكی ئەشجەعی(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: جاران كە پیاوێك موسڵمان دەبوو پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی فێردەكرد , لە پاشان ئەمری پێ دەكرد كە ئەم ووشانە بڵێ:( اللهمَّ اغفِر لي وارحَمني واهدني وعافني وارزقني) واتە: ئەی خودایە لە گوناحم خۆش بە وە ڕەحمم پێ بكە وە ڕێنمونیم بكە وە سەلامەتم بكە وە ڕۆزیم بدە.**

٣- عن شَكَلِ بن حميد(رضي الله عنه) قال: قلتُ يا رسول اللهِ عَلِّمني دعاءً قال: قُلْ:: أللهمَّ إني أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعي، ومنْ شَرِّ بَصري، ومنْ شَرِّ لِساني، ومن شَرِّ قَلْبي، ومن شَرِّ مَنِيِّي. صحيح: رواة أبو داود (١٥٥١) والترمذي (٣٤٨٧)

**واته: شەكلی كوڕی حمید(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا دوعایەكم فێر بكە؟ فەرمووی بڵێ:(اللهمَّ إني أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعي، ومنْ شَرِّ بَصري، ومنْ شَرِّ لِساني، ومن شَرِّ قَلْبي، ومن شَرِّ مَنِيِّي).**

**واته: ئەی خودایە من خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەڕی گوێم، وە لە شەڕی چاوم، وە لە شەڕی زمانم، وە لە شەڕی دڵم، وە لە شەڕی داوێنم.**

٤- عن العباس بن عبدالمطلب(رضي الله عنه) قال: قلت يا رسول الله عَلِّمني شيئاً اسألُهُ الله، قال:(سَلِ الله العافيةَ) فَمكثتُ أيّاماً ثُمَّ جئتُ فقلتُ: يا رسول اللهِ عَلِّمني شيئاً أَسأَلُهُ الله؟ فقال لي: يا عباس يا عمَّ رسولِ الله سَلِ الله العافية في الدُّنيا والآخرة. صحيح: رواه الترمذي(٣٥١٤).

واته: عەبباسی کوری عبدالمطلب(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێر بکە کە داوای بکەم لە خوا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی داوای سەلامەتی و بێ وەیی بکە لە خوا، جا دەڵێ ماوەیەك مامەوە لە پاشان چوومەوە گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێر بکە کە داوای بکەم لە خوا؟

جا دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: ئەی عەبباس ئەی مامی پێغەمبەری خوا داوای سەلامەتی بکە لە خوا لە دونیاو لە دوارۆژدا.

**سوود**:ئەم دوعایە بەم شێوەیە بکە:( **اللهم إني أسألك العافية في الدنيا والاخرة**).

٥- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال كان رسول الله(ﷺ) يقول: أللهم أَصلِحْ لِي ديني الذي هُوَ عِصْمَةُ أَمري، وأَصْلِحْ لي دونيايَ التي فيها معاشي، وأَصلِحْ لِي آخِرَتي التي فيها معادي، واجْعلِ الحياةَ زيادةً لِي في كلِّ خَيرٍ واجعَلِ الموتَ راحةً لي مِنْ كُلِّ شَر. رواه مسلم(٢٧٢٠)

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ئەی خوایە ئەو دینداریيەمم بۆ چاك بكە كە مایەی ڕاوەستانی كاروبارمە، وە ئەو ژیانە دونیاییەمم بۆ باش بكە كە گوزەرانمی تێدایە، وە دوا ڕۆژم بۆ باش بكە كە بۆی دەگەڕێمەوە، وە ژیانم بۆ بگێرە بە مایەی زیاد بوونی هەموو چاكەیەك، وە مردنیشم بۆ بگێرە بە مایەی حەسانەوە لە هەموو شەرێ.

٦- عن عائشة(رضي الله عنها) انَّ النبيَّ(ﷺ) عَلَّمَها هذا الدُّعاء.

**واتــه: عائشــه(ڕەزای خــوای لــێ بێــت) دەڵــێ پێغەمبــەر(ﷺ) ئــەم پارانەوەی فێرکردووە:**

**أللهمَّ إنّي أسألك من الخير كُلِّهِ عاجله وآجله(١)ما علمتُ مِنهُ وما لم أعلم وأعوذ بِكَ مِنَ الشَرِّ كُلِّهِ عاجلهِ وآجلِهِ ما علمتُ منه وما لم أعلم. أللهم إني أسألك من خير ما سألك عبدك ونَبيُّكَ وأعوذ بك مِنْ شَرِّ ما عاذ مِنهُ عبدك ونبيُّك اللهم إنّي أسألك الجنّةَ وما قَرَّب اليها من قول وعمَل وأعوذ بِكَ من النار وما قَرَّبَ إليها من قولٍ أو عملٍ وأسألكَ أن تجعلَ كُلَّ قضاءٍ قَضيتهُ لي خيراً.** صحيح: رواه ابن ماجه(٣٨٤٦)

٧- عن عبدالله بن عمرو بن العاص قال: قال رسول الله (ﷺ) (**أللهم مُصرِّفَ القلوب صَرِّف قلوبنا على طاعتك**) رواه مسلم (٢٦٥٤).

**واتە: ئەی خودایە وەرگێڕی دڵەکان، دڵمان لەسەر گوێڕایەڵیت جێگیر بکە.**

---

(١) عاجله: ما يحصل مستعجلاً يريد خير الدنيا(اجله) ما يحصل مؤجلاً أي مُؤخراً يريد خير الاخرة.

٨- عن عبدالله بن عمر قال كان من دعاء رسول الله (ﷺ) : (أللهم إني أعوذ بك مِن زوالِ نعمتك، وتَحوُّلِ عافيتك، وفُجاءَةِ نِقْمَتِكَ، وجميع سَخَطِكَ) رواه مسلم (٢٧٣٩) وأبو داود (١٥٤٥).

**واته: (ابن) عومەر دەڵێ: لە دوعاكانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو دەیفەرموو: ئەی خودایە من خۆم دەپارێزم بەتۆ لە نەمانی نیعمەتت، وە لە گۆڕانی ئەم سەلامەتیەی پێت بەخشیوم، وە لە تۆڵەی کت و پڕت، وە لە هەموو ناڕەزاییەکت.**

٩- عن عائشة أن النبي (ﷺ) كان يقول في دعائه: (أللهم إني أعوذ بك مِن شَرّ ما عملت وشرِّ ما لَمْ أعمل) رواه مسلم (٢٧١٦).

**واته: عائشه دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە دوعاكانی دەیفەرموو: (ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەڕو خراپەی ئەوەی کە کردوومە وە لە شەڕی ئەوەش کە نەم کردووە.**

# زیکرەکانی خواردن و خواردنەوە

## * ناوی خوا هێنان لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا

ئیمام نەوەوی لە کیتابی (الأذكار) لاپەڕە (٢٦٤) دا دەڵێ: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە سوننەتە ناوی خوا بێنی لە سەرەتای خواردن ، بەڵام ئەگەر لە سەرەتادا نەیگوت بە ئەنقەست یا لەبیری نەبوو یان نەیانهێشت بیڵێ یان نەیووت لەبەر هۆیەکی تر لە پاشان توانی بیڵێ لە کاتی خواردنەکەی ئەوە سونەتە بڵێ (بسم الله أوَّلَهُ وآخِرهُ) , وە دەڵێ ناوی خوا هێنان بۆ خواردنەوەکان وەکو ناوی خوا هێنانە بۆ خواردنەکان، وە دەڵێ باشتر وایە بڵێ (بسم الله الرحمن الرحيم) ئەمە باشترە ، وە ئەگەر گوتیشی (بسم الله) بەسیەتی و سوننەتەکەی پێ پێك دێت.

بەڵام شێخ ئەلبانی دەڵێ: هەموو ئەو فەرموودانەی لەم بابە هاتوون باس لەوە دەکەن کە لەسەرەتای خواردن تەنها بڵێی (بسم الله) , وە دەڵێ نازانم هیچ فەرمودەیەك هاتبێ لەمە زیاتری تیادا هاتبێت، وە دەڵێ: زیاتر گوتن لە (بسم الله) لای زانایان بیدعەیە بەمانای بیدعە.

وە (عثيمين) دەڵێ: زانایان خیلافیان هەیە لەسەر گوتنی (بسم الله) لە سەرەتای خواردن , بەڵام قسەی ڕاست ئەوەیە کە واجبە بیڵێ ئەگەر لە سەرەتادا لە بیری کرد کەی بیری کەوتەوە لە کاتی خواردنەکەی دەڵێ (بسم الله أوَّلَهُ وآخِرهُ).

١-عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إذا دخَلَ الرَّجُلُ بيته فَذَكَرَ اللهَ عند دُخُوله وعند طعامه، قال الشيطانُ

لأَصحابِهِ: لا مَبيتَ لَكُم ولا عَشاءَ، وإذا دَخَلَ فَلم يَذكُر اللهَ عند دخوله قال الشيطان: أدركتُم المبيتَ، وإذا لم يذكر اللهَ عند طعامهِ قال: أَدركتُم المبيتَ والعَشاء. رواه مسلم(٢٠١٨).

عشاء: **جمع(أَعشية): طعام العشي: خواردنی ئێواره.**

**<u>واته:</u> هەر کاتێك پیاو چووه ماڵەوەو ناوی خوای هێنا له کاتی چوونه ژوورەوەو له کاتی نان خواردنیدا , شەیتان به هاورێکانی دەڵێ: نەشەو مانەوەو نەخواردنی ئێوارەتان بۆ هەیه، بەڵام ئەگەر چووه ماڵەوەو ناوی خوای نەهێنا له کاتی چوونه ژووریدا شەیتان دەڵێ: شەومانەوەتان دەست کەوت , وه ئەگەر ناوی خوای نەهێنا له کاتی خواردنیشیدا دەڵێ: شەو مانەوەو خواردنی ئێوارەتان دەست کەوت.**

**سوود:**

**١- له پێش دەست کردن به نان خواردن دەڵێی(بسم الله).**

**٢-که چوویته ماڵەوه دەڵێی (بسم الله ) .**

٢- عن أبي حفص عمر بن ابي سَلمة عبدالله بن عبدالأسدِ رَبيب رسول الله(ﷺ) قال: كُنْتُ غلاماً في حِجْرِ رسول الله(ﷺ) وكانت يَدي تطيشُ في الصَّحْفَةِ فقال لي رسول الله(ﷺ): يا غلام سَمِّ اللهَ تعالى وكُلْ بِيمينِك وكُلْ مِمّا يَليكَ، فما زالت تلك طِعمَتي بَعدُ. رواه البخاري(٢٣٧٦) ومسلم(٢٠٢٢).

**١-عومەر کوڕی أبوسەلەمە: کوڕی(ام سلمه)ی خێزانی پێغەمبەره(ﷺ) که دەکا زڕ کوڕی پێغەمبەر(ﷺ).**

٢- ربيب رسول الله: واتــه(ولدُ زوجتـهِ) يـانى منـدالّى خێزانـى پێغەمبەر(ﷺ).

٣- غلاماً: واته بالغ نەبووبووم، مندالّ لەو كاتەى كە لە دايك دەبىّ تا ئەو كاتەى بالغ دەبىّ پێى دەوترىّ(غلام).

٤- في حجرِ رسول الله: لـە ژێـر پارێزگـارى و چـاودێرى پێغەمبـەر دابووم(ﷺ).

٥- تطيش: دەڵێى(طاش السهم عن الهدف أي عدل) واتـە: تيرەكـە لـە هەدەفەكـەى لادا،(تطيش) واتـە: دەسـتم دەگێـرا بـەم لاو ئـەولادا تـەنها لەيەك شوێن نەم دەخوارد.

٦- الصَّفحة: لەگەن.

## ماناى فەرموودەكە:

عومـەرى كـورى ئـەبو سـەلەمە(رەزاى خـواى لـىّ بێـت) كـە منـدالّى خێزانى پێغەمبـەرە(ﷺ) دەڵـىّ: مـن منـدالّ بـووم لـە ژێـر پارێزگـارى و چاودێرى پێغەمبەردا بووم(ﷺ) جـا كـە نـانم دەخـوارد دەسـتم دەگێـرا بەناو لەگەنەكەدا , پێغەمبەر(ﷺ) پێى فەرمووم: ئەى رۆڵە:(كە نانەكـە دەخۆى) ناوى خـواى بـەرز بێنە(واتـە بڵـىّ: بسـم الله) , وە بە(دەسـتى) راستەت بخۆ , وە لە پێش خۆتـەوە بخـۆ، جـا عومـەر(رەزاى خـواى لـىّ بێت) دەڵێ: ئيتر لەوساوە تا ئێستا هـەر بـەم شـێوەيە نـان دەخۆم(كـە پێغەمبەر فێرى كردووم).

## ئەگەر لە سەرەتادا لەبیری نەبوو ناوی خوا بێنێ چی دەڵێ:

٢- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله(ﷺ): إذا أكل أحَدُكم فَلْيذكُرِ اسْمَ الله تعالى فإنْ نَسِيَ أنْ يَذكُرَ اسمَ الله تعالى في أوَّلِهِ فَلْيَقُلْ: بسمِ اللهِ أَوَّلَهُ وآخِرَهُ. صحيح رواه ابوداود(٣٧٦٧) والترمذي(١٨٥٨).

**واتە: ئەگەر یەکێکتان خواردنی خوارد با ناوی خوای بەرز(لە سەرەتاوە) بێنێ جا ئەگەر لە بیری چوو کە لە سەرەتاوە ناوی خوای بەرز بهێنێ بابڵێ(بسم الله أَوَّلَهُ وآخِرَهُ) واتە: بەناوی خوا لە سەرەتاو کۆتاییەوە.**

٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – كَانَ يَشْرَبُ فِي ثَلَاثَةِ أَنْفَاسٍ . إِذَا أَدْنَى الْإِنَاءَ إِلَى فِيهِ سَمَّى اللهَ ، فَإِذَا أَخَّرَهُ حَمِدَ اللَّهَ ، يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ . حسن :رواه الطبراني في الاوسط (٨٢٥٩) قال الحافظ في الفتح اسناده حسن ,وانظر الصحيحة للالباني (١٢٧٧) .

**واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بە سێ نەفەس خواردنەوەی خواردۆتەوە، کاتێك جامەکەی لە دەمی نزیك بکردایەوە ناوی خودای دەهێنا (بسم الله)، وە کاتێکیش لە دەمی دووری خستبایەوە سوپاسی خوای دەکرد، وە ئەمەی سێ جار دووبارە کردۆتەوە.**

**سوود: کەواتە لەم فەرموودەیەدا ئەمە بەدەر دەکەوێ کە پێغەمبەر (ﷺ) کە خواردنەوەی خواردۆتەوە سێ جار (بسم الله) ی کردووە، سێ جار سوپاسی خوای کردووە، سێ جاریش هەناسەی داوە لە دەرەوەی جامی خواردنەوەکە.**

# ئەگەر ناوی خوات نەهێنا لەکاتی خواردن شەیتان دەتوانێ لەگەڵت بخوا

١- عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ كُنَّا إِذَا حَضَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا لَمْ نَضَعْ أَيْدِيَنَا حَتَّى يَبْدَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَضَعَ يَدَهُ وَإِنَّا حَضَرْنَا مَعَهُ مَرَّةً طَعَامًا فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ كَأَنَّهَا تُدْفَعُ فَذَهَبَتْ لِتَضَعَ يَدَهَا فِي الطَّعَامِ فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهَا ثُمَّ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ كَأَنَّمَا يُدْفَعُ فَأَخَذَ بِيَدِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لَا يُذْكَرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ لِيَسْتَحِلَّ بِهَا فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا فَجَاءَ بِهَذَا الْأَعْرَابِيِّ لِيَسْتَحِلَّ بِهِ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِي مَعَ يَدِهَا .رواه مسلم (٢٠١٧) وابوداود (٣٧٦٦)

**واتە: حوزەیفە دەڵێ: ئێمە کاتێك ئامادە دەبووین لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر خواردنێك دەستمان بۆی نەدەبرد تاوەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پێنەکردبایەو دەستی لەسەر دانەنایە، وە ئێمە جارێکیان لەگەڵیدا لەسەر خواردنێك ئامادەبووین کچێکی گچکە هات دەتگووت پاڵ دەدرێ (ئەوەندە بەپەلە دەهات) ڕۆیشت بۆ ئەوەی دەست بخاتە ناو خواردنەکە، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی گرت و نەیهێشت دەستی بۆ ببا، لە پاشان عارەبەکی دەشتەکی هات دەتگوت پاڵ دەدرێ، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی گرت، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێ گومان شەیتان دەتوانێ لەم خواردنە بخوا کە ناوی خوای لەسەر ناهێندرێ، شەیتان ئەم کچۆڵەی هێنا بۆ ئەوەی بتوانێ خواردنەکە بخوا، بەلاّم من دەستم گرت، ئەوجا**

ئەو عارەبە دەشتەکیەی هێنا بۆ ئەوەی بتوانێ خواردنەکە بخوا منیش دەستم گرت، سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە دەستی شەیتان و دەستی کچەکە هەردووکیان لەناو دەستمدا بوون.

## خواردن و خواردنەوە بە دەستی ڕاستە

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: لِيأكُلْ أحَدُكُم بيمينهِ، ولْيَشربْ بيمينه، وليأخُذ بيمينهِ، ولْيُعْطِ بيمينهِ، فإنَّ الشَّيطانَ يأكلُ بِشمالِهِ، ويشربُ بِشمالِهِ، ويُعطي بشمالِهِ ويأخُذُ بشمالِهِ. صحيح رواه ابن ماجه(٣٢٦٦).

واتە: با هەر یەکێك لە ئێوە بە(دەستی) ڕاستەی بخوا، وە بە(دەستی) ڕاستەی بخواتەوە، وە بە (دەستی) ڕاستەی (شت) وەربگرێ , وە بە ڕاستەی (شت) بدات , چونکە شەیتان بەچەپەی دەخوا وە بە چەپەی دەخواتەوە وە بە چەپەی شت دەدات وە بە دەستی چەپەی وەردەگرێ.

٢- عن سَلَمَة بن الأكوع(رضي الله عنه) أن رجلاً أكل عند رسول الله(ﷺ) بشمالِهِ، فقال: كُلْ بيَمينِكَ قال: لاأَستَطيعُ، قال: لااسْتَطَعتَ! مامَنَعَهُ إلاّ الكِبْرَ! فما رَفَعَها إلى فِيهِ. رواه مسلم(٢٠٢١).

واتە: (سلمة) کوری ئەکەوەع(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیاوێك لای پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی خوارد بە دەستی چەپی، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: بەراستەت بخۆ، گوتی ناتوانم، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(دەنەتوانی) کابرا هیچ شتێ قەدەغەی نەکرد(کە بە دەستی راستی بخوا) خۆبەگەروە زانین نەبێ، (جا دوعاکەی پێغەمبەری (ﷺ) لێ قبول بوو) ئیتر جارێکی تر ئەو پیاوە نەیتوانی دەستی راستی بۆ دەمی ببات .

**سوود**:

را جیایی هەیە لە خواردن و خواردنەوە بە دەستی راستە، هەندێك دەڵێن بەدەستی چەپە خواردن و خواردنەوە مەكروهە حەرام نییە، (صەنعانی) لە (سبل السلام) دەڵێ جمهور لەسەر ئەوەن كە سوننەتە خواردن و خواردنەوە بەدەستی راستە، وە ئەوەویش لە شەرحی (صحيح مسلم)دا وا دەڵێ، (عثيمين) دەڵێ: خواردن بە دەستی چەپ ئەگەر عوزرت هەبێت هیچی تێدا نییە، بەلاّم بەبێ عوزر حەرامە، وە دەڵێ: (وانه يكسب [1]، إثماً بالشرب بها (بعني باليد اليسرى) واتە: ئەو كەسە گوناحی كردووە كە بە دەستی چەپ دەخواتەوە (الفتاوى المهمة/٧٢٧).

## خواردنی خواردن لە تەنیشتی قاپ و لای خۆت

١- عن أبي حفص عمر بن ابي سلمة عبدالله بن عبدالأسدِ رَبيب رسول الله(ﷺ) قال: كُنْتُ غلاماً في حِجْرِ رسول الله(ﷺ) وكانت يَدي تطيشُ في الصَّحْفَة فقال لي رسول الله(ﷺ): يا غلام سَمِّ الله تعالى وكُلْ بيمينِك وكُلْ مِمّا يَليكَ، فما زالت تلك طِعمَتي بَعدُ. رواه البخاري(٢٣٧٦) ومسلم(٢٠٢٢).

---

(١) صفة الصلاة للألباني، ١٦٧.

**<u>ماناى فەرموودەكە:</u>**

**عومەرى كورى ئەبو سەلەمە(رەزاى خواى لىّ بێت) كە مندالّى خێزانى پێغەمبەرە(ﷺ) دەلّىّ: من مندالّ بووم لە ژێر پارێزگارى و چاودێرى پێغەمبەردا بووم(ﷺ) جا كە نانم دەخوارد دەستم دەگێرا بەناو لەگەنەكەدا جا پێغەمبەر(ﷺ) پێى فەرمووم: ئەى رۆلّە:(كە نانەكە دەخۆى) ناوى خواى بەرز بێنە(واتە بلّىّ: بسم الله) وە بە(دەستى) راستەت بخۆ وە لە پێش خۆتەوە بخۆ، جا عومەر(رەزاى خواى لىّ بێت) دەلّىّ: ئیتر لەوساوە تا ئێستا هەر بەم شێوەیە نان دەخۆم(كە پێغەمبەر فێرى كردووم).**

٢- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) عن النبيِّ(ﷺ) قال: البَركة تَنْزِلُ وَسطَ الطَّعام، فَكُلوا مِنْ حافتيهِ ولا تأكلوا مِنْ وَسَطِهِ. صحيح رواه الترمذي(١٨٠٥).

**واتە: پیتو فەڕو بەرەكەت دێتەخوارەوە بۆ ناوەراستى خۆراك , جا لە لاكانو تەنیشتەكانى بخۆن و لە ناوەراستەكەى مەخۆن.**

## سوود:

١-البَركة: النماء والزيادة. **گەشەكردن و زیاد بوون.**

٢- من حافتيه: **من جوانب القصعه: لە لاكانى لەگەنەكە.**

**٣- امام شافعى(رەحمەتى خواى لىّ بێت) دەلّىّ:** فإن أَكَلَ مِمّا لا يليه

أو من رأس الطعام، أثم بالفعل الذي فعلهُ إذا كان عالماً[1].

**واتە: ئەگەر لە پێش خۆیەوە نەی خوارد یا لەسەری خواردنەکەی خوارد گوناهبار دەبێت بەو کارەی ئەگەر زانا بێت**

## ئەگەر لوقمەیەك لە خواردنەکەت کەوت چی دەکەی

١- عن جابر(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ الشَّيطان يَحْضُرُ أحَدَكُمْ عند كلِّ شيءٍ مِنْ شأْنِهِ حتى يَحْضُرَهُ عند طعامه فإذا سَقَطت لُقْمَةُ أحَدِكُم فَلْيأخُذها فَلْيُمِطْ ما كانَ بها من اذى ثُمَّ لِيأكُلْها ولا يَدعْها للشَّيطانِ فإذا فَرَغ فَلْيَلْعَقْ أصابِعَهُ فإنَّهُ لا يدري في أيِّ طعامِهِ البركَة. رواه مسلم(٢٠٣٣).

**واتە: بێ گومان شەیتان ئامادەی هەموو کاروبارێکی هەر یەکێك لە ئێوە دەبێت , تەنانەت ئامادە دەبێت لە لای نان خواردنیشتان , جا ئەگەر یەکێکتان لوقمەیەکی لێ کەوت با هەڵی بگرێتەوە جا هەر شتێك کە بەم لوقمەوە نوسابوو لێی لادا لە پاشان با بیخوات و بەجێی نەهێڵێت بۆ شەیتان , جا کە تەواو بوو لە نان خواردن با پەنجەکانی بلێسێتەوە چونکە بێگومان ئەو نازانێ بەرەکەت لە کام خواردنەکەیدایە.**

## عەیب نەگرتن لە خواردن

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: ما عابَ رسولُ اللهِ(ﷺ) طعاماً قطُّ، إن اشتهاهُ أكَلَهُ. وإنْ كَرِهَهُ تركَهُ. رواه البخاري(٥٤٠٩) ومسلم(٢٠٦٤).

---

(١) يكسب: بەدەست دێنێ.

**واته: پێغەمبەر(ﷺ) قەت عەیبی لە هیچ خواردنێك نەگرتووە , ئەگەر حەزی لێ کردبێ خواردوویەتی , وە ئەگەر حەزی لێ نەکردبایە وازی لێ هێناوە.**

## زیکری دوای خواردن

١- عن انس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله لَيرضى عن العبدِ أن يأكُلَ الأَكلَةَ فَيَحْمَدُهُ عليها، أو يشربَ الشَّربَةَ فَيَحمَدُهُ عليها. رواه مسلم(٢٧٣٤).

**واته: بێگومان خوا لە بەندە رازی دەبێت کە خواردنێك دەخوات ستایشی خوای لەسەر دەکات ,**

**یا خواردنەوەیەك دەخواتەوە ستایشی خوای لەسەر دەکات.**

٢- عن معاذ بن أنس(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ): مَنْ أكَلَ طعاماً فقال: الحمدُللهِ الذي أطعمني هذا ورزَقَنيهِ مِنْ غيرِ حولٍ منّي ولا قوةٍ , غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّم مِنْ ذَنبِهِ. حسن: رواه ابوداود(٤٠٢٣) والترمذي(٣٤٥٨).

**واته: هەر کەسێك خواردنێکی خوارد ئەوجا بڵێ**(الحمدُللهِ الذي أَطْعَمَنِي هذا ورزَقَنيهِ مِنْ غيرِ حولٍ مِنّي ولا قوةٍ) **خودا لە گوناهی پێشووی خۆش دەبێت.**

٣- عن أبي أيوب خالد بن زيد الأنصاري قال: (كان رسول الله (ﷺ) اذا أكل أو شَرِب قال: الحمدُ لله الذي أطْعَمَ وسَقى وسَوَّغَهُ وجَعَلَ لَهُ مخرجاً) صحيح: رواه أبو داود (٣٨٥١).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك خوردن یا خورادنەوەی بخواردبایە**

دەیفەرموو: ( الحمدُ لله الذي أطْعَمَ وسَقى وسَوَّغَهُ وجَعَلَ لَهُ مخرجاً) یانی: هەموو حەمدو باسکردنێکی بە چاکە بۆ خوایە ئەوەی کە خواردنی پێداین و ئاوی پێداین , وە ڕێگای چوونە ژوورەوەی لە قورگ ئاسان کردووە , وە شوێنی دەرچوونی بۆ داناوە.

## پاڕانەوەی میوان بۆ خاوەن ماڵ

١- (أللهم بارك لهم فيما رَزَقْتَهُمْ واغْفِر لهم وارْحَمْهم) رواه مسلم (٢٠٤٢) وأبو داود (٣٧٢٩).

واتە: ئەی خودایە بەرەکەت بخە ئەوەی کە پێتداون، وە لە گوناحیان خۆشبە، وە رەحمیان پێ بکە.

٢- (أللهم أطْعِمْ مَنْ أطْعَمَنِي وَاسْقِ مَنْ سَقاني) رواه مسلم (٢٠٥٥).

واتە: ئەی خودایە خواردن بدە بەوەی کە خواردنی پێداوم، وە ئاو بدە بەوەی کە ئاوی پێداوم.

## نەهی کراوە لە هەناسەدان لەناو خواردنەوەو وە فوو تێ کردن.

١- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أنّ النبيَّ(ﷺ) نهى أن يُتَنَفَّسَ في الإناءِ أو يُنْفَخَ فيهِ. صحيح رواه ابوداود(٣٧٢٨) والترمذي(١٨٨٨).

واتە: ابن عباس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لەوەی کە هەناسە بدرێتەوە لەناو جامی(خواردنەوە) یا فووی تیادا بکرێ.

٢- عن انس(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) كانَ يَتَنَفَّسُ في

الشـــرابِ ثلاثـــاً(يعني يتـــنفس خـــاج الإنـــاء). رواه البخـــاري(٥٦٣١) ومسلم(٢٠٢٨).

**واته: پێغەمبەر(ﷺ) لـە کـاتی خواردنەوەیدا سـێ جـاران هەناسـەی داوەتەوە لە دەرەوەی جامەکەدا.**

## خواردنەوە بە دانیشتنەوە باشترە

١-عـن ابـن عباس(رضـي الله عنهمـا) قـال: سـقيتُ رسـولَ الله(ﷺ) مِن زمزمَ فشرِبَ وهو قائمٌ. رواه البخاري(١٦٣٦( ومسلم(٢٠٢٧).

**واتە: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە ئاوی بیری زەمـزەمم دا بە پێغەمبەر(ﷺ) جا ئەو بە وەستانەوە خواردیەوە.**

٢- عن عمرو بن شُعيب عن أَبيه عن جدهِ(رضي الله عنـه) قـال: رأيتُ رسولَ الله(ﷺ) يَشربُ قائماً وقاعداً. حسن: رواه الترمذي(١٨٨٣).

**واتە:عــەمری کــوری شــوعەیب لــە باوکیــەوە ئــەویش لــە بــاپیری عــەمرەوە(رەزای خــوای لــێ بێــت) دەڵــێ: پێغەمبــەرم دیــت(ﷺ) خواردنەوەی خواردۆتەوە بە وەستانو بەدانیشتنەوە.**

٢- عـن أبـي هريرة(رضـي الله عنـه) قـال: قـال رسـول الله(ﷺ): لايَشْرَبَنْ أحدٌ مِنكُم قائماً فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئ. رواه مسلم(٢٠٢٦).

**واتە: با هەرگیز هیچ یەکێك لە ئێوە بـە پێـوە شـت نەخواتـەوە , جـا هەر یەکێك لە بیری کرد(بە پێوە خواردیەوە) با خۆی برشێنیتەوە.**

**سوود**:

**امـام نـووی لـه**(رياض الصالحين) **ناونیشـانی بابـەتێك بـەم شـێوەیە دەهێنـێ**(باب بيان جواز الشُّرب قائماً، وبيان أنَّ الأكمَلَ والأفضل الشرب قاعداً).

**واتە: دەرگای روونکردنەوەی ئەوەی کە جائزە خواردنـەوە بـە پێـوە بخورێتـەوە وە روونکردنـەوەی ئـەوەی کـە تـەواوترو باشـتر ئەوەیـە کـە خواردنەوە بە دانیشتن بخورێتەوە.**

## ئاوگێڕ لە دوای هەمووانەوە ئاو دەخواتەوە

١- عن أبي قتادة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: ساقي القومِ آخرُهُم. يعني: شرباً. صحيح: رواه الترمذي(١٨٩٤) وابوداود(٣٧٢٥).

**واتە: ئاوگێڕ لە ناو کۆڕدا خۆی لە پاش هەموویانەوە ئاو دەخواتەوە.**

**سوود**:

**امـام نـووی لـە**(رياض الصالحين) **بـۆ ئـەم فەرموودەیـە نـاو و نیشـانێك دەنووسێ دەڵێ**(باب استحباب كون ساقي القوم آخرهم شرباً).

**واتە: سوننەتە ئاوگێڕەکە خۆی لە پاش هەموویاندا بیخواتەوە.**

## سوننەتە ئەوەی خواردنەوەیەك دەخواتەوە لە پاشان بیدا بەوەی لای راستەی

عن أَنَس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دَارِنَا هَذِهِ فَاسْتَسْقَى فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً لَنَا ثُمَّ شُبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِنَا هَذِهِ

فَأَعْطَيْتُهُ وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ وَعُمَرُ تُجَاهَهُ وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ عُمَرُ هَذَا أَبُو بَكْرٍ فَأَعْطَى الْأَعْرَابِيَّ فَضْلَهُ ثُمَّ قَالَ الْأَيْمَنُونَ الْأَيْمَنُونَ أَلَا فَيَمِّنُوا قَالَ أَنَسٌ فَهِيَ سُنَّةٌ فَهِيَ سُنَّةٌ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ . رواه البخاري(٢٤٣٢) ومسلم(٢٠٢٩)

**واته: ئەنەس –خوا لێی رازی بێت– دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لامان لەمماڵەداو داوای خواردنەوەی کرد، جا ئێمەش مەڕێکی خۆمان بۆ دۆشی و لە پاشان شیرەکەمان تێکەڵ کرد لە ئاوی ئەم بیرەماندا ئەوجا پێمدا، لەم مەجلیسەدا ئەبو بەکر لەلای چەپی دانیشتبوو عومەر لە بەرامبەری بوو عارەبەکی دەشتەکی لەلای راستی بوو، جا کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لێی خواردەوو تەواو بوو، عومەر فەرمووی: ئەوە ئەبو بەکرە، بەلاّم پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە مابۆوە دای بە عارەبە دەشتەییەکە لە پاشان فەرمووی: ئەوانەی لای راستە حەقترن، ئەوانەی لای راستە حەقترن، ئاگادار بن لەلای راستە دەست پێ بکەن، جا ئەنەس سێ جاران گوتی ئەمە سوننەتە.**

# چی دەکەی ئەگەر گومانت هەبوو گۆشتێك ناوی خوا لەسەر سەر بڕینەکەی نەهێندرابێت

١ - عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّ قَوْمًا قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِلَحْمٍ لَا نَدْرِي ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا قَالَ سَمُّوا أَنْتُمْ وَكُلُوا وَكَانُوا حَدِيثَ عَهْدٍ بِالْكُفْرِ . صحيح :رواه ابن ماجة (٣١٧٤)

**واتە: عائشە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: خەڵكانێك ووتیان ئەی پێغەمبەری خوای کەسانێك گۆشتمان بۆ دەهێنن نازانین لە کاتی**

سەربڕینەکەی ناوی خوای لەسەر هێندراوە یان نا، فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لەسەر بێنن و بیخۆن، ئەوانەی گۆشتەکەیان دەهێنا تازە موسڵمان بوون.

## سوود:

١- هەندێك ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە (بسم الله) گوتن لە کاتی سەربڕین واجب نییە.

٢- زانایان لەسەر حوکمی ووتنی (بسم الله) لەکاتی سەربڕیندا قسەی زۆریان هەیە:

أ- هەندێك دەڵێن هەر سەربڕاوێك ناوی خوای لەسەر نەیەت جا بە ئەنقەست بێت یا لەبیری کردبێت ئەوە سەربڕاوەکە حەڵاڵ نییە ئەمانەش زۆرن کە وا دەڵێن.

ب- هەندێك دەڵێن ئەگەر بە ئەنقەست نەبوو لە بیری چوو بوو (بسم الله) بکات ئەوە سەر بڕاوەکە حەڵاڵە.

جـ- هەندێکیش دەڵێن (بسم الله) کردن لە کاتی سەربڕیندا سوننەتە لەوانە ئیمام شافیعی و پەیڕەوانی مەزهەبەکەی و ئی تریش، وە ئیمامی شافیعی مانای ئەم ئایەتە ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ﴾ (الأنعام: ١٢١)، دەڵێ: (على ما ذُبح لغير الله) یانی لەسەر ئەوانەی کە بۆ غەیری خوا سەربڕاون.

مانای ئەم بەشە ئایەتە ئەوەیە : (وە لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە (لەکاتی سەربڕیندا) وە بێ گومان

خـواردنی ئـەوە لـە ڕێ دەرچـوونە) وە هـەروەکو گوتیشـمان ئیمـامی شافیعی دەڵێ ئەوە ئەوانەن کە بۆ غـەیری خـوا سـەربڕاون، وە مـن بـۆ خۆم زۆر قەناعەتم بەم قسـەی سێیەم هەیـە، بـەڵام بـا موسـڵمان هـەوڵ بدات تا بۆی دەکرێ ناوی خوا ببات لەکاتی سەربڕیندا، وە بـۆ زیـاتریش سـەر لـە تەفسـیری (ابن کثیر) و (تەفسـیری قورئـانی بـەرزو بـەپێز) ی مامۆستا عەلی باپیر بدە بەرگی پێنجەم.

٣- پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەی (صحیح) دا هاتووە کە بـەرانێکی سەربڕیوە فەرموویەتی (بسم الله والله أکبر) وە دەتوانێ تەنها بڵـێ (بسـم الله) وە جۆری تریش دەبێت.

## خواردن بە پاڵ دانەوە مەکروهە

١- عن أبي جُحيفةَ يقولُ: قال رسول الله (ﷺ) (لا آكُلُ مُتكِئاً) رواه البخاري (٥٠٨٣) وأبو داود (٣٧٦٩).

واتە: ئەبو جوحەیفە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: من بە پـاڵ دانەوە نان ناخۆم.

**سوود**: (بەیهەقی) دەڵـێ: مەکروهـە خـواردن بـە پـاڵ دانـەوە (فـتح الباری)

# باسی سەلام

## پێناسەی (تحیة) و مانای (سەلام)

(تحية) سەرچاوە (مصدر)ە، لە زمانەوانیدا واتە (الدعاء بالحياة) دەڵێ ی (حيّاك الله) واتە: (أبقاك الله) یانی خوا بتهێڵێ خوا تەمەنت درێژ بکات، لە پاشان (تحية) یانی سڵاو بۆ هەموو ئەو شتانە گوترا کە لە کاتی بەیەکگەیشتن دەگوترێ لە دوعاو لە غەیری دوعا .

وە خوای گەورە جۆرە سەلامێکی بۆ موسڵمانان داناوە کە جیامان دەکاتەوە لە غەیری خۆمان، ئەوەی کە بەکاری بێنێ پاداشتی دەداتەوە وە بە مافێك لە مافەکانی موسڵمانی داناوە لەسەر براکەی لە کاتی بەیەك گەیشتن.

مانای (سلام) لە زاراوەدا لە رووی شەرعییەوە (قرطبي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: (و معنى (سلام عليكم) سلمكم الله في دينكم وأنفسكم) واتە: مانای (سلام عليكم) یانی: خوا دین و خۆتان سەلامەت بکات (بجیرمی) لە (حاشيته على المنهاج) دەڵێ: (معنى السلام على فلان طلب سلامته من النقائص) واتە: مانای (سلام) لەسەر فلان کەس یانی: داوای سەلامەتی کردنە لە کەم و کورتی.

کەواتە کە دەڵێ ی: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) واتە: خوا سەلامەتتان بکات رەحمتان پێ بکات بەرەکەتی خۆی بەسەرتاندا برێژێ.

# سەلام کردن سوننەتە وەڵامەکەی واجبە

خوا دەفـەرمووێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾ (النساء: ٨٦).

واتە: وە هەر کاتێك سڵاوتان لێ کـرا بـە (هـەر جـۆرە) سـڵاو کردنێـك ئەوە بە باشـتر لـە خـۆی سـڵاوی لـێ بکەنـەوە یـان وەك خـۆی وەڵامـی بدەنەوە , بێ گومان خوا لەسەر هەموو شتێك لێپرسەرەوەیە.

**سوود**:

١- لەم ئایەتـە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە وەڵامـی سـەلام وەکـو خـۆی واجبە بە باشتر سـوننەتە، کەواتـە ئەگـەر یـەکێك گـوتی: (السلام عليكم ورحمة الله) واجبـە لـە وەڵامـدا بڵێـی (عليكم السلام ورحمة الله) وە ئەگـەر (وبركاته) زیاد بکەی لە وەڵامەکەی ئەوە سوننەتە و باشترە.

٢- (نووی) لە کیتابی (الأذكار)دا دەڵێ:

سەلام کردن سوننەتە، وە ئەگەر سەلام لە یەك کەس کرا ئەوە فەرزی عەینە لەسەری کە وەڵام بداتەوە، بەڵام ئەگـەر سـەلام لـە کۆمـەڵێك کـرا ئەوە فەرزی (کیفایە)یە، ئەگەر یەکێکیان وەڵامی دایەوە ئـەوە واجبەکـە لەسـەر هومووییـان لادەچـێ، وە ئەگـەر هـەموویان وەڵام بدەنـەوە ئـەوە باشترە.

## چۆن سەلام دەکەی

**١- بڵێ** (السلام عليكم) **یا** (سلام عليك) **یا** (السلام عليك) **ئەوە سوننەتەکە جێبەجێ دەبێت، وە تۆش بڵێ** (وعليك السلام) **یا** (وعليكم السلام) یا (عليكم السلام) **ئەوە واجبە کە جێبەجێ دەبێت.**

**بەڵام (نووی) دەڵێ باشتر وایە بڵێی:** (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) **بەکۆ** (جمع) **بڵێ ی ئەگەر سلاو لێکراوەکەش یەك کەس بوو , وە وەڵام دەریش بڵێ:** (وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته).

**٢- زۆر خەڵك هەن کە سلاویان لێ دەکەی بە شێوەیەکی شەرعی وەڵامت نادەنەوە , بەم جۆرەش واجبەکەیان لەسەر شان لاناکەوێ.**

**٣- وە پێغەمبەر** (ﷺ) **نەهی لەوە کردووە کە بڵێی** (عليك السلام) **دەفەرمووێ ئەمە سەلامی مردووانە، بۆ ئەمە تەماشای فەرموودەی (٤٠٨٤) بکە لە (سنن أبو داود).**

**٤- (ئەلبانی) دەڵێ جائیز نییە لە یەکەم جار کە تۆ سەلام دەکەی لە** (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) **زیاتر بڵێی، بەڵام ئەگەر کەسێك بە تەواوی سەلامی لێ کردی گوتی:** (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) **تۆ دەتوانی (ومغفرته) زیاد بکەی لە وەڵامەکەی بڵێی:** (وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته ومغفرته).

## سەلام کردن بە دەست بێ قسە جائیز نییە

عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بِغَيْرِنَا لَا تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ وَلَا بِالنَّصَارَى فَإِنَّ تَسْلِيمَ الْيَهُودِ الْإِشَارَةُ بِالْأَصَابِعِ وَتَسْلِيمَ النَّصَارَى الْإِشَارَةُ بِالْأَكُفِّ ) حسن : رواه الترمذي(٢٦٩٥)

واته: له ئێمه نییه ئەوەی خۆی دەچوێنێ بـه غـەیری ئێمـه , خۆتـان مەچوێنن به جووله‌کەو دیانەکان، سەلامی جووله‌کەکان ئاماژه کردنه بـه پەنجەکانیان، وه سەلامی دیانەکان ئاماژه به دەستیان دەکەن .

**سوود**:

١- (ابن باز) دەڵێ: سەلام کردن جائیز نییـه تـەنها بـه ئامـاژەکردن، بەڵکو سەلام کردن به قسەیه ئەوەی که سەلام دەکات ئەوەش که وەڵام دەداتەوە.

٢- عـن أَسْـمَاءَ بِنْـتَ يَزِيـدَ قالـت: (أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مَـرَّ فِـي الْمَسْـجِدِ يَوْمًـا وَعُصْـبَةٌ مِـنْ النِّسَـاءِ قُعُـودٌ فَـأَلْوَى بِيَـدِهِ بِالتَّسْلِيمِ وَأَشَارَ عَبْدُ الْحَمِيدِ بِيَدِهِ ) صحيح:رواه الترمذي(٢٦٩٧)

واتـه: ئـەسمای کچـی زەیـد دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) رۆژێـك بـەناو مزگەوتدا تێپەڕی کۆمەڵێك ئافرەت دانیشتبوون بـه دەسـت سـەلامی لـێ کردن، (عبدالحمید) که یەکێکه له گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیه ئاماژەی کرد بۆ دەستی.

ئیمام نەوەوی دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەدەست ئیشارەتی کردووه به زمانیش سەلامەکەی کردووه.

**سوود**:

(عیثمین) دەڵێ: سەلام کردن جائیزه به دەست ئیشارەت بکەی وه به قسەش بیڵێی به تایبەتی ئەگەر کەسەکه دوور بوو یا کەڕ بوو.

کەواته ئەگەر لەناو سەیاره بوویت بەدەست ئاماژەت کـرد بـۆ سـەلام

کردن به قسەش سەلامەکە بکە دەنا تـەنها بـە ئیشـارەت سـەلام کـردن جائیز نییە.

وە کاتێك بە ڕێگادا دەڕۆی سەلام لە خەڵکان دەکەی بە دەنگێکـی وا سەلام بکە کە بەرامبەرەکەت بـە جـوانی ببیبیسـتێ، وەکـو ئـەو کەسـانە مەکە کە بەتەنها بەدەست ئیشارەت دەکەن بـۆ سـەلام، یـا نووسـکەیان لێوە دێت تۆ نازانی چی دەڵێن.

ئەی موسڵمان بە ڕوویەکی خۆش بە دەنگێکی زوڵاڵ سـەلام بکـە، بـە ڕوویەکی خۆش و بە دەنگێکی زوڵاڵ وەڵامی سەلام بدەوە.

## گەورەیی سەلام کردن

عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ قَالَ لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ انْجَفَلَ النَّاسُ قِبَلَهُ وَقِيلَ قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ثَلَاثًا فَجِئْتُ فِي النَّاسِ لِأَنْظُرَ فَلَمَّا تَبَيَّنْتُ وَجْهَهُ عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ فَكَانَ أَوَّلُ شَيْءٍ سَمِعْتُهُ تَكَلَّمَ بِهِ أَنْ قَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصِلُوا الْأَرْحَامَ وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ)

صحيح :رواه الترمذي(٢٤٨٥)وابن ماجة(٣٢٥١)

واتـە: (عبـدالله)ی کـوڕی سـەلام (کـە زانایـەکی جوولەکـەکان بـوو لـە پاشان موسڵمان بوو) دەڵێ کاتێك کە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە مەککـە هاتـە مەدینـە خـەڵك بـەرەو ڕووی ڕۆیشـتن , دەگـوترا پێغەمبـەر هـات (ﷺ) پێغەمبەر هات (ﷺ) سێ جاران، دەڵێ: منیش لەگەڵ خەڵك ڕۆیشتم بـۆ

**ئەوەی تەماشا بکەم، جا کاتێك تەماشـای ڕووی پێغەمبـەرم کـرد زانـیم ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕووی درۆزنان ناچێت، جا یەکـەم شت کـە لـە پێغەمبەرم بیست ئەوەبوو فەرمووی: ئەی خەڵکینە سەلام بلاو بکەنـەوە (واتـە سـەلام لـەوە بکـەن کـە دەیناسـن وە لـەوەش کـە نایناسـن) وە خواردن بدەن، وە سیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنن , وە نوێژ بکەن بە شەو لەو کاتەی کە خەڵکان نووستون، بەسەلامەتی دەچنە بەهەشت.**

٢-عن عبدالله بن عمرو أنَّ رجلاً سأَلَ رسولَ الله(ﷺ) أيُّ الإسلامِ خَيرٌ قال: تُطعِمُ الطَّعامَ وتقرأُ السَّلامَ على مَنْ عَرفتَ ومَنْ لَم تَعرِف. رواه البخاري(٢٨) ومسلم(٣٩).

**واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد ووتی: کام کـردەوە لـە ئیسلامدا پاداشتی زیاترە؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: خـواردن بـدەی , وە سەلام بکەی لەو کەسەی کە دەیناسی وە لەوەش کە نایناسی.**

٣-عن عمران بن الحصين(رضي الله عنهما) قال: جاءَ رَجُلٌ إلى النبيِّ(ﷺ) فقال: السَّلامُ عليكم، فَرَدَّ عليه ثُمَّ جَلَسَ فقال النبيُّ(ﷺ): عَشْرٌ ثُمَّ جاءَ اخَرُ فقال، السَّلامُ عليكم ورحمةُ الله، فَرَدَّ عليهِ فَجَلَسَ فقال: عشرون، ثُمَّ جاءَ اخَرُ فقال: السلام عليكم ورحمة الله وبركاتهُ، فَرَدَّ عليهِ فَجَلَسَ، فقال: ثلاثون. صحيح: رواه ابوداود(٥١٩٥) والترمذي(٢٦٨٩).

**واتە: عیمرانی کوری(حصين) (ڕەزای خوای لێ بێت ) دەڵـێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبـەر(ﷺ) گـوتی(السلام عليكم) پێغەمبـەر(ﷺ) وەلامـی**

دایەوە لە پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (١٠) خێری گەیشتیٚ، لە پاشان یەکێکی تر هات گوتی(السلام علیکم ورحمة الله) پێغەمبەر(ﷺ) وەلامی دایەوە پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(٢٠) خێری گەیشتیٚ , لە پاشان یەکێکی تر هات گوتی(السلام علیکم ورحمة الله وبركاته) پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی دایەوە , پیاوەکە دانیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(٣٠) خێری گەیشتیٚ.

کەواتە هەوڵ بدە لە پێناوی خوا زۆر سەلام بکەی لەوەی کە دەیناسی لەوەش کە نایناسی، وە بە باشترین شێوەش سەلام بکەی و وەڵامی سەلام بدەیتەوە , وە خەڵکانی دەوروبەریشت و موسڵمانانیش فێری سەلام و وەڵامەکەی بکە , موسڵمان دەتوانیٚ رۆژانە لە رێگای سەلامەوە پاداشتێکی زۆر بۆ خۆی کۆ بکاتەوە .

## سەلام کردن لە منداڵان سوننەتە

١ –عن أنس(رضي الله عنه) انَّهُ مَرَّ على صِبيانٍ فَسَلَّمَ عليهم وقال: كانَ النبيُّ(ﷺ) يَفعَلُهُ. رواه البخاري(٦٢٤٧) ومسلم(٢١٦٨).

واتە: ئەنەسی کوری مالیك(رەزای خوای لیٚ بێت) بەلای هەندیٚ منداڵدا رۆیشت سەلامی لیٚ کردن وە گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) وای دەکرد.

# گرنگی دانی هاوەڵان بە سەلام کردن

١-عن الطُّفيلِ بنِ أبيٍّ بنِ كعبٍ أنَّهُ كان يأتي عبدالله بنَ عمر، فَيَغْدُو مَعَهُ إلى السُّوقِ، قال غَدَونا إلى السُّوقِ، قال: فاذا غَدَونا إلى السوقِ لَم يَمُرَّ عبدالله على سَقاطٍ ولا صاحِبِ بَيعَةٍ ولا مِسكينٍ ولا أَحَدٍ إلاّ سَلَّمَ عليهِ، قال الطفيلُ: فَجئتُ عبدالله بن عمر يوماً، فاسْتَتْبَعَني إلى السوقِ، فقلتُ لهُ: ما تَصنعُ بالسوق، وأنتَ لا تَقِفُ على البَيْعِ، ولا تَسأَلُ عَنِ السِّلَعِ، ولا تَسُومُ بِها، ولا تَجْلِسُ في مجالسِ السُّوق؟ وأقولُ: إجلس بنا ههُنا نَتَحَدَّثْ فقال يا أبا بَطنٍ وكان الطفيل ذا بَطنٍ، إنّما نَغْدُو من أجلِ السلام، فَنُسَلِّمُ على مَنْ لَقِيناهُ. رواه مالك في الموطأ بإسناد صحيح(١٧٩٣).

**واتە: طفيل(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەچووە لای عبدالله کوری عومەر(رەزای خوای لێ بێت) , لەگەڵیدا دەچووە بازار , (طفيل) دەڵێ: کاتێك کە دەگەیشتینە بازار(عبدالله) بەلای هەر یەکێکدا برۆیشتبایە کە شتی کەم نرخی بفرۆشتبا، یا شتی نرخ گرانی بفرۆشتبایە، یا هەژار بوایە، یا هەر یەکێك بوایە ئیللا سەلامی لێ دەکرد، (طفيل) دەڵێ: رۆژێکیان چوومە لای(عبدالله) داوای لێ کردم کە لە گەڵیدا بچم بۆ بازار، جا منیش پێم گوت: چی دەکەی لە بازار، تۆ نە شتێ دەکریت، وە نە لە کەل و پەلێ دەپرسی، وە نە سەودای شتێ دەکەی لە بازار وە نە لە کۆری دانیشتنی ناو بازاردا دادەنیشیت؟ جا من دەڵێم با لێردا دابنیشین بۆ خۆمان قسە بکەین، جا(عبدالله) فەرمووی: ئەی وورگن- طفيل خۆی زگی گەورە بووە- ئێمە لەبەر سڵاو کردن دەچین , سەلام دەکەین لە هەر کەسێك کە پێی بگەین.**

## گەورەیی ئەوەی یەکەم جار سەلام دەکات

١- عن أبي أمامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ أولى الناس بالله مِنْ بَدَأَهُم بِالسَّلام. صحيح: رواه أبوداود(٥١٩٧).

**واتە: بێگومان نزیکترین خەڵك بە(رەحمەتی) خوا ئەو کەسەیە کە لە پێشدا سڵاو لە خەڵکان دەکا.**

## کێ یەکەم جار سەلام دەکات

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ على الماشي، والماشي على القاعِد، والقليلُ على الكثير. رواه البخاري(٦٢٣٢) وميلم(٢١٦٠).

**واتە: سوار سڵاو لە پیادە دەکا، وە پیادە سڵاو لە دانیشتوو دەکا، وە کەم سڵاو لە زۆر دەکا.**

**وە لە فەرموودەی (٥١٩٨)ی سونەنی(أبو داود) هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (يُسَلِّمُ الصغير على الكبير...) **واتە: گچکە سەلام لە گەورە دەکات.**

٢-عن جابر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ على الماشي والماشي على القاعِدِ والماشيان ايُّهما بَدَأَ فَهُوَ أَفْضَلُ. رواه البزار وابن حبان في صحيحه.

**واتە:سوار سەلام لەپیادەدەکا،پیادە سەلام لە دانیشتودەکا , وەدوو کەس کە دەڕۆن کامیان لە پێشدا سڵاو بکا ئەوە ئەوەیان باشترە.**

## دووباره كردنه‌وه‌ی سه‌لام

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: إذا لَقِيَ احَدُكُم أَخاهُ فَلْيُسَلِّم عليهِ، فإن حالَتْ بينَهُما شَجَرَةٌ أو جِدارٌ او حَجَرٌ ثُمَّ لَقيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عليهِ. صحيح: رواه أبوداود(٥٢٠٠).

**واته: ئه‌گه‌ر هه‌ر یه‌كێك له‌ ئێوه‌ گه‌یشته‌ براكه‌ی با سه‌لامی لـێ بكات , جا ئه‌گه‌ر دارێك یا دیوارێك یا به‌ردێكیان كه‌وته‌ نێوان‌و له‌ پاشان پێی گه‌یشته‌وه‌ با دیسان سه‌لامی لێ بكاته‌وه‌.**

## كاتێ رۆیشتی له‌ مه‌جلیس سه‌لام ده‌كه‌ی

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا انْتَهى أَحَدُكُمْ إلى المجلس فَلْيُسَلِّم، فإذا أَرادَ أن يَقومَ فَلْيُسلِّمْ فليَستِ الأولى بأحقَّ مِنَ الآخِرةِ. حسن صحيح: رواه ابوداود(٥٢٠٨) والترمذي(٢٧١٥).

**واته: ئه‌گه‌ر یه‌كێك له‌ ئێوه‌ چووه‌ كۆڕێكه‌وه‌ با سه‌لام بكات , وه‌ ئه‌گه‌ر ویستی هه‌ڵبستێ با سه‌لام بكات , چونكه‌ سه‌لامی یه‌كه‌م حه‌قتر نییه‌ له‌ سه‌لامی دوایی.**

## گه‌وره‌یی سه‌لام كردن له‌كاتی گه‌ڕانه‌وه‌ت بۆ ماڵ

عن أبي أُمامة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ثلاثةٌ كُلّهم ضامِنٌ على الله، إنْ عاشَ رُزِقَ وكُفي، وإن ماتَ أدْخلهُ اللهُ الجنة:

مَنْ دخَلَ بيتهُ فَسلَّمَ، فَهو ضامِنٌ على الله، ومَنْ خَرَجَ إلى المسجد فَهو ضامنٌ على الله، ومن خرجَ في سبيل اللهِ فَهو ضامنٌ على الله[1].

---

(١) رواه أبوداود(٢٤٩٤) والحاكم في المستدرك وصححه ووافقه الذهبيُّ والبيقي في السنن الكبرى، وابن حِبان في (الصحيح) وقال محققة: حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح الترغيب والترهيب:٣١٩).

واتە: خوا کەفیلی سێ کەس دەکات: بەوەی ئەگەر ژیا رزق و رۆزی و پێویستی بۆ دابین دەکات , وە ئەگەر مردیش دەیخاتە بەهەشتەوە ، یەکێ بڕواتەوە بۆ ماڵەوە سڵاو بکات، ئەوە زەمانەتی لە سەر خوایە، وە هەر کەسێك لە ماڵ دەربچێ بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، ئەوەش زەمانەتی لە سەر خوایە، وە هەر کەسێکیش لە ماڵ دەرچێ بۆ جیهادو تێکۆشان لە رێی خوادا ئەوەش زەمانەتی لەسەر خوایە.

## سەلام کردن دەبێتە هۆی خۆشەویستی

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم (لا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ)رواه مسلم(٥٤)

واتە: ناچنە بەهەشت تاوەکو بڕوا نەهێنن، وە باوەڕ ناهێنن تا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم کاتێك ئەنجامتاندا یەکترتان خۆش بووێت، سەلام لەنێوانی خۆتاندا بڵاو بکەنەوە (واتە سەلام لەو کەسە بکەن کە دەیناسن وە لەوەش کە نایناسن).

## چۆن وەڵامی ئەم سەلامە دەدەیەوە کە پێت دەگەیەندرێ

١- عن عائشة(رضي الله عنها) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال لها: يا عائشةُ هذا جبريلُ يَقرأُ عليكِ السَّلامِ، فقالتْ: وعليه السلامُ ورحمة الله وبركاتهُ. رواه البخاري(٣٢١٧) ومسلم(٢٤٤٧).

واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی

**فەرمووە: ئەی عائیشە ئەوە(جبریل)ە سەلامت لێ دەکات، ئەویش گوتی:** وعليه السَّلام ورحمة الله وبركاته.

**٢-جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فقال إنَّ أبي يُقرِئُك السلامَ فقال النبيّ (ﷺ) : (عليكَ وعلى أبيكَ السلام)** حسن رواه أبو داود (٥٢٣١) وأحمد (٢٣١٥٣).

**واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی باوكم سەلامت لێ دەكات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی سەلام لەسەر تۆو لەسەر باوكیشت.**

**كەواتە سوننەتیشە كە یەكێك سەلامێكت پێ دەگەیەنێ سەلام لەویش بكەی.**

**وە ئەگەر ئەوەی سەلامی بۆت ناردووە ژن بوو دەڵێی** (وعليها) نەك (وعليه) (وعليها السلام ورحمة الله وبركاته).

# سەلام كردن لە كافرو دیان و جوولەكە

١- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا تَبدَؤوا اليَهودَ ولا النصارى بالسَّلام فإذا لقيتم أحدَهُمْ في طريقٍ فاضْطَرُّوهُ على أَضْيَقِهِ. رواه مسلم(٢١٦٧).

**واتە: ئێوە لە پێشدا سڵاو لە دیان و جولەكە مەكەن جا ئەگەر ئێوە گەیشتن بە ئەوان لە ڕێگایەكدا ناچاریان بكەن بۆ تەنگترینی ڕێگاكە.**

## سوود:

(ابن باز) دەڵێ: حوکمی سەلام کردن لە کافر وەکو حوکمی سەلام کردنە لە دیان و جوولەکە، بە هیچ شێوەیەك سەلام لە کافر ناکرێ لە سەرەتاوە، بەڵام ئەگەر ئەوان سەلامیان کرد لە وەڵامدا تەنها ئەوەندە دەڵێن (وعلیکم)، لە پاشاندا جائیزە بڵێی چۆنی منداڵەکانت چۆنن، وە بە تایبەتیش لەو کاتانەدا کە بەرژەوەندیەکی ئیسلامی لەم ئەحوال پرسینەدا رەچاو دەکرا.

بەڵام (عثیمین) دەڵێ: وەڵامی سەلامی کافران دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

١- ئەگەر سەلامەکەی روون بوو گوتی (السلام علیکم) تۆش دەڵێی (علیکم السلام) خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴾ (النساء: ٨٦).

ب- بەڵام ئەگەر گومانمان هەبوو ئایا گوتی (السام) یا (السلام) ئەوە تەنها لە وەڵامدا دەڵێی (وعلیکم).

جـ- وە ئەگەر بە روونی گوتی: (السَّام علیکم) واتە: مردنتان لەسەر ئەوە لە وەڵامدا دەڵێی: (وعلیکم).

د- بۆ تۆقەش ئەتۆ دەستی بۆ درێژ ناکەی بەڵام ئەگەر ئەو دەستی درێژ کرد ئەوە تۆش دەستی بۆ درێژ دەکەی.

١- عن أسامة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) مَرَّ على مَجْلِسٍ فيه أخلاط من المسلمين والمشركين - عبدة الأوثان واليهود- فَسَلَّمَ عليهم النبيّ(ﷺ). رواه البخاري(٤٥٦٦) ومسلم(١٧٩٨).

واتە: ئوسامە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەلای کۆڕێکدا ڕۆیشت موسڵمان و موشریکی تێدا بوو – بتپەرست و جوولەکە – پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی لێ کردن.

**سوود**: جائزە سەلام بکرێ لە کۆمەڵێ کە موسڵمان و کافری تێدا بێت , بەڵام ئەو مەبەستی موسڵمانەکان بێت بە سەلامەکەی.

## سەلام کردن لە ئافرەتان

عن أَسْمَاءَ بِنْت يزيد قالت: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وسَلَّم مَرَّ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمًا وَعُصْبَةٌ مِنْ النِّسَاءِ قُعُودٌ فَأَلْوَى بِيدِهِ بِالتَّسْلِيمِ وَأَشَارَ عَبْدُ الْحَمِيدِ بِيَدِهِ ) صحيح:رواه الترمذي(٢٦٩٧)

واتە: ئەسمای کچی زەید دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك بەناو مزگەوتدا تێپەڕی کۆمەڵێك ئافرەت دانیشتبوون بەدەست سەلامی لێ کردن (عبدالحمید) کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە ئاماژەی کرد بۆ دەستی، ئەوەوی دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بەدەست ئیشارەی کردووە بە زمانیش سەلامی کردووە.

**سوود**:

سوننەتە پیاو سەلام لە پیاو بکات، وە ژن لە ژن، وە هەروەها پیاو و ژن لە مەحاریمەکانیان وەك براو خوشك و پلك و مام و خاڵ، وە هەروەها جائیزە پیاو سەلام لە ئافرەتێکی بێگانەی بەساڵاچوو بکات، وە ئەگەر ئەمین نەبوو لە فیتنە نابێ سەلام لە ئافرەتی گەنج بکات.

نەوەوی لە کیتابی (أذکار)دا دەڵێ: ئەگەر ئافرەتەکە بێگانە بوو جوان بوو ترسی فیتنە لە ئارادا بوو ئەوە پیاو سەلامی لێ ناکات , وە ئەگەر سەلامیشی لێ کرد جائیز نییە بۆ ئافرەتەکە وەڵام بداتەوە، وە ئافرەتەکەش لە یەکەم جار سەلام ناکات وە ئەگەر سەلامی کرد مەکروهە وەڵامی سەلامەکەی بدرێتەوە، وە ئەگەر ئافرەتەکە بەساڵاچوو بوو ترسی فیتنە لە ئارادا نەبوو جائیزە سەلام لە پیاو بکات و ئەویش وەڵامی بداتەوە.

ابن حجر لە (فتح) دا دەڵێ: پیاو سەلام لە ژن بکات یا ژن سەلام لە پیاو بکات لەم کاتەدا جائیزە کە ئەمین بێت لە فیتنە.

## تۆقە کردن لەگەڵ ئافرەت

عن مَعْقِلِ بْنِ يسار قال : قَالَ رسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " لَأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيطٍ مِنْ حَدِيدٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمَسَّ امْرَأَةً لَا تَحِلُّ لَهُ . رواه الطبراني وصححه الالباني في صحيح الجامع(٥٠٤٥)

واتە: ئەگەر بە دەرزیەکی ئاسن بدرێ لە سەری یەکێك لە ئێوە باشترە بۆی لەوەی کە دەستی بکەوێ بە ئافرەتێك کە بۆی حەڵاڵ نییە.

**سوود:**

١- حەرامەو جائیز نییە کە پیاو تۆقە لەگەڵ ئافرەتی بێگانە بکات، وە ئەگەر ئافرەتی بێگانە دەستی درێژ کرد با ئەو شەرم نەیگرێ دەستی درێژ بکات بەڵکو تۆقەی لەگەڵ نەکات و بۆی روون بکاتەوە کە

ئەمە لە رووی شەرعیەوە  جائیز نییە.

٢- بەلآم ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ ئافرەتی موسـڵمان سـوننەتەو خێـرە کاتێك کە بەیەك دەگەن تۆقە لەگەڵ یەکتر بکەن.

## چۆن ئیزن وەردەگریت بۆ چوونە ماڵێك

١- عن رِبْعيّ قال: حَدّثنا رجلٌ من بني عامر أنَّهُ اسْتأْذنَ على النبيِّ(ﷺ) وهو في بيتٍ فقال: ألِجُ. فقال النبيُّ(ﷺ) لِخادمِهِ: أُخرج إلى هذا فَعَلِّمهُ الإستئذانَ فَقُل لَهُ: قل: السلامُ عليكم أأَدخُلُ، فَسمعهُ الرَّجلُ فقال، السَّلام عليكم أأَدخُلُ؟ فأذنَ لَهُ النبيُّ(ﷺ) فدَخَلَ.

صحيح: رواه أبوداود(٥١٧٧).

ألج: ولَجَ، يَلِجُ، واتە: چووە ژوورەوە، دەچێتە ژوورەوە.

واتــە: ریبعــی دەڵــێ: پیاوێـك لــە بــەنی عــامیر بــۆی گێرامــەوە کــە پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵێکدا بووە ئەویش داوای مۆڵـەتی کـردووە کـە بچـێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) جا پێغەمبەر(ﷺ) بە خزمتکارەکەی گوتووە: برۆ لای ئەوە فێری مۆڵەت وەرگرتنی بکـە بـۆ ژوورەوە، پێـی بڵـێ :بڵێـت (السـلام علــیکم) ئایــا بێمــە ژوورەوە , جــا پیاوەکــە گــوێی لــەم قســەیە بــوو گوتی(السلام علیکم) ئایا بێمە ژوورەوە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدا بێتە ژوورەوە، ئەویش هاتە ژوورەوە.

# زیكرو دوعاكانی سەفەر كردن

## ١- كردنی دوو ركات كە لە ماڵ دەردەچێت

١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ( إِذَا دَخَلْتَ مَنْزِلَكَ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ تَمْنَعَانِكَ مَدْخَلَ السُّوءِ ، وَإِذَا خَرَجْتَ مِنْ مَنْزِلِكَ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ تَمْنَعَانِكَ مَخْرَجَ السُّوءِ). مجمع الزوائد(٣٦٨٦)وقال :رواه البزار ورجاله مَوَثّقُون .وانظر الصحيحة للالباني (١٣٢٣)

**واتە: كاتێك كە چوویتەوە بۆ ماڵەكەت دوو ركات نوێژ بكە دەتپارێزن لە خراپەی چوونە ژوور ، وە كاتێكیش دەرچووی لە ماڵەكەت دوو ركات نوێژ بكە دەتپارێزن لە خراپەی دەرچوون.**

## ٢- زیكری لەماڵ دەرچوون

(بسم الله، توكلت على الله، ولا حول ولا قوة إلا بالله) صحيح: رواه أبو داود (٥٠٩٥) والترمذي (٣٤٢٦).

**تێبینی: بۆ باسی ئەم فەرموودەو مانای ئەم زیكرە سەر لە باسی زیكری لە ماڵ دەرچوون بدە.**

## ٣- دوعای گەشتیار بۆ ئەوانەی جێیان دێڵێ:

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) أَنّهُ قال: مَنْ أَرادَ أَنْ يُسافِرَ فَلْيَقُلْ لِمَنْ خَلْفَهُ(أَسْتَودِعُكُم الله الذي لا تَضِيعُ وَدائِعَهُ). رواه أحمد(٢/٤٠٣) وابن ماجه(٢/٩٤٣) واسناده حسن.

**واتە: هەر یەكێك ویستی سەفەر بكات با بەوانە بڵێ كە جێیان دێڵێ لە دوای خۆیدا. بەو خوایەتان دەسپێرم كە سپاردە نافەوتێنێ.**

**سوود**: عن ابن عمر(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال:(إنَّ الله إذا استودع شيئاً حَفِظَهُ). رواه احمد في المسند(٥٦٠٥) بإسناد صحيح.

**واتە: بێگومان هەر شتێك بە خوای گەورە بسپێردرێت ئەیپارێزێت.**

## ٤- دوعای نیشتەجێ بۆ ڕێبوار

١- (عَنْ قَزَعَةَ قَالَ قَالَ لِي ابْنُ عُمَرَ هَلُمَّ أُوَدِّعْكَ كَمَا وَدَّعَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ).

**واتە: قەزەعە دەڵێ (ابن عمر) پێی گوتم وەرە بتسپێرم هەروەکو چۆن پێغەمبەر (ﷺ) منی سپارد** (أَسْتَوْدِعُ اللهَ دينكَ، وأمانَتكَ، وخَواتِيمَ عَمَلِك) **واتە: دین و ئەمانەت و دوا کردەوەکانت بەخوا دەسپێرم.**

٢- عن أنس قال: جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فقال: يا رسول الله إني أريدُ سفراً فَزَوِّدني قال: (زَوَّدكَ اللهُ التقوى) قالَ زِدني قال: (وغفر ذنبك) قال زدني بأبي أنت وأمي قال: (ويَسَّرَ لك الخير حيثما كنتَ) حسن صحيح رواه الترمذي (٣٤٤٤).

**واتە: ئەنەس دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەمەوێ سەفەرێك بکەم تێشووم پێ بدە (دوعام بۆ بکە) فەرمووی:** (زودك الله التقوى) **واتە: خوا تەقوات پێ بدات، پیاوەکە گوتی: بۆم زیاد بکە ، فەرمووی:** (وغفر لك) **واتە: وە خوا لە گوناهیشت خۆش بێت، پیاوەکە گوتی دایك و باوکم بە فیدات بێت بۆم زیاد بکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:** (ويَسَّر لك الخيرَ حيثما كنت) **واتە: وە خێرو چاکەت (خێری دونیاو قیامەتت) بۆ ئاسان بکات لە هەر کوێیەك بیت.**

## ٥- زیکری سوار بوونی وولاخ و هۆیەکانی گواستنەوە

١-بسم الله، الحمدلله ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ (الزخرف:١٣-١٤)

ألحمدلله، ألحمد لله، ألحمدلله، ألله أكبر، ألله أكبر، ألله اكبر، سُبحانكَ إنّي ظلمتُ نَفسي فاغْفِرْ لي فإنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنت.

صحيح: رواه ابوداود(٢٦٠٢).

**سوود:**

**١-لێرە تەنها زیکرەکە نەقل کراوە فەرموودەکە کەمێك درێژ بوو.**

## ٦- زیکری بەرەو بەرزایی رۆیشتن و دابەزین لە بەرزایی

١- عن جابر قال: (كنّا اذا صَعِدنا كبَّرنا، وإذا نَزَلْنا سَبَّحنا) رواه البخاري (٢٩٩٣).

**واتە: (جابر) رەزای خوای لێ بێت، دەڵێ: ئێمە کاتێك بەرەو بەرزایی بچووباینە (الله أكبر)مان دەووت، وە کاتێکیش دابەزیباینە لە بەرزایی بۆ خوارەوە (سبحان الله)مان دەکرد.**

## ٧- دوعای چوونە ناو گوندو شار

عن صهيب قال: أَنَّ النَّبِيَّ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – لَمْ يَرَ قَرْيَةً يُرِيدُ دُخُولَهَا إِلَّا قَالَ حِينَ يَرَاهَا : " (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ ، وَرَبَّ الْأَرَضِينَ السَّبْعِ وَمَا أَقْلَلْنَ ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضْلَلْنَ ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَيْنَ ، فَإِنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ وَخَيْرَ أَهْلِهَا ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أَهْلِهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا )[1].

**واتە: سوهەیب –رەزای خوای لێ بێت– دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هیچ گوندو شارێکی نەدەدیت کە مەبەستی بێت بچێتە ناویەوە ئیللا دەیفەرموو: (ئەی خودایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و ئەوەی سێبەری بۆ کردوون (واتە ئەوەی لە ژێریان دایە) وە ئەی پەروەردگاری حەوت تەبەقی زەوی و ئەوەی کە هەڵیگرتووە (لەسەری دایە) وە ئەی پەروەردگاری شەیتانەکان و ئەوەش کە گومڕایان کردوون، وە ئەی پەروەردگاری بایەکان و ئەوەش کە لەگەڵ خۆیان دەیبەن، ئێمە داوای خێری ئەو شارەو وە خێری دانیشتووانەکەت لێ دەکەین، وە خۆمان دەپارێزین بەتۆ لە خراپەی ئەو شارەو خراپەی خەڵکەکەی و ئەو خراپەی کە تێیدایە.**

---

(١) رواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي (٢٥٣٤) والطبراني في الكبير (٧٢٩٩) وابن خزيمة في صحيحه (٢٥٦٥) والبزار في مسنده (٢٠٩٣) وحسنه الحافظ في تخريج الاذكار (١٥٤/٥).

## ٨- چی دەڵێی کە لە شوێنێك دادەبەزی:

١ – عن خولةَ بنت حكيم قالت: سمعتُ رسول الله (ﷺ)، يقول: (مَنْ نزلَ مَنزلاً ثُمَّ قال:(أعوذ بكلمات الله التامّاتِ مِن شَرِّ ما خلقَ) لم يَضُرَّهُ شيء حتى يرتحِلَ مِن منزلِهِ ذلك) رواه مسلم(٢٧٠٨).

**واتە: هەر یەكێك چووە جێگایەكەوە لە پاشان بڵێ:( اعوذ بكلمات الله التامّاتِ مِن شَرِّ ما خلقَ) هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنی تا لەم جێگایە دەڕوات.**

**سوود:**

**١–یەك جار ئەم زیكرە دەخوێنی كاتێك كە لە جێگایەك دادەبەزی .**

**٢– مانای ئەم زیكرە بەم شێوەیە(خۆم دەپارێزم بە ووشە تەواوەكانی خوا(واتە قورئان كە هیچ ناتەواویەكی تیا نییە) لە زیانی ئەوەی كە دورستی كردووە.**

## ٩- دوعا لەكاتی سەفەر قەبول دەبێت

عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) (ثلاثُ دعواتٍ مُستجاباتٌ لا شكَّ فيهنَّ، دعوة المظلوم، ودعوة المسافر، ودعوةُ الوالدِ على وَلدِهِ) حسن رواه أبو داود (١٥٣٦) والترمذي (١٩٠٥).

**واتە: سێ دوعا هەن گومانی تێدا نییە وەڵام دەدرێنەوە، دوعای ستەم لێكراو، دوعای رێبوار، دوعای باوك لەسەر منداڵەكەی.**

## ١٠- زیکری گەڕانەوە لە سەفەر

قَال أنسُ بْنُ مَالِكٍ أَقْبَلْنَا معَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وأَبُو طَلْحَةَ وَصـفِيَّةُ رَدِيفَتُـهُ عَلـى نَاقَتِـهِ حَتَّـى إذَا كُنَّـا بظَهْـرِ الْمَدِينَـةِ قَـالَ آيِبُـونَ تَـائِبُونَ عَابِدُون لِرَبِّنَا حَامِدُون فَلَمْ يزَلْ يَقُولُ ذَلِكَ حَتَّى قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ .رواه مسلم (١٣٤٥)

**واتە: ئەنەس –ڕەزای خـوای لـێ بێـت– دەڵـێ: ڕۆیشـتین مـن و (أبو طلحة) لەگـەڵ پێغەمبــەردا (ﷺ) , وە (صفیة)ش لەگــەڵ پێغەمبــەردا (ﷺ) لەسـەر پشـتی حوشـترەکەی بـوو , تـا کاتێـك گەیشـتین بەسـەر بەرزاییـەکانی مەدینــەو مەدینــەمان لــێ بەدەرکــەوت، پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمووی: (آیِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُون لِرَبِّنَا حَامِدُون) واتە: گەڕاینەوە بـە تۆبـە کـردن و بەندایـەتی کـردن بـۆ پـەروەردگارمان و سـوپاس گوزارییــەوە، جـا ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەر ئەوەی دەووت تا چووینە ناو مەدینە.**

## ١١- دوو ڕکات نوێژ کردن لە مزگەوت لەکاتی گەڕانەوە لە سەفەر

١- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لَا يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلَّا نَهَارًا فِي الضُّحَى فَإِذَا قَدِمَ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَصَلَّى فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ جَلَسَ فِيهِ . رواه مسلم (٧١٦)

**واتە: کەعبی کوڕی مالیك –ڕەزای خوای لـێ بێـت– دەڵـێ پێغەمبـەر (ﷺ) نەدەگەڕایەوە لە سەفەر ئیللا لەکاتی نەبێت لە ڕۆژدا، جـا کاتێـك بگەڕابایەوە بە مزگەوت دەستی پێ دەکرد دوو ڕکـاتی تیـادا دەکـرد لـە پاشان لەوێ دادەنیشت.**

٢- عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ قَالَ لِي ادْخُلْ الْمَسْجِدَ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ.رواه البخاري (٢٩٢١)

**واته: جابر –ڕەزای خوای لێ بێت– دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە سەفەرێكدا بووم كاتێك كە هاتینەوە مەدینە پێی فەرمووم بڕۆ مزگەوت دوو ركات نوێژ بكە.**

## ١٢- نوێژی سەفەر هەر خۆی دوو ركاتە

١-(عنْ عُمرَ قالَ: صلاةُ السَّفرِ رَكعتانِ، والجُمُعةُ رَكْعَتانِ، والعيدُ ركعَتان، تمامٌ غيرُ قَصرٍ على لسانِ محمدٍ )صحيح: رواة ابن ماجة (١٠٦٣).

**واته: ئیمامی عومەر دەفەرموێ: نوێژی سەفەر دوو ڕكاتە، وە نوێژی جومعە دوو ركاتە، وە نوێژی جەژن دوو ركاتە تەواون بێ كورتكردنەوە (واتە هەر خۆیان وان) ئەمەش لەسەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) واگوتراون).**

٢-(عنْ إبنِ عباسٍ قال: افْتَرضَ اللهُ الصلاةَ على لسانِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ) في الْحَضَرِ أربعاً، وفي السفر ركعَتين) صحيح: رواة ابن ماجة (١٠٦٨).

**واته: ابن عباس دەڵێ: خوا لەسەر زمانی پیغەمبەرەكەتان نوێژی فەرز كردووە بە چوار ركات لەو كاتەی لە ماڵەوەن، وە بە دوو ركات لەو كاتەی لە سەفەردان.**

٣- قال ابن عمر : (**صلاة السفر ركعتان، من خالف السنة فقد كفر**) اسناده صحيح أخرجه عبدالرزاق (٥١٩-٥٢٠) والطحاوي وغيره.

**واته: (ابن عمر) دەڵێ: نوێژی سەفەر دوو ركاتە، هەر یەكێك پێچەوانەی سوننەت بكات ئەوە كوفری كردووە.**

## سوود:

**١- بە قسەی** (ابن تيمية) **و** (ابن القيم) **هەر دەرچوونێك لە عورف و عادەت پێی بووترێت سەفەر ئەوە نوێژە چوار ركاتیەكان بە دوو ركات دەكرێن، جا ئەو سەفەرە كورت بێت یان درێژ بێت.**

**٢- بە قسەی** (ابن تيمية) **روخسەتی سەفەر بۆ كەسێكیشە ئەگەر سەفەرەكەی بۆ گوناهیش بێت.**

# کۆمەڵێ زیکری جیا جیا

## پەنا گرتن بە خوا لە شەیتان لە کاتی توڕەبووندا

عن سليمان بن صُرَدٍ قال: كنتُ جالساً مَعَ النبيِّ(ﷺ) ورجلان يَستبّان، فأحدُهُما احمرَّ وَجْهُهُ وانْتَفَخَتْ أوداجُهُ فقال النبيُّ(ﷺ) إني لأعلم كلمةً لو قالها ذهب عنه ما يجدُ لو قال: أعوذ بالله من الشيطان . ذهبَ عنه ما يجدُ، فقالوا لَهُ إنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: تعَوَّذْ بالله من الشيطان، فقال: وهل بي جُنون؟ رواه البخاري(٣٢٨٢) و مسلم(٢٦١٠).

**واتە: سولەیمانی کوری صورەد(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: من دانیشتبوم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دوو پیاو جوێنیان بەیەکتر دەدا، یەکێکیان رووی سۆر هەڵگەڕابوو دەمارەکانی ملی هەڵاوسابوون ، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەم تووڕەییەی نامێنێ ئەگەر بڵێ:** أعوذ بالله من الشيطان، **ئەم تووڕەییەی دەڕوات ، جا پێیان گوت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خۆت بپارێزە بە خوا لە شەیتان، پیاوەکە گوتی بۆ شێتم.**

**سوود:**

**لە صحیحی(مسلم) لە بری**(اعوذ بالله من الشيطان) (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) **هاتووە، وە هەروەها لە صحیحی(بخاری)یش لە فەرموودەی ژمارە(٦١١٥)ش**(اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) **هاتووە، واتە: خۆم دەپارێزم بەخوا لە شەیتانی دورخراوە لە رەحمەتی خوا.**

## گەورەیی توورەیی قوتدانەوە

عن معاذ بن انس(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ كَظَمَ غيظاً وهوَ قادرٌ على أنْ يُنفِذَهُ دعاهُ الله على رؤوسِ الخلائقِ يومَ القيامةِ حتى يُخَيِّرَهُ من الحور العِين ما شاء. حسن: رواة ابوداود(٤٧٧٧) والترمذي(٢٠٢٨).

واتە: هەر یەکێك توڕەییەك بخواتەوەو قوت بداتەوە، وە توانای ئەنجامدانیشی هەبێت و بتوانێ رقەکەی برێژێ، ئەوە لە رۆژی قیامەت خوا لەبەر چاوی خەڵك بانگی دەکات و دەیکا بەسەر پشك کە بە ئارەزووی خۆی لە(حور العین) هەڵبژێرێ .

## سەجدەی شوکر لەکاتی هەواڵی خۆش و موژدەی خۆش

عن أبي بكرة عن النبي (ﷺ) أنهُ كانَ إذا جاءَهُ أمْرُ سرورٍ أَوْ بُشِّر بهِ خرَّ ساجداً شاكراً لله) صحيح: رواه أبو داود (٢٧٧٤).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك هەواڵێکی خۆشی بۆ بهاتایە، یان موژدەی هەواڵێکی خۆشیان پێبدایە، سەجدەی دەبرد شوکری خوای دەکرد.

### سوود:

ئەم سەجدەی شوکرە یەك جار دەبردرێ لەکاتی هەواڵی خۆش و موژدەی خۆش، نە دەست نوێژی دەوێ نە (الله أكبر)ی دەوی، نە سەلام دانەوە.

## چی دەڵێی پێش ئەوەی لە کۆڕێکدا هەستی

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ جَلَسَ في مَجْلِسٍ فَكَثُرَ فيهِ لَغَطُهُ فقال قَبلَ أَنْ يقومَ مِن مَجلِسِهِ ذلك: سبحانك اللهم وبحمدك، أَشهَدُ أن لا الهَ الا أنت، أستغفرك وأتوب إليك، إلاّ غُفر له ما كان في مجلسه ذلك. صحيح: رواه أبوداود والترمذي(٣٤٣٣).

**واته: هەر یەکێك لە کۆڕێکدا دابنیشێ کە غەڵبە غەڵبی زۆر تێدا بووبێ، جا ئەویش بەر لەوەی لەو کۆڕەیدا هەڵسێ ئەوە بڵێ(سُبحانكَ اللهمَّ وبحمدكَ، أَشهَدُ أن لا الهَ الا انت، أسْتَغْفِركَ واتوبُ إليك) ئەوە هەرچی لەو کۆڕەیدا بوویەتی لێی دەسڕێتەوە.**

## چی دەڵێی ئەگەر لە خەڵکانێك ترسای

عن ابي بردة بن عبدالله أَن أباه حَدَّثَهُ أَنَّ النبيَّ(ﷺ) كانَ إذا خافَ قوماً قال:(أللهمَّ إنّا نجعَلُكَ في نُحورهم ونَعوذُ بِكَ من شُرُورهم. صحيح: رواه ابوداود(١٥٣٧)

**واته: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر لە خەڵکانێك بترسابایە دەیفەرموو:** أللهمَّ إنّا نجعَلُكَ في نُحورهم ونَعوذُ بِكَ من شُرُورهم) **واته: ئەی خودایە تۆ د ێ کە کەسێك ەکەین بە بەرۆکیانەوەو پەنا دەگرین بە تۆ لە شەڕیان.**

## چی دەڵێی کات ببینی گیرۆدە بووە بە بەڵایەك

١-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) عن رسول الله(ﷺ) انَّهُ قال: مَنْ رأى مُبتلىً فقال: الحمد الله الذي عافاني ممّا ابتلاكَ، به، وفَضَّلني على كثير مِمَّن خلقَ تفضيلاً، لَم يُصبه ذلك البلاء). رواه الإمام أحمد في المسند(٥٦٠٥) بسند صحيح.

**واتە: هەر یەکێك کەسێك ببینێت کە گیرۆدە بووە بە بەڵایەك بڵێ(الحمد الله الذي عافاني ممّا ابْتلاك به وفَضّلَني على كثيرٍ ممَّن خلقَ تفضيلا) ئەم بەلایەی تووش نابێت.**

**سوود:**

**١-ئەم زیکرە یەك جار دەخوێنرێت لەو کاتەی یەکێك دەبینی تووشی بەڵاو کارەسات بووە.**

**٢- مانای زیکرەکە بەم شێوەیە(هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی منی پاراستووە لەوەی کە دووچاری بوویت وە فەزڵی منی داوە بەسەر زۆر لە دورستکراوەکانی دا.**

## دوعا بۆ ئەو کەسەی چاکەت لەگەڵدا دەکات

عن أَسامةَ بْن زيدٍ قال: قال رسولُ الله (ﷺ) : مَنْ صُنعَ إليه معروفٌ فقال لِفاعله جزاكَ اللهُ خيراً فقد أبْلغَ في الثناء) صحيح رواه الترمذي (٢٠٣٥).

**واتە: هەر یەکێك چاکەیەکی لەگەڵدا کرا، ئەویش بە بکەری چاکەکەی گوت: خوا پاداشتت بداتەوە بەخێر (جزاك الله خيراً) ئەوە زۆر سوپاس و ستایشی کردووە.**

## چی دەڵێی ئەگەر یەکێك وتی من تۆم خۆش دەوێت

١-عن انس بن مالكٍ انَّ رجُلاً كانَ عند النبيِّ(ﷺ) فمَرَّ بِهِ رجُلٌ فقالَ: يا رسول الله إنّي لأُحبُّ هذا، فقال له النبيُّ(ﷺ): أَعْلَمْتَهُ؟ قالَ: لا، قال: أَعْلِمْهُ، قالَ: فَلَحِقَهُ فقال: إنّي أُحِبُّكَ في اللهِ، فقال: أحَبَّكَ الذي أحْبَبْتَني لَهُ. حسن: رواه ابوداود(٥١٢٥).

**واتە: پیاوێك لای پێغەمبەر بوو(ﷺ) پیاوێكی بەلادا تێپەری، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەم پیاوەم خۆش دەوێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا ئاگادارت كردووەتەوە؟ پیاوەكە ووتی: نەخێر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێی بڵێ، ئەویش رۆیشت بە دوای داو پێی گەیشت ووتی: من تۆم خۆش دەوێت لەبەر خوا، ئەویش ووتی: ئەو خوایە خۆشتی بوێ كە منت لە پێناوی ئەودا خۆش دەوێت.**

## زیكری چوونە بازار:

١-عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ دَخَلَ السُوقَ فقال: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد، يحي ويميتُ، وهوَ حَيٌّ لا يموتُ، بيدهِ الخير وهو على كل شيءٍ قدير، كَتَبَ الله لهُ ألفَ حسنةٍ ومحا عنهُ ألفَ سَيِّئَةٍ ورَفَعَ لَهُ ألفَ ألفَ دَرَجَة[1]. رواه الترمذي(٣٤٢٨)وغيرة وحسنة الالباني والشيخ عبدالقادر الارنؤط في جامع الاصول

---

**(١) رواه الترمذي(٣٤٢٤) والحاكم واحمد وحَسَّنَهُ الألباني.**

واته: هەر یەکێك چووە بازار بڵێ: (**لا إلـه الا الله وحدهُ لا شريك له , لَهُ الْملكُ ولَهَ الحمد، يُحْيي ويميتُ، وهوَ حَيٌّ لا يموتُ، بيدهِ الخير وهو على كل شيءٍ قدير**)، خودا هەزار هەزار خێری بۆ دەنوسێ(واته یەك ملیۆن) وە هەزار هەزار گوناحی لێ لادەبا، وە هەزار هەزار پلەی بەرز دەکاتەوە.

**سوود**:

١- ئیمام نووی(رەحمەتی خوای لێ بێت) لە پەرتووکی(الأذكار) (باب ما يقول اذا دخل السوق)دا دەڵێ: وزاد الحاكم في بعض طرقه: قال الراوي: فقدمت خراسان فأتيتُ قُتيبة بن مسلم فقلت: أتيتُك بهديَّةٍ فَحَدَّثتُهُ بالحديث فكانَ قتيبة بن مسلم يركب في موكبهِ حتى ياتيَ السوقَ فيقوله ثُمَّ ينصرف.

واته:(حاکم) دەگێڕێتەوە دەڵێ: یەکێك لە گێرەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: چوومە خۆراسان جا چوومە لای(قتیبە)ی کوری مسلم پێم گوت دیاریەکم بۆ هێناوی جا ئەو فەرموودەیم بۆ گێراوە، جا(قتیبە) سواری ووشترەکەی دەبوو دەچووە بازارو ئەم زیکرەی دەخوێندو لە پاشان دەگەرایەوە.

٢-ئەم فەرموودەیە لە نۆ رێگادا هاتووە هیچ یەکێکیان بە تەنها فەرموودەیەکی(صحیح)یا (حسن) نین , بەڵام بە کۆی رێگاکان فەرموودەیەکی(حسن)ی لێ دەردەچێ .

## چی دەڵێی کاتێ کە کەسێك ببینی گیرۆدە بووە بە بەڵایەك

١-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) عن رسول الله(ﷺ) أَنَّه قال: مَنْ رأى مُبْتلىً فقال: أَلْحمدُ لله الذي عافاني ممّا ابْتلاكَ، به، وفَضَّلنى على كثيرٍ مِمَّن خلقَ تفضيلاً، لَم يُصِبْه ذلك البلاء). رواه الإمام أحمد في المسند(٥٦٠٥) بسند صحيح.

**واتە: هەر یەکێك کەسێك ببینێت کە گیرۆدە بووە بە بەڵایەك بڵێ :(اَلحمدُ للهِ الذي عافاني ممّا ابْتلاكَ بهِ وفضَّلَني على كثيرٍ مِمّنْ خلقَ تَفضيلا) ئەم بەلایەی تووش نابێت.**

**سوود:**

**١-ئەم زیکرە یەك جار دەخوێنرێت لەو کاتەی یەکێك دەبینی تووشی بەڵاو کارەسات بووە.**

**٢- مانای زیکرەکە بەم شێوەیە(هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی منی پاراستووە لەوەی کە دووچاری بوویت وە فەزڵی منی داوە بەسەر زۆر لە دورستکراوەکانیدا.**

## کەفارەتی سوێند

خــــوا دەفـــــەرمووێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ (المائـــدة: ٨٩).

واتە: خوا سوێندی سـەر زارەکییتـان لـێ نـاگرێ، بـەڵکو لەسـەر ئـەو سـوێندانە کـە دڵتانیـان لەسـەر گـرێ دەدەن لێپرسـینەوەتان لەگەڵـدا دەکات، جا کەفارەتی ئەو سوێندە (شکاوە) خواردن دانـە بـە دە هـەژار لـە خـوراکێکی مامناوەنـدی کـە دەرخـواردی خێزانتـانی دەدەن، یـان پۆشاکیان، یان ئازادکردنی کۆیلەیەك، جا ئەوەی دەستی نەکەوت (هـیچ کـام لەمانـــە) ســـێ ڕۆژ ڕۆژوو گرتنـــی لەســـەرە، ئـــەوە کـــەفارەتی ســـوێندەکانتانە کاتێـــك ســـوێندتان خـــواردو (شـــکاندتان) ئـــاوا خـــوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو سوپاس گوزاری بکەن.

# کۆمەڵێ زانیاری دەربارەی کەفارەتی سوێند

١- دەتوانی لە کەفارەتی سوێند بە ئارەزووی خۆت یەکێك لەم سێیە بدەی، خواردن، پۆشاك، ئازادکردنی کۆیلەیەك، ئەگەر هیچ یەکێك لەم سێ شتە نەبوو ئەوجا دەتوانی سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت، وە سێ ڕۆژەکەش مەرج وانیە یەك لەدوای یەك بن، بەڵام باشترە لەدوای یەك بن.

٢- ئەگەر خواردنت بەخشی لە بری کەفارەتی سوێند دەتوانی خواردنێکی مام ناوەند کە دەیدەیە ماڵ و مندڵت دروست بکەی بیدەی بە دە هەژار، وە دەتوانی ئەم خواردنە بدەی بە ماڵێکی هەژار کە دە کەس بن ئەگەر لەم دەکەسەش هەندێکیان منداڵ بن.

٣- ئەگەر برنجت بەخشی لە بری کەفارەتی سوێند، ئەوە بۆ هەر نەفەرێك نیو (صاع) دەدەی کە دەکاتە (١٣٠٠) غرام لەسەر فەتوای (هيئة كبار العلماء) ی سعودی، کە هەمووی دەکاتە (١٣) کیلۆ .

٤- پارە نابێت لە بری کەفارەتی سوێند بدرێت.

٥- مەرج وانیە کەفارەتەکە هەمووی لەسەر یەك بدەی بەڵکو دەتوانی ئەمڕۆ بە دوو هەژاری بدەی بەیانی دووی تر وە هەروەها.

٦- مەرج وانیە ئەوەی کەفارەتی سوێندی پێ دەدەی باڵغ بێت، بەڵکو منداڵیش دەبێت.

٧- ئەگەر سوێندت بە خوا یان بە یەکێك لە سیفەتەکانی خوا خوارد وەك سوێند خواردن بە قورئان سوێندەکەت دادەمەزرێ، بەڵام ئەگەر سوێندت بە غەیری خوا خوارد وەك بەسەری تۆ بە پێغەمبەر ، بە کەعبە، ئەوە ئەگەر ڕاست بکەی یا درۆ (أكبر الكبائر)ت ئەنجام داوە

کەفارەتی نیە بەڵکو دەبێ تەوبە بکەی.

٨- جائیز نییە هەموو کەفارەتەکە بەیەك کەس بدەی، بەڵکو دەبێت بیدەی بە دە کەس.

٩- بە لەبیر چوون و هەڵە سوێند ناکەوێت.

١٠- ئەگەر لەگەڵ سوێندەکەی ووتی (إن شاء الله) ئەوە سوێندەکەی ناکەوێت.

١١- سوێندێك کە بەسەر زارت دادێت لە دڵتەوە مەبەستت پێی سوێند نەبووە، ئەم سوێندە دانامەزرێ ئەگەر شکاندت کەفارەتی نییە.

١٢- حەرامە زۆر سوێند خواردن بەخوا بێ پێویستی ئەگەر راستیش بکات.

## دوعای خەم و خەفەت و پەژارەو سەخڵەتی

١- عن ابن عباس : أنّ رسول الله (ﷺ) كان يقول عند الكرْبِ (لا إله إلا الله العظيم الحليم، لا إله إلا الله ربُّ العرش العظيم، لا إله إلا الله ربّ السموات ورب الأرض وربّ العرش الكريم) رواه البخاري (٦٣٤٦) ومسلم (٢٧٣٠).

**واتە: ابن عباس خوا لێیان رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی خەم و نارەحەتیدا دەیفەرموو: (لا إله إلا الله العظيمُ الحليم، لا إله إلا الله ربُّ الْعرشِ العظيم، لا إله إلا الله ربُّ السَّمواتِ وربُّ الأرضِ وربُّ العرشِ الكريم).**

**واتە: هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوای مەزن و هێدی , هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە بێجگە لە خوای خاوەنی عەرشی گەورە، هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە بێجگە لە خوا، خاوەنی ئاسمانەکان و خاوەنی زەوی و خاوەنی بارەگای بەرێزو حورمەت.**

٢- عن عبد الله بن مسعود, قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (ما أصابَ عبداً همٌّ ولا حُزنٌ, فقال اللهم : إنِّي عبدكَ, وابْنُ عبدِكَ, ابْنُ أمَتِكَ, ناصِيَتي بيدك, ماضٍ فيَّ حُكْمكَ, عدلٌ فيّ قَضاؤُكَ, أسألكَ بِكُلِّ اسْمٍ هوَ لكَ سَمَّيتَ به نفسكَ, أوْ أنْزلْتهُ في كِتابِكَ أوْ عَلّمْتَه أحداً مِن خَلقكَ, أو اسْتأثرتَ بهِ في علم الغيبِ عندكَ أنْ تَجعلَ القرآنَ ربيعَ قلبي, ونُورَ صَدري, وجَلاءَ حُزني, وذَهاب هَمّي وغمّي, إلا أذهبَ اللهُ همّهُ وغَمّه, وأبْدلَه مكانهُ فرحاً.. قالوا يا رسول الله أفلا نَتَعَلّمُهنَّ؟ قال: "بلى, يَنبغي

لِمَن سَمِعَهُنَّ أنْ يَتعَلّمهُنَّ)[1].

**واته: (عبدالله) كوڕی مەسعود دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: هەر بەندەیەك تووشی خەم و پەژارەیەك بێـت بڵـێ: (اللهـم : إنّي عبدكَ, وابْـنُ عبـدِكَ, ابْـنُ أمَتِـكَ, ناصِـيَتي بيـدك, مـاضٍ فـيَّ حُكْمـكَ, عـدلٌ فـيّ قَضاؤُكَ, أسألكَ بِكُلِّ اسْمٍ هوَ لكَ سَمَّيتَ به نفسكَ, أوْ أنْزلْتهُ في كِتابِكَ أوْ عَلّمْتَه أحداً مِن خَلقكَ, أو اسْتأثرتَ بهِ في علم الغيبِ عندكَ أنْ تَجعلَ القرآنَ ربيعَ قلبي, ونُورَ صَدري, وجَلاءَ حُزني, وذَهاب هَمّي وغمّي )**

**واته: ئـەی خودایـە مـن بەنـدەی تـۆم، ڕۆڵـەی بەنـدەی تـۆم، ڕۆڵـەی بەندەی مێینەتم، پێشە سەرم بەدەسـتی تۆیـە، بڕیـاری تـۆ لەمنـدا جـێ بەجێیە، هەرچی تۆ لەگەڵمدا بکەی ڕەوایـە، داوات لـێ دەکـەم بەهـەموو ناوێك کە ئی تۆیە، خۆتت پێ نـاو نـاوە، یـان لـە کتێبەکەتـدا ناردبێتتـە خوارەوە، یان فێری یەکێك لە درووست کراوەکانی خۆتت کردبێـت، یـان هەر لە زانیاری پەنهانی خۆتدا هەڵت گرتووە، کە قورئان بکەیـە بـەهاری دڵ و دەروونم و ڕۆنـاکی سـینەم و لابـەری پـەژارەم و ڕۆیشـتنی خـەم و دڵتەنگیم، ئەوە ئیللا خـوا خـەم و پەژارەکـەی لەسـەر لادەبـات، وە لـە شوێنی ئەو بۆی دەگـۆڕێ بـە دڵخۆشـی، گوتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا خۆمان فێری ئەو دوعایە نەکەین؟ فـەرمووی: بـەڵێ: دەبـێ هـەر یـەکێك ئەم دوعایەی بیست فێری ببێت.**

---

(١) رواه أحمد ٣٩١/١، وابن حبان في صحيحه (٩٧٢) والطبراني في الكبير والبزار (١٩٩٤) وغيرهم، قال شعيب ارنؤوط: اسناده صحيح، وصححه الألباني.

٣- عن أنس قال: كان النبي (ﷺ) إذا كَرَبَهُ أمرٌ قال: (يا حيُّ يا قيّوم، برحمتك أستغيث) حسن رواه الترمذي (٣٥٢٤).

**واته: ئەنەس -رەزای خوای لێ بێت- دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک بەهۆی کارێکەوە زۆری بۆ دەهات دەیفەرموو: (يا حيُّ يا قَيُّومُ بِرحْمَتِك أَسْتَغيثُ) واتە: ئەی(خوای) زیندوو، ئەی راگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر، بە رەحمەتت داوای فریاکەوتن دەکەم.**

٤- عن أبي بكرة أنَّ رسولَ اللهِ (ﷺ) قال: دعواتُ الْمَكروبِ: (أللهم رَحْمَتكَ أرْجُو، فلا تَكِلْني إلى نفسي طرفَةَ عَيْن، وأصْلِحْ لي شأني كُلَّهُ، لا إله إلا أنت) حسن رواه أبو داود و أحمد (٢٠٤٣٠) والطيالي (٩١٠، ٩٠٩)

**واتە: دوعای کەسێك کە خەم و نارەحەتی هەیە (أللهم رَحْمتكَ ارجُو، فلا تَكِلْني إلى نَفْسي طرفَةَ عَيْن، واصْلِح لي شأني كُلّهُ، لا إله إلا انت).**

**واتە: (ئەی خودایە بە هیوای رەحمەتی تۆم، بەقەد چاو تروکانێک مەمدە دەستی نەفسی خۆم، هەموو کارو بارم بۆ چاك بکە، هیچ پەرستراوێکی بەراستی نییە بێجگە لە تۆ.**

٥- عن أنس بن مالك كنتُ أسْمعُ النبي (ﷺ) كثيراً يقول: (أللهم إني أعوذُ بكَ من الهمِّ والحَزَن، والعَجْزِ والكَسَل، والبُخل والجُبن، وضَلَعِ الدَّين، وغَلبةِ الرجال) رواه البخاري (٢٨٩٣) ومسلم.

**واتە: ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەڵێ: من زۆر گوێم لە پێغەمبەر دەبوو (ﷺ) دەیفەرموو: (أللهم إني أعوذ بكَ من الهمِّ والحُزْن،**

**والعَجْـزِ والكَسَـلِ، والبُخْـلِ والجُـبنِ، وضَـلَعِ الـدَّين، وغَلبـةِ الرجال).**

**واته: ئەی خودایە من خۆم دەپارێزم بەتۆ لە خـەم و خەفـەت، وە لـە بێ توانایی و تەمبەڵی، وە لە رەزیلی و ترس، وە لە قورسایی قـەرزداری و زاڵبوونی پیاوان (ی دوژمن بەسەرمدا).**

٦- عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): دَعوةُ ذِي النّونِ إذ دعا وهو في بطن الحوت: لا اله إلا أنت سبحانك إنّي كُنت من الظالمين، فَإنَّهُ لم يَدعُ بها رجلٌ مسلمٌ في شيءٍ قطُّ إلاّ اسْتجابَ اللهُ لَهُ. صحيح: رواه الترمذي(٣٥٠٥).

**واتە: دوعای یونس پێغەمبەر کاتێك کە دوعای کرد وە ئەو لە ناو زگی نەهەنگەکەدا بوو فەرمووی (لا إلـه الا أنت سبحانك إنّـي كنـت مـن الظـالمين) جـا بێگومـان قـەت هـیچ موسـڵمانێك نـەبووە بـەو دوعایـە بپارێتەوە دەربارەی هەر شتێك ئیللا خوا دوعاکەی قەبول کردووە.**

**سوود:**

**مانای دوعاکە: هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە تـۆ، پـاك و بێگەردی بۆ تۆ، بە ڕاستی من لە ستەم کاران بووم.**

٧- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ قَالَتْ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَلاَ أُعَلِّمُكِ كَلِمَاتٍ تَقُولِينَهُنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ أَوْ فِي الْكَرْبِ (أَللَّهُ أَللَّهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا ) حسن :رواه أبوداود(١٥٢٥)وابن ماجة(٣٨٨٢)

**واتە: ئەسمائی کچی عومەیس دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فـەرمووم ئایا هەندێ ووشەت فێر بکەم لەکاتی خەم و ناڕەحەتیدا بیڵێـی (اللهُ اللهُ ربي ولا أُشركُ بِهِ شيئاً).**

# نزاكانی باو باران و گەوارە (رعد)

## نزاكانی با:

١- عن أبي هريرة قالَ: قال رسول الله (ﷺ) (لا تَسُبّوا الرِّيح، فإنّها مِن رَوْح الله، تأتي بالرحمة وتأتي بالعذاب، ولكن سَلُوا اللهَ من خيرها وتَعَوَّذوا بالله مِن شَرِّها) صحيح رواه ابن ماجة (٣٧٢٧).

واته: جوێن بە با مەدەن، چونكە بێ گومان با لـە رەحمـەتی خوایـە، جار وا هەیە بە رەحمەت دێت وە جاری وا هەیە بە عەزاب، بەڵكو داوا لە خوا بكەن لە خێری بایەكە، وە پەنا بگرن و خۆتان بپـارێزن بـە خـوا لـە شەڕی بایەكە.

٢- عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ: كَـانَ النَّبِـيُّ (ﷺ) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ : (اللَّهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ) .رواه مسلم(٨٩٩).

واته: عائشە -رەزای خوای لێ بێت- دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) كاتێـك با توندی بكردبایە دەیفەرموو: ئەی خودایە من داوای خێرو چاكەی ئـەی بایەت لێ دەكەم، وە ئەو خێرەی كە تێیدایە، وە ئـەو خێـرەی كـە بۆی نێردراوە، وە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەڕو خراپـەی ئـەو بایـە، وە ئـەو خراپەی كە تێیدایە، وە ئەو خراپەی كە بۆی نێردراوە.

٣- عن أبيّ بن كعب قال: قال رسول الله (ﷺ) : (لا تَسُبُّوا الرِّيحَ، فإنْ رأيْتُم ما تكرهون فقولوا: أللهم إنّا نَسْأَلُك مِن خيرِ هذِهِ الريح وخيرِ ما فيها، وخيرِ ما أُمِرَتْ به، ونَعوذُ بكَ من شرّ هذهِ الرِّيح وشرّ ما فيها وشرَّ ما أُمِرَت به) صحيح رواه الترمذي (٢٢٥٢).

**واته: ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی، جوێن بە با مەدەن، ئەگەر بایەکتان بینی پێتان ناخۆش بوو بڵێن: ئەی خودایە ئێمە داوات لێ دەکەین لە خێری ئەو بایە، وە لەو خێرەش کە تیایەتی، وە لەو خێرەش کە فەرمانی پێ کراوە، وە خۆمان دەپارێزین بە تۆ لە شەڕو خراپەی ئەو بایە، وە ئەو شەرەش کە تیایەتی، وە لەو شەڕەش کە فەرمانی پێ کراوە.**

٤- عن سلَمة بن الأكوع قال: (كان رسول الله (ﷺ) ، إذا اشْتَدَّتِ الرِّيحُ يقولُ: أللهم لَقْحاً عقيماً) [(١)].

**واته: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە با توندی بکردبایە دەیفەرموو: ئەی خودایە ئاودارو هەڵگری ئاو بێت و بێ ئاو نەبێت (واتە هەوری باراناوی هێنا بێت و بێ باران نەبێت).**

---

(١) رواه ابن السني (٢٩٩) والبخاري في الأدب المفرد والحاكم وقال الحافظ صحيح لقحاً أن حاملاً لعلماء كاللقحة من الإبل، والعقيم: التي لا ماء فيها كالعقيم من الحيوان لا ولد فيها.

## زیكرەكانی باران :

١- سوننەتە لەكاتی ووشكە سالّی و بیّ بارانی نویّژی داوای باران بارین (صلاة الإستسقاء) بكریّ.

عن عباد بن تميم يُحدّثُ أبي عن عمّهِ، أنّهُ شهد النبيَّ (ﷺ) ، خرجَ الى المصلي يَستَسْقِي، فستقبلَ القبلة، وقَلَبَ رداءهُ وصلّى رَكعتين، رواه البخاري (١٢٠٧) وابن ماجة (١٢٦٧) واللفظ له.

واتە: (عباد) ی كوڕی تەمیم دەڵێ: باوكم لە مامی گێڕاوەتەوە كە پێغەمبەری بینیوە (ﷺ) چووە بۆ نوێژگە، داوای باران بارینی كردووە، رووی لە قیبلە كردووە، وە پۆشاكەكەی بەراوگێڕ كردووە (واتە لای راستی بردووە بۆ لای چەپ و لا چەپیشی بردووە بۆ لای راست ناوەكەی كەوتۆتە لای دەرەوە) وە دوو ركات نوێژی كردووە.

### سوود:

أ- (حافظ) لە (فتح)دا دەڵێ: زۆربەی ئەحكامەكانی ئەم نوێژە وەكو نوێژی جەژنە.

ب- (ابن قدامە) كۆڕای زانایانی نەقڵ كردووە كە ئەم نوێژە لە كاتی (كراهە) ناكریّ.

جـ- ئەم نوێژە كاتێكی دیاری كراوی نییە.

د- پاڕانەوەو داوای باران بارین كردن بە مەرج نەگیراوە كە تەنها دەبێت لەگەڵ نوێژی داوای باران بارین كردن (صلاة الإستسقاء) بێت، بەڵكو لەكاتی نوێژی جومعەدا دەبێت، وە لەهەر كاتێكی تری گونجاویشدا.

٢- پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دوعایەی لەسەر مینبەر کردووە لەکاتی خوتبەی جومعەدا لە کاتێکدا کە داوایان لێ کردووە کە دوعا بکا لەبەر خوا کە بارانیان بۆ ببارێنێ.

(أللهم اسْقِنا، أللهمَّ اسْقنا، أَللهم اسْقنا) رواه البخاري (١٠١٣) ومسلم (٨٩٥).

واتە: ئەی خودایە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەی خودایە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەی خودایە بارانمان بۆ ببارێنە.

٣- عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده، قال: كان رسول الله (ﷺ) اذا اسْتسْقى قال: (أللهمّ اسْقِ عبادك وبهائِمَكَ، وانشُر رَحمتكَ، وأحْيِ بلدك المَيّت) حسن: رواه أبو داود (١١٧٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك داوای باران بارینی بکردبایە دەیفەرموو: ئەی خودایە بەندەکانت ئاو بدە (بە باراندنی باران) وە هەروەها گیانلەبەرەکانت ، وە رەحمەتی خۆت بلاو بکەوە، وە شارە مردووەکەت زیندوو بکەوە.

٤- عن عائشة أن رسول الله (ﷺ) كان إذا أُمْطَرَ قال: (أللهم اجْعَلْهُ صيَّباً نافعاً) رواه البخاري (١٠٣٢) والنسائي (١٥٢٣) واللفظ له.

واتە: عائشە -رەزای خوای لێ بێت- دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە باران باریبا دەیفەرموو (اللهم اجْعَلْه صَيِّباً نافعاً) واتە: ئەی خودایە بیگێڕە بە بارانێکی بەسوود (صيباً) واتە (مطراً) یانی باران.

## ٥- دوعا لەکاتی زۆری باران باریندا:

(أللهــم حَوْلَنـا ولا علينـا، أللهــم علـى الآكـام، والظِّـرابِ ، وبُطـونُ الأَوْديةِ، ومَنابتِ الشَّجَرِ) رواه البخاري (١٠١٣) ومسلم (٨٩٧) واللفظ له.

**واتە: ئەی خودایە لە دەوروبەرماندا ببیارێنـە بەسـەرماندا مەیبارێنـە، ئەی خودایە ببیارێنە بەسەر زورگە گەورەکان و گردە بچووکەکان و دۆڵ و شوێنی ڕوانی دارو درەختەکان.**

### سوود:

**ئەو دوعایە لە (سنن النسائی) دا لە فەرموودەی ژمارە (١٥١٧) تـەنها ئەوەندە هاتووە:** (أللهم حوالينا ولا علينا) صحيح.

## زیکری گەوارە (الرعد)

١- عن عبدالله بن الزبير -رضي الله عنهما- أنه كان إذا سمعَ الرَّعد ترك الحديث وقال: (سبحان الذي يُسَبِّحُ الرَّعدُ بحمدهِ والملائكةُ مِن خِيفَتهِ)[1].

**واتە: (عبدالله) کوڕی زوبێر -ڕەزای خوایان لێ بێت- کاتێك کە گوێی لە گەوارە بووایە وازی لە قسەکردن دەهێنا و دەیفەرموو:** (سبحان الذي يُسَبِّحُ الرَّعدُ بِحمدهِ والملائكةُ من خيفتهِ)**واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە گەوارە سوپاس و ستایشی دەکات وە فریشتەش لە ترسی ئەو.**

---

(١) رواه مالك في الموطأ، وقال الحافظ هو موقوف، وقال الألباني صحيح الإسناد موقوفاً، انظر (صحيح الكلم الطيب-١٢٩) و (صحيح الأدب المفرد-٧٢٣).

## زیکرەکانی خوێندنی کەڵەشێرو زەڕینی گوێدرێژ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ( إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا , وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنْ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَانًا)رواه البخاري(٣٣٠٣)ومسلم (٢٧٢٩)

**واتە: کاتێك کە گوێتان لە خوێندنی کەڵەشێر بوو داوای چاکەو بەخششی خوا بکەن، چونکە ئەو فریشتەیەکی بینیووە، وە کاتێك کە گوێتان لە زەڕینی گوێدرێژ بوون خۆتان بپارێزن بە خوا لە شەیتان (بڵێن:** أعوذ بالله من الشيطان الرجيم**) ئەو شەیتانێکی بینیووە.**

## زیکری کاتی وەڕینی سەگ بەشەو

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسلَّمَ (إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلَابِ وَنَهِيقَ الْحُمُرِ بِاللَّيْلِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لَا تَرَوْنَ) صحيح:رواه ابوداود(٥١٠٣)

**واتە: کاتێك بەشەو گوێتان لە وەڕینی سەگان بوو , وە گوێتان لە زەڕینی گوێدرێژان بوو ئەوە خۆتان بپارێزن بە خوا، چونکە بێ گومان ئەوان شتێك دەبینن کە ئێوە نایبینن.**

## نەهی کراوە جوێن بە کەڵەباب بدرێ

عن زيد بن خالد قال: قال رسولُ الله (ﷺ) : (لا تسُبُّوا الدِّيكَ فإنّهُ يُوقِظُ للصلاة) صحيح: رواه أبو داود (٥١٠١).

**واتە: جوێن بە کەڵەباب مەدەن , چونکە بێ گومان کەڵەباب (خەڵك) بەخەبەر دێنێ بۆ نوێژ.**

## زیکرەکانی پژمین (العطاس)

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ , فَإِذَا عَطَس أَحَدُكُمْ وَحَمِدَ اللَّهَ كَانَ حَقًّا عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ لَهُ يَرْحَمُكَ اللَّهُ , وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنْ الشَّيْطَانِ , فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ , فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَثَاءَبَ ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ .رواه البخاري (٦٢٢٦)

**واتە: بێ گومان خوا پژمینی پێ خۆشە، وە باوێشکی پێ ناخۆشە، جا کاتێك کە یەکێك لە ئێوە پژمی و ستایشی خوای کرد، ئەو کاتە حەق دەبێت لەسەر هەموو موسڵمانێك کە گوێبیستی دەبێت بڵێ (یرحمك الله) واتە خوا رەحمت پێ بکات، بەڵام باوێشك لە شەیتانەوەیە ، جا هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە باوێشکی هات تا دەتوانێ بیگێڕێتەوە (نەهێڵێ باوێشکەکەی بێت )، چونکە بێگومان کاتێك یەکێك لە ئێوە باوێشکی دێت شەیتان پێی پێ دەکەنێ.**

**سوود**:

١- سوننەتە موسڵمان کاتێك پژمی بڵێ (الحمد لله) یا (الحمد لله علی کلّ حال) ئەگەر وای گوت ئەوە واجب دەبێت لەسەر تاك تاکەی ئەوانەی گوێیان لێ دەبێت پێی بڵێن (یرحمك الله) ئەمە وەکو سەلام نییە ئەگەر یەك کەس وەڵام بداتەوە واجبەکە لەسەر هەموویان لابچێ، چونکە فەرموودەکە دەڵێ: (کان حقا علی کل مسلم سمعه).

٢- عَنْ نَافِعٍ أَنَّ رَجُلًا عَطَسَ إِلَى جَنْبِ ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ قَالَ ابْنُ عُمَرَ وَأَنَا أَقُولُ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ وَلَيْسَ هَكَذَا عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَّمَنَا أَنْ نَقُولَ الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ . حسن :رواه الترمذي (٢٧٣٨)

واتە: نافع -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: پیاوێك لە تەنیشت (ابن عمر) پژمی گوتی: (الحمد لله، والسلام علی رسول الله) (ابن عمر) گوتی منیش دەڵێم (الحمد لله، والسلام علی رسول الله) بەڵام پێغەمبەر بەم شێوە ئێمەی فێر نەکردووە، بەڵکو فێری کردووین بڵێین (الحمد لله علی کل حال).

**سوود**:

١- گوتمان یەکێك کە پژمی سوننەتە بڵێ (الحمد لله) یا (الحمد لله علی کل حال).

٢- تەماشا بکە (ابن عمر) چۆن نەهی لە بیدعە کردووە، بیدعەکەش سەلام کردنە لە پێغەمبەر (ﷺ) .

٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ يَرْحَمُكَ اللَّهُ , فَإِذَا قَالَ لَهُ يَرْحَمُكَ اللَّهُ فَلْيَقُلْ يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ .رواه البخاري (٥٨٧٠)

**واته٤٠٥: كاتێك یەكێك لە ئێوە پشمی با بڵێ: (الحمد لله)، وە براكەی یا هاوڕێكەی پێی بڵێ (یرحمك الله) جا كاتێك كە پێی گوت (یرحمك الله) با ئەویش بڵێ (یهدیك الله ویُصلح بالكم) واتە: خوا ڕێنموێنیتان بكات و حاڵتان چاك بكات.**

٤- عن أبي موسى الأشعري قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إذا عطَسَ أَحدُكم فحمِد اللهَ تعالى فَشَمِّتُوهُ، فان لَم يَحمِد اللهَ فلا تُشَمِّتوهُ) رواه مسلم.

**واتە: هەر كاتێك یەكێك لە ئێوە پژمی سوپاسی خوای بەرزی كرد دوعای بۆ بكەن، بەڵام ئەگەر سوپاسی خوای نەكرد دوعای بۆ مەكەن.**

**سوود:**

**١- ئەگەر كەسێك پژمی سوپاسی خوای نەكرد ئەوە پێی ناگوترێ (یرحمك الله)، ئیمام نەوەوی لە كیتابی (أذكار)دا دەڵێ ئەگەر لە نوێژدا پژمی سوننەتە بڵێ (الحمد لله) بەخۆی گوێی لێ بێت ئەمەش مەزهەبی ئێمەیە، وە ئی واش هەیە دەڵێ ئەگەر لەناو نوێژدا پژمی نە بە ئاشكراو نە بە نهێنی و نە لەناو نەفسی خۆشیدا سوپاسی خوا ناكات.**

٥- عن أبي هريرة أنّ النبي (ﷺ) كان إذا عَطَسَ غَطّى وجْهَهُ بيدهِ أو بِثوبه، غَضّ بها صوتَهُ) رواه ابو داود (٥٠٢٩) والترمذي (٢٧٤٥) وقال حديث حسن صحيح.

**واته: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك بپشمیبایە دەم و چاوی بە دەستی یا بە جلەکانی دادەپۆشی، وە دەنگی نزم دەکرد.**

**سوود:**

**١- لە ریوایەتی (أبو داود) دەڵێ: (وضع یده أو ثوبه علی فیه) دەستی یا جلەکانی لەسەر دەمی دادەنا لە بری (وجهه).**

**٢- ئیمام (نووي) لە کیتابی (الأذكار/٣٠٩) دەڵێ: سوننەتە موسڵمان کاتێك پژمینی بۆ دێت دەستی یا جلەکانی یا لەم جۆرە لەسەر دەمی دابنێ وە دەنگیشی نزم بکات.**

٦- عن أبي هريرة قال: سمعتُ رسول الله (ﷺ) يقول: إذا عطسَ أحدكُم فَلْيُشَمّتْهُ جَليسَهُ، وإنْ زاد على ثلاثةٍ فهو مَزكومٌ، ولا يُشمتُ بعدَ ثلاثٍ، رواه ابن السني (٢٥١) وهو صحيح.

**واته: کاتێك کە یەکێك لە ئێوە پژمی با ئەوەی لەگەڵ دانیشتووە دوعای بۆ بکات، وە ئەگەر لە سێ جار زیاتر بوو ئەوە تووشی پەسیوو هەڵامەت بووە، لە دوای سێ جار هیچی تر دوعا ناکرێ.**

## **روونكردنەوەيەك**:

ئەگەر يەكێك پشمی سوپاسی خوای كرد بەڵام دەورو بەری نەيانبيست ئەوە ناڵێن (يرحمك الله) بەڵام ئەگەر هەندێك بيستيان هەندێكی تر نەيانبيست، ئەوە ئەوانەی بيستيان تەنها ئەوان دەڵێن (يرحمك الله).

## **باوێشك (التثاؤب)**

١- عن أبي هريرة عن النبيّ (ﷺ) قال: (التثاؤبُ مِنَ الشيطان، فإذا تثاءَبَ أحدُكم فلْيَرُدهُ ما اسْتطاع، فإنَّ أحدَكم إذا قالَ: ها، ضَحِكَ الشيطان )رواه البخاري (٣٢٨٩) ومسلم (٥٣١٠).

واتە: باوێشك لە شەيتانەوەيە، جا كاتێك يەكێك لە ئێوە باوێشكی هات تا پێی دەكرێت بيگێڕێتەوە (نەهێڵێ) چونكە بێ گومان يەكێك لە ئێوە كاتێك گوتی ها (واتە باوێشكی هاتێ) شەيتان پێی پێ دەكەنێ.

**سوود**:

باوێشك و جەنابەت بەهۆی شەيتانەوەيە، بۆيە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دوو شتەی تووش نەبووە.

٢- عن أبي هريرة عن النبي (ﷺ) قال: (إنّ اللهَ يحبُّ العُطاسَ ويكرهُ التثاؤبَ) رواه البخاري (٦٢٢٦).

واتە: بێ گومان خوا پژمێنی پێ خۆشە، وە باوێشكی پێ ناخۆشە.

٣- عن أبي سعد الحدريّ قال: قال رسولَ الله (ﷺ) : (إذا تثائَبَ أحدُكُم فَلْيُمْسِكْ بيدهِ على فَمِهِ، فإنَّ الشيطان يَدْخُلُ) رواه مسلم (٢٩٩٥) وأبو داود (٥٠٢٦).

**واته: کاتێك یەکێك لە ئێوە باوێشکی بۆ هات با دەستی لەسەر دەمی دابنیٚ، چونکە بیٚ گومان شەیتان دەچێتە ناویەوە.**

**سوود:**

**١- سوننەتە موسڵمان کاتێك باوێشکی بۆ دێت لەناو نوێژدا بوو یا لە غەیری نوێژ نەهێڵیٚ و قووتی بداتەوە ئەگەر هاتیش دەست لەسەر دەمی دابنیٚ، بەلاّم لە فەرموودەکە باس لەوە ناکات کام دەست و چۆنی لەسەر دابنیٚ، هەندێك لە زانایان دەڵێن دەستی چەپت لەسەر دەمت دادەنێی، مالکیەکان دەڵێن پشتی دەستی چەپی لەسەر دەمی دادەنیٚ، یان پشتی دەستی راستی یان بەناو لەپی دەستی راستی.**

**٢- ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەیتان دەچێتە ناو لاشەی ئینسان.**

# وەسوەسە لە عەقیدەو پاك و خاوێنی

شــەیتانەکان زۆر لــەوە مەترســیدارترن کــە زۆرێــك لــە خــەڵك تێیگەیشتوون خوا دەفـەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ (فاطر: ٦)، واتە: بێ گومان شـەیتان دوژمنـی ئێوەیـە، دەی کەواتـە ئێـوەش بـە دووژمنـی خۆتـانی دابنێن، بێ گومان ئەو (شـەیتان) تـاقم و کۆمەڵەکـەی بـانگ دەکـات بـۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی (دۆزەخ).

یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانی شەیتان ئەوەیە ئەوان ئێمە دەبینن بـەڵام ئێمـە ئـەوان نـابینین، بۆیـە ئەگـەر ئێمـە ئـەوانمان ببینیایـە کـە چـۆن وەسوەسەی خراپیـان بـۆ دەکـردین بـەم شـێوەیە پیلانـەکانیان سـەری نەدەگرت، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەشدا خوا ژیری بە ئێمە داوە، پەناگرتنی بـۆ ئێمـە دانـاوە کـە خۆمـانی پـێ بپـارێزین لـە شـەیتان وەك خوێنـدنی سورەتی (ناس)، وە وەك ئەوە کـە خـوا دەفـەرمووێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ ﴾ (المؤمنون: ٩٧ – ٩٨)، واتە: وە بڵێ ئـەی پـەروەردگارم خـۆم دەپـارێزم بــەتۆ لــە وەسوەســەی شــەیتانەکان و پــەنات پــێ دەگــرم لــەوەی (شەیتانەکان) ئامادەبن لام.

(ابن القیم) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: هەموو ئـەو کێشـانەی کـە تووشـی ئیمـانی ئینسـان دەبێـت بـەهۆی گوناحەوەیـە، جـا بـۆ ئـەوەی ئیمانت سەلامەت بێت خۆت بپارێزە لە گوناح.

**وە ئەو وەسوەسانەی کە شەیتان دەیکات دەربارەی عەقیدە ئەمە نیشانەی پتەوی ئیمانی کەسەکەیە، جا تۆش بەم جۆرە وەسوەسانە غەمبار مەبە، ورەت دانەبەزێ و بەردەوام بە لەسەر کاری خێر.**

١-عن عبدالله(رضي الله عنه) قال: سُئل النبيُ(ﷺ) عن الوسوسةِ قال: تلك مَحْضُ الإيمان. رواه مسلم(١٣٣).

**واتە: پرسیار لە پێغەمبەر کرا(ﷺ) دەربارەی وەسوەسە فەرمووی: وەسوەسە نیشانەی ئیمانی پاك و بێ گەردە.**

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ جاءَ ناسٌ مِنْ أصحاب النبيِّ(ﷺ) فَسألوهُ: إناّ نَجِدُ في أنفسنا ما يتعاظَمُ أحدُنا أنْ يتكلّمَ بهِ قال(وقدْ وجَدْتُمُوهُ) قالوا: نعم قالَ: ذلك صَريحُ الايمانِ. رواه مسلم(١٣٢).

(يتعاظم أحَدُنا أنْ يتكلَّمَ بهِ): أي يجد التكلم به أمراً عظيماً لأنهُ لا يليق بالله عزّ وجلَّ.

(صريح الايمان) : أي إن الوسوسة علامة الايمان الصريح الخالص.

**<u>مانای فەرموودەکە:</u> ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر هاتن پرسیاریان لێ کرد ووتیان ئێمە شتێك دێتە ناو دڵمان لامان گەورەیە ئەگەر بە قسە بیڵێین(چونکە لە خوا ناوەشێتەوە) فەرمووی: ئەوە نیشانەی ئیمانی پاك و بێ گەردە.**

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الله عز وجل تَجاوزَ لأُمَتي عَمّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسها مالم تَعملْ أَو تَكلَّمْ بهِ. رواه مسلم(١٢٧).

واتە: بێگومان خودا(عزوجل) خۆش بووە لە ئوممەتەکەم لەوەی کە بە دڵیاندا دێت مادام کاری پێ ناکەن یان بە قسە نەیڵێن.

(محمد مختار الشنقيطي) دەڵێ: هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئینسان بەهۆی ئازاری وەسوەسەوە دەگاتە پلەیەك کە بە نوێژی زۆرو ڕۆژوو پێی ناگات، وەسوەسەی بۆ دێت لە ڕووی تەوحیدەوە لە نوێژو دەست نوێژەوە، دڵی پێ توند دەبێت، هەوڵ دەدات لای ببات بەڵام بۆی ناکرێ.

وە خوای گەورەش دەفەرووێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ (الطلاق: ٢)، واتە: هەر یەکێك لە بێ فەرمانی خوا خۆی بپارێزێ خوا شوێنی دەرچوونی (لە تەنگانەدا) بۆ فەراهەم دەهێنێ.

## چی دەکەی لەکاتی وەسوەسە

١- خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٠٠﴾ (الأعراف: ٢٠٠).

واتە: وە ئەگەر وەسوەسەیەکت لە وەسوەسەی شەیتان هاتە دڵ خۆت بپارێزە بە خوا چونکە ئەو یەکجار بیسەرو زانایە.

٢- خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٠٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١﴾ الأعراف

واتە: وە ئەگەر وەسوەسەیەکت لە وەسوەسەی شەیتان هاتە دڵ خۆت بپارێزە بە خوا چونکە ئەو یەکجار بیسەرو زانایە (٢٠٠) بێگومان

ئەوانەی کە پارێزکارن هەر کاتێك وەسوەسەیەکیان لە شەیتانەوە تووش بـوو یەکسـەر خوایـان دێتـەوە یـادو چـاو–ی دڵ– یـان دەکرێتـەوەو دەبینین– ڕاستی دەدۆزنەوە (٢٠١) .

٣–عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يأتي الشَّيطانُ أحَدَكُمْ فَيَقولُ: مَنْ خَلَقَ كذا وكذا؟ حتَّى يقولَ لَهُ: مَنْ خَلَقَ ربَّكَ؟ فإذا بَلَغَ ذلكَ فَلْيَسْتَعِذْ باللهِ وَلْيَنْتَهِ. رواه مسلم(١٣٤).

واتە: شەیتان دێتە لای یـەکێك لـە ئێـوەو دەڵـێ: کـێ ئەمـەو ئـەوەی دورست کردووە؟ تا پێی دەڵێ ئەدی کێ پەروەردگارتی دورست کردووە , جا ئەگەر گەیشتە ئەمە با خۆی بپارێزی بە خواو واز بێنێ.

٤– عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) لايَزالُ الناسُ يَتَساءَلونَ حَتَّى يُقالَ: هذا خَلَقَ اللهُ الخَلْقَ فَمَنْ خَلَقَ الله؟ فَمن وجَدَ مِن ذلك شيئاً فَلْيَقُلْ: آمَنْت بالله. رواه مسلم(١٣٤).

واتە: بەردەوام خەڵك پرسیار دەکەن تـا دەگـوترێ: ئـەوە خـودا ئـەو دورست کراوانەی دورست کردووە ئەی کێ خوای دورسـت کـردووە؟ جـا هەر یەکێك شتێکی لەمەی بینی با بڵێ(آمَنْت باللهِ).

٥– عـن عثمـان بـن عفـان(رضي الله عنه) قال:تَمَنَّيـتُ أنْ أكـونَ سـألتُ رَسـولَ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) ماذا يُنجينا مِمَّا يُلقِي الشيطانُ مِنْ أَنفُسِنا فقالَ أبوبكرٍ(رضي الله عنه) قَدْ سَألتُهُ عن ذلك فقال: يُنجيكُمْ منهُ ما أَمَرتُ بِهِ عَمِّي أنْ يقولَهُ فَلَمْ يَقُلْهُ. قال المنذري: رواه أحمد ، وإسناده جيد حسن.

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: خۆزگەم

خواست كه پرسيارم له پێغەمبەر(ﷺ) بكردبايه كەچى رزگارمان دەكات لەوەى شەيتان دەيخاتە دڵمان جا ابوبكر(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ من پرسيارم لىٚ كرد دەربارەى ئەوە فەرمووى: رزگارتان دەكات لەوە ئەوەى كە فەرمانم بە مامم كرد بيڵىٚ نەيگوت(لا اله الا الله).

## چارەسەرى وەسوەسە

١-ئەوانەى كە وەسوەسەيان هەيە لە عەقيدە ئەوە پێويست ناكات غەمبار بن چونكە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (تلك محض الإيمان) ئەوە نيشانەى ئيمانى پاك و بێ گەردە.

دەرمانێك كە خواى گەورە بۆ ئەم كێشەى داناوە ئەوەيە كە خۆت بپارێزى بە خوا، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝٢٠٠﴾(الاعراف: ٢٠٠). واتە: وە ئەگەر وەسوەسەيەكت لە وەسوەسەى شەيتان هاتە دڵ خۆت بپارێزە بە خوا چونكە ئەو يەكجار بيسەر و زانايە.

وە پێغەمبەريش (ﷺ)، دەفەرموێ (فَلْيستعِذْ باللهِ وَلْيَنْتهِ). واتە با خۆى بپارێزێ بە خوا واز بێنێ لەم جۆرە بيركردنەوەيە.

جا بزانە ئەم دوو چارەسەريە بۆ وەسوەسە، خۆپاراستن بە خوا وە وازهێنان لەم جۆرە بيركردنەوەيە، دوو چارەسەرين خوا و پێغەمبەر فەرموويانە تۆش دەستى پێوە بگرە.

٢-زانايان دەربارەى وەسوەسە لە بابەتى پاك و خاوێنى و دەستنوێژ

و نوێژ و ئەمانە دەفەرموون بۆ کەسێك کە تووشی وەوسوەسە بووە لەمانە ئەوە کام لای ئاسنترە ئەوەیان هەڵدەبژێرێ، واتە ئەگەر گوتی دەستم شوشتووە یان نەم شوشتووە ئەوە شوشتوویەتی، ئەگەر گوتی یەك ڕکاتە یا دوو ئەوە بە دوو حیسابی دەکات، ئایا مەسحی سەری کردووە یان نەی کردووە ئەوە حیساب دەکات کە کردوویەتی، وە هەروەها لە شتەکانی تریشدا بەم شێوە ئەم فیقهە تەنها بۆ وەسوەسە دارانە.

٣- لەوانەیە خەڵکانێك هەبن بە تایبەت گەنجان شەیتان جوێن و قسەی خراپ بێنێتە سەر زمانیان دەربارەی خوای گەورە، بەڵام ئەوان ئەمەیان پێ ناخۆشە، جا با ئەمانە بزانن بەم کارەیان گوناحبار نابن، بەڵکو بە نارەحەت بوونیان لەسەر ئەم کارە پاداشتیش وەردەگرن.

## چەند ڕوونکرنەوەیەك دەربارەی نوێژ و دەست نوێژو پاك و خاوێنی:

١-ئەگەر نوێژت تەواو کردو سەلامت دایەوە ئەگەر غوسلت تەواو کرد وە یا دەست نوێژت تەواو شووشت ئینجا لە پاشان گومانێکت لێ پەیدا بوو لە کەم و کوریەك تیایاندا ئەوە ئەو گومانە هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ نوێژو غوسل و دەست نوێژەکەت تەواوە.

٢- (عُثیمین) دەڵێ: ئەگەر یەکێك لە نوێژو دەست نوێژ زۆر گومانی بۆ دورست دەبوو ئەوە وەسوەسەیە با حیسابی بۆ نەکات.

٣- ئاو کە یەکێك لە تام یا ڕەنگ یا بۆنی نەگۆڕا ئەگەر شتێکی

پیسیشی بەرکەوت پیس نابێت.

٤- موسڵمان کە جەنابەتی لەسەر بوو ئەگەر دەستی تەر بوو بە شتێك کەوت ئەم شتە پیس نابێت وە هەروەها دەتوانی زیکرو دوعا بکات بەڵام لە مەزهەبی شافعی نابێت قورئان بخوێنێت مەگەر بۆ دوعا کردن وە ئاوی پیاو(منی) نوێژی لێ دێت بەڵام باشتر وایە لابردرێ.

٥- زەوی و دارو دیوارو هەموو ئەو شتانەی بە جێگیری بە زەویەوە نوساون ئەگەر پیسیەکیان بەرکەوت تەنها بە ووشك بوونەوە پاك دەبنەوە ئەگەر شتە پیسەکەی پێوە نەمێنێ.

٦- ئەگەر موسڵمان دەست نوێژی هەبوو پرتە پرتێك لە کۆمی هات بەڵام دڵنیا نەبوو تەواو غازات دەرچووە یان نەء ئەوە دەست نوێژی نەشکاوە.

٧- ئەو ئاوەی کە غوسلی جەنابەتی پێ دەکەی ئەگەر پروشکت کەوتە ناو ئاوەکە هەر پاکەو پاککەرەوەیە بە مەرجێك تام و بۆن و رەنگی نەگۆرێ.

٨- رستە ئەگەر جلێکی پیست هەڵخست لەسەریدا لە دوای لابردنی جلەکە بە رۆژ یا بە با ووشك بۆوە ئەوە دەتوانی جلی خاوێنی لەسەر هەڵبخەی.

٩- ئەگەر یەکێك نوێژی کرد لە دوای تەواو بوونی نوێژەکە بینی پیساییەك بە جلەکانی وەیە یا دەیزانی بەڵام لە بیری چوو بوو بیشوات ئەوە نوێژەکەی پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات تەنها شوێنە پیسەکە دەشوات.

١٠- میزو پاشەڕۆكی ئەو تەیرو گیـان لەبەرانـەی گۆشـتیان دەخـوریٚ پیس نییە وەك كێشكە(چۆلەكە)و كۆترو مریشك و مەرو بزن و چێڵ.

١١- ئەگەر دەست نوێژت نـەبوو ویسـتت دەسـت نوێـژ بشـۆی مـەرج نییە تارەتیش بكەی , ئەگەر تەنگاو بووی دەچی تـارەت دەكـەی بـەڵام ئەگەر تەنگاو نەبووی ناچی.

## چاو لێدان (العین) و حەسوودی

چاولێدەر (عائن) و حەسوود جیاوازیان هەیە, چـاولێدەر حەسـوودەو بە چاوەكانی ژەهرەكە دەڕێژیٚ، بەڵام حەسوود كەسێكە دەخـوازی كـە كەسـێك بـەهرەو نیعمـەتێكی پێـدراوەو شـایانە بـۆ ئـەو نیعمەتـە، ئـەم نیعمەتەی نەمێنیٚ، وە لەوانەشە لەگەڵ ئەوەشدا هـەوڵ و كۆشـش بكـات بۆ نەمانی نیعمەتەكـە، كەواتـە هـەموو چـاو لێـدەرێك حەسـوودە، بـەڵام هەموو حەسوودێك چاولێدەر نییە.

١- عَـنْ عَائِشَـةَ قَالَـتْ قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـه وَسَـلَّمَ: ( اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ فَإِنَّ الْعَيْنَ حَقٌّ)صحيح: رواه ابن ماجة(٣٥٠٨)

واتە: خۆتان بپارێزن (بەخوا) چونكە بیٚ گومان چاو حەق و ڕاستە .

## خۆ پاراستن لە چاو

١- عَنْ أَبِي سعيد قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ وَعَيْنِ الْإِنْسِ فَلَمَّا نَزَلَتْ الْمُعَوِّذَتَانِ أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَى ذَلِكَ) صحيح:رواه ابن ماجة(٣٥١١)

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دەپاراست لە چاوی جنۆکەو چاوی خەڵك، جا کاتێك سورەتی (فلق) و (ناس) دابەزی، ئەم دوو سورەتەی دەخوێندو وازی لە دوعاکانی تر هێنا.**

**سوود:**

**وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێ جنۆکەش چاو لێدانیان هەیە.**

## ئەگەر شتێکت بینی پێ سەرسام بووی.

١- عَنْ أَبِي أُمامَةَ قال:قال رسول الله:( صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : عَلَامَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخاهُ إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مِنْ أَخِيهِ مَا يُعْجِبُهُ فَلْيَدْعُ لَهُ بِالْبَرَكَةِ) صحيح:رواه ابن ماجة(٣٥٠٩).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ئەوە لەبەرچی یەکێك لە ئێوە براکەی دەکوژێ، کاتێك یەکێك لە ئێوە شتێکی بینی لە براکەی پێی سەرسام بوو با دوعای بەرەکەتی بۆ بکات.**

**سوود:**

**١- کەواتە تۆ بۆ خۆ پاراستنت لە چاوی جنۆکەو خەڵکی دەتوانی سورەتی (فلق) و (ناس) بخوێنی، بۆ ئەم مەبەستەش لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز یەك جار یەك جار سوننەتە سورەتی (اخلاص) و (فلق) و**

(ناس) بخوێنی، وه له زیکری بەیانیان و ئێوارانیش سێ جار سێ جار.

٢- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (إحفظ الله يحفظك) کەواتە خۆ پاراستن له گوناح زۆر گرنگه بۆ پاراستنت له کێشه بۆ خۆت و دین و کەس و کارو ماڵ و سامانەکەت.

٣- وه ئەگەر شتێکی براکەشت بینی پێی سەرسام بووی دوعای بەرەکەتی بۆ بکه، وەك ئەوه بڵێ خوایه بەرەکەت بخەیه ناو ماڵەکەی .

٤- که دوعای خۆتت کرد پشتت بەست بەخوا ئیتر مەترسه و بیری خۆت خەریك مەکه بەچاو لێدان و حەسوودی.

# زیکری مردوو و بابەتی پەیوەندیدار پێیەوە

## تاقی کرانەوە بە نارەحەتی

خوا دەفەرموێ ﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ (البقرة: ١٥٥-١٥٦-١٥٧).

**واتە: سوێند بە خوا تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێك لە ترس و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و دارایی و خەڵکی(کەس و کارتان) و بەروبووم , جا مژدە بدە بە خۆڕاگران(١٥٥) ئەوانەی کە لەگەڵ دووچاری سەختییەك بوون دەڵێن(إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ) ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە(١٥٦) ئا ئەوانە دورودو و بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە وە ئەوانە ئەو کەسانەن هیدایەتیان وەرگرتووە (١٥٧).**

١-عن صهيب بن سنان قال: قال رسول الله(ﷺ): عجباً لأمرِ المُؤمنِ، إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ خيرٌ، ليسَ ذاكَ لأحَدٍ إلاّ لِلْمُؤْمِنِ إنْ أصابَتْهُ سَرّاءُ شَكَرَ، فكانَ خيراً لَهُ، وإنْ أصابَتهُ ضَراءُ صبَرَ فكانَ خيراً لَهُ. رواه مسلم(٢٩٩٩).

